# ئیعجازی زانستی

# له قورئان و سوننه‌تدا


به‌رگی دووه‌م

نووسینی: د. کاوه فه‌ره‌ج سه‌عدون




گه‌شه

زنجیرەی بەرەو دڵنیایی
ئیعجازی زانستی قورئان وسوننەت
٢

# ئیعجازی زانستی
## لەقورئان وسوننەتدا

### بەرگی دووەم

نووسینی:
د. کاوە فەرەج سەعدون

چاپی یەکەم
١٤٤٠ کۆچی – ٢٠١٩ زایینی

گەشە

ئیعجازی زانستی لە قورئان وسوننەتدا

بەرگی دووەم

**نووسینی:** د. کاوە فەرەج سەعدون

**چاپ و بڵاوکردنەوە:** **کتێبخانەی گەشە- سلێمانی**

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**ساڵی چاپ:** ١٤٤٠ - ٢٠١٩

**تیراژ:** ١٠٠٠

**نرخ:** ٧٠٠٠ دینار



**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکانی سلێمانی**

**ژمارەی سپاردنی (١٣٠٩)ی ساڵی (٢٠١٧)ی پێدراوە**

کتێبخانەی گەشە بۆچاپ و بڵاو کردنەوەی کتێب

سلێمانی- بازاڕی ئاوباریک- بەرامبەر کاسۆمۆڵ --دوکانی ٧١

-Ktebkhaney geshe کتێبخانەی گەشە

٠٧٥٠١٢١٤٧٧٣-٠٧٥٠٨٨٢٩٠٨٦

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ (٥٢) سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٥٣) ﴾ (فصلت)

واته: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ، باشە ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بێت، وپاشان ئێوەش بڕواتان پێی نەبێت! دەزانن چ سەرەنجامێکی سامناك چاوەڕێتانە؟! جا ئیتر کێ هەیە لە ئێوە سەرسەختتر؟! وکێ لاڕێترە لەوەی کە ڕێگەی جیا ودوور لە ڕاستیی گرتبێتەبەر؟! ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە ونیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەر ولە خودی خۆیشیاندا، ئەمەیش بۆ ئەوەی تا چاك بۆیان ڕوون ببێتەوە ودڵنیا ببن کە دەسەڵاتی پەروەردگار وقورئانە نێردراوەکەی حەق وڕاست ورەوایە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نییە کە بێگومان ئاگا وزانایە بە هەموو شتێك.

﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ (الذاريات: ٢١)

واتە: وە لە خودی خۆشتاندا (بەڵگەی زۆر هەیە)، دەی ئایا بۆ وورد نابنەوە وسەرنج نادەن!؟

# پێشەکی

بەدرێژایی مێژوو کاتێك پەروەردگار پێغەمبەرانی نارد بۆ رێنمویی مرۆڤەکان وپەیامەکانی خۆی پێدا ناردن, لەهەمان کاتدا بۆ سەلماندنی راستیی ناردنی ئەو پێغەمبەرانە لەلایەن خۆیەوە کۆمەڵێك بەڵگەی پێدان بۆ پشتگیریی کردنیان کە پێیان دەووترێت موعجیزات یان لەبەدەرئاسا، کاتێك ئەم پێغەمبەرانە کۆمەڵێك کردەوە ونیشانەیان پیشانی گەلەکەی خۆیاندا کە لە توانای هیچ مرۆڤێکی ئەوسەردەمەیاندا نەبووە هاوشێوەی بهێنێت، بۆیان سەلماندن کە ئەم پێغەمبەرانە بەهێزێکی سەروو توانای مرۆڤەکان پشتگیریی کراون، ولەلایەن ئەویشەوە رەوانە کراون بەمەبەستی تێگەیاندیان لە هۆکاری دروستبوونیان وپەیامیان لە ژیانی دونیادا.

رۆژگارەکان هاتن وچوون وسەردەم گەیشتە کاتی ناردنی پێغەمبەرمان محمد (ﷺ)، پەروەردگار موعجیزەیەکی تایبەتی پێدا کە تا رۆژی دوایی بمێنێتەوە وئاخاوتن لەگەڵ مرۆڤەکاندا بکات ودەستەوسانیان بکات.

قورئانی پیرۆز موعجیزەی نوێ بووەوەی پێغەمبەرمانە کە لە هەموو سەردەمێکدا موعجیزەکەی مرۆڤەکان دەستەوسان دەکات کە بتوانن هاوشێوەی بهێنن، پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿ مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إِلاَّ أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ أُومِنَ – أو آمَنَ– عَلَيْهِ الْبَشَرُ ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُ وَحْياً أَوْحَاهُ اللَّهُ إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنِّي أَكْثَرُهُمْ تَابِعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾[1]، واتە : هەموو پێغەمبەرێکی گەلانی پێشوو ئەوەندەی شوێنکەوتوو هەبووە بەپێی ئەو موعجیزەیەی کە پێی درابوو وخەڵکی بینیان، موعجیزەکەی منیش وەحی وسروشێکە خودا پێیداوم، وهیوام وایە زۆرترین شوێنکەوتووم هەبێت لەرۆژی دواییدا.

---

[1] حديث صحيح رواه مسلم (١٥٢)، والبخاري (٤٩٨١).

ئیمامی (إبن حجر) له راڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت:

(موعجیزەی قورئـان بەردەوامـە تـا ڕۆژی دوایـی، ولـە راددە بـەدەرە لـە شێوازەکەیدا، ولە ڕەوانبێژیدا ولە هەواڵدانی بەشارراوەکان، کـە هـیچ سـەردەمێك تێناپەڕێت ئیللا شتێك پەیدا دەبێت لەوانەی کە هەواڵیداوە دێنەدی، خۆی لەخۆیدا ئەمانـە سـەلمێنەری راسـتی قورئـانن، وبەهۆیانـەوە سـوودی گـەورەی قورئـان بلاودەبێتـەوە، کـە ئامادەبووو‌غائیـب دەگرێتـەوە، وئـەوەی کـە بـوونی هەیـە وئەوەشی لە داهاتوودا دێتە بوون) [٢].

قورئـانی پـیرۆز کتـێبی هیدایـەت ورێنمـوویی مرۆڤەکانـە بـۆ ڕێگـای راسـت، پەروەردگاریش بەزانستی فراوانی خـۆی کـە هەمووشـتێکی گرتووەتـەوە تـا ڕۆژی دوایی دەزانێت کە زانستی مرۆڤەکان بەرەوپێشکەوتنی بەردەوام دەڕوات بۆیـە لـە قورئانی پیرۆزدا ئیشارەت وئاماژەی بۆ هـەموو زانسـتەکان وسـەردەمەکان تێدایە بەمەبەستی نوێبوونەوەی موعجیزەی قورئان لەهەموو سـەردەمێکدا: {ونزّلناعلیـك الکتاب تبیاناً لکل شيء....} (النحل:١٨٩)، واتە: ئێمە قورئانمان بـۆ تـۆ ناردووە کە روونکەرەوەی هەموو شتێك بێت بۆ ئێوە.

﴿لَكِنِ اللّـهُ يَشْـهَدُ بِمَـا أَنـزَلَ إِلَيْـكَ أَنزَلَـهُ بِعِلْمِـهِ وَالْمَلآئِكَـةُ يَشْـهَدُونَ وَكَفَـى بِاللّـهِ شَهِيداً﴾ (النساء:١٦٦)، ئیمامی راڤەکاری قورئـان (ابـن کـثیر) لـە تەفسـیری ئـەم ئایەتەدا دەڵێت: (ئەم قورئانە زانیاری وزانستی خودایی تێدایـە کـە وویسـتوویەتی نیشـانی بەنـدەکانی بـدات، هـەروەها زانیاریشـی تێدایـە بـە شـتە غـەیبی ونەزانراوەکان، لە رابوردوو وداهاتووشدا) [٣].

دەربـارەی ئەومانایـەش کـە قورئـان زانیـاریی شـارراوەی خـودایی تێدایـە ولەداهاتوودا بۆ مرۆڤەکان دەردەکەوێت زۆرێك لـە موفەسـیران هـەمان بۆچـوونیان

---

٢ بڕوانە: (فتح الباري شرح صحیح البخاري) – دانراوی: إبن حجر العسقلاني/ ج١٣-ص ٣٠٥.

٣ بڕوانە: تفسیر القرآن العظیم (٥٦٠/١).

هەیـە وەك: (ابـن الجـوزي، الزمخشـري، أبوحيّـان، البيضـاوي، النَّسَـفي، الخـازن، الآلوسي، الشوكاني).

پێغەمبەریش (ﷺ) خۆی ئاماژەیداوە بە بـەردەوامی مـوعجیزەی قورئـان، کـە لێیدەگێڕنەوە فەرموویەتی: (... ولاتنقضـي عجائبـه...)[4] واتـە: هـەرگیز سـەمەرە وسەرسوڕهێنەکانی قورئان تەواو نابن.

ئیعجـازی زانسـتی لـە قورئـان وسـوننەتدا خـۆی لەوئاماژانـەدا دەبینێتـەوە لـە قورئان وفەرموودەکاندا هاتووە پێش ١٤٠٠ سـاڵ زیـاتر بـۆ هەنـدێك لـە دیاردەکـان وراستییەکان لە ئاسمان وزەوی وخودی پێکهاتەی مرۆڤدا، کـە تـەنها دوای دەیـان وسەدان ساڵ لە توێژینەوەی زانستی لەم سەردەمەدا ئەو راستییانە بـۆ مرۆڤـەکان دەرکەوتن، ئیعجازی زانستی لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا بریتییە لە موعجیزە نوێیەکـەی قورئان کە زانایان ومرۆڤەکان سەرسام دەکات.

لەرۆژگاری ئەمڕۆدا دەرخستنی موعجیزەی زانستی قورئان هۆکارێکی گـەورەی بانگەوازە بۆلای پەروەردگار ودەرخستنی راسـتی قورئـانی پـیرۆز، کاتێـك زانایـان وپسپۆڕان وخەڵکی بەگشتی ئەوئاماژە وورد وسەرسوڕهێنەرانە دەبینن لە قورئاندا بۆ زۆرێك لەراستییە زانستییەکان کە تەنها چەند ساڵێك دەبێت دۆزراونەتەوە تەنها ئەوەیان بۆ دەمێنێتـەوە کـە دان بـەوەدا بنـێن کـە ئـەم ووتانـە لەلایـەن مرۆڤـەوە نـەهاتووە، بـەڵکو لەلایـەن پـەروەردگاری خـاوەنی گـەردوون ونهێنییەکانیـەوە نێردراوە.

ئیعجازی زانسـتی قورئـان وسـوننەت رۆڵـی گـەورەی خـۆی هەیـە لـە رۆژگـاری ئەمڕۆماندا بۆ نوێکردنەوەی بەڵگـەی پێغەمبەرایـەتی وسـەلماندنی نـاردنی قورئـان

---

[4] جـزء مـن حـديث طويـل رواه الترمـذي والـدارمي والطبرانـي في المعجـم الكـبير وابـن حبـان والحـاكم في المستدرك، قال ابوعيسى: هذا حديث لانعرفه إلا من هذا الوجه (سـنن الترمـذي: ٥/ ٩٨)، والصـحيح انـه موقوف على ابن مسعود.

لەلایەن خوداوە، هەروەها تێگەیشتنێکی باشتر وفراوانترمان دەداتێ دەربارەی دەقەکانی قورئان وسوننەت وپاڵنەرێکە بۆ موسوڵمانان بۆ بەرەو پێش چوونی زانستی وئەنجامدانی دۆزینەوەی نوێ، وهۆکارێکی بەهێزی بانگەواز کردنە بۆلای بەرنامەکەی پەروەردگار.

نووسین لەبواری ئیعجازی زانستی لە قورئان وسوننەتدا بەزمانی کوردی بوارێکی گرنگ وپێویستە وبەکەمی باسی لێوەکراوە، کە پێویستە ئەم بابەتە درێژەی پێبدرێت بۆ ئەوەی راستیەکان بۆ هاوزمانانمان دەرکەوێت، وپشت ئەستووربن بە بەڵگەی بەهێز لە قەناعەتیان بە موعجیزەی زانستی لە قورئاندا.

بابەتەکانی ئەم بەرگەی کتێبەکەمان وەك بەرگی پێشتر بەشی زۆریان پێشتر لە گۆڤار ورۆژنامە وکۆنگرە زانستییەکاندا بڵاوکراونەتەوە، وەك گۆڤارەکانی: هەیف، بەختەوەری، ژینی نوێ، رێگای شەرع، ئایندەسازی، دووانگە، ورۆژنامەکانی: یەکگرتوو، کۆمەڵ، بەیان، رووداو، هەولێر، هەروەها کۆنگرەی (دیدی دروست بۆ فەرموودە-پێگە وکارپێکردنی) کە لەلایەن (رێکخراوی ژیار) بەهاوبەشی لەگەڵ (زانکۆی هەڵەبجە) لە رۆژانی (٢٠-٢١/١٢/٢٠١٧) لە (هەڵەبجە) سازکرابوو، هەروەها پەیجی تایبەتی خۆم لە تۆڕی کۆمەڵایەتی (فەیسبوك)، پێم باش بووهەندێك لەوبابەتانەم لە دووتوێی کتێبێکدا کۆیانبکەمەوە پاش پێداچوونەوە وزیادکردنی پێویست بۆ بابەتەکان بە مەبەستی سوودگەیاندنی زیاتر بۆ خوێنەرانی بەڕێز.

لەم بەرگەی کتێبەکەدا بەردەوام دەبین لەسەر هێنانەوەی چەندین نموونەی جۆراوجۆر دەربارەی ئیعجازی زانستی لە قورئان وسوننەتدا، ولە کۆتایی هەر بابەتێکیشدا سەرچاوەی بابەتەکان دانراون بۆ ئاسانکاریی.

لەکۆتایی کتێبەکەشدا هاوپێچێك دانراوە تایبەت بە وێنە رەنگاورەنگە روونکەرەوەکان بۆ هەر بابەتێکی ئیعجازی زانستی کە لەم کتێبەدا باسکراوە.

# تێڕامانێك له مرۆڤ

## لەژێر ڕۆشنایی ئایەتی ( وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلا تُبْصِرُون )




پەروەردگار بە بەردەوامی داوا لە مرۆڤەکان دەکات کە لە پێکهاتەی جەستەی خۆیان بڕوانن بۆ ئەوەی بەروونیی شوێنەواری دەسەڵاتی خودایان بۆ دەرکەوێت وبگەنە باوەڕی تەواوبەبوونی دروستکەرێکی بەتوانا وزانا ودانا کە ئەم ووردەکارییەی لە دروستکردنی مرۆڤ وسەرجەم پێکهاتەکانی ئاسمان وزەویدا فەراهەم هێناوە.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ (الذاريات:٢١) واتە: وە لە خودی خۆشتاندا (بەڵگەی زۆر هەیە)، دەی ئایا بۆ وورد نابنەوە وسەرنج نادەن، هەروەها دەفەرموێت: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت: ٥٣) واتە: ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە ونیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەر ولە خودی جەستەی خۆیشیاندا، ئەمەیش بۆ ئەوەی تا چاك بۆیان روون ببێتەوە ودڵنیا بن کە دەسەڵاتی پەروەردگار وقورئانە نێردراوەکەی حەق وراست ورەوایە، ئایا پەروەردگارت بەس نییە کە ئاگادارە بەهەمووشتێك.

چەندین بەڵگەی ئاشکرا لەسەر گەورەیی دەسەڵاتی پەروەردگار بە بەردەوامیی لەبەرچاوماندان بەڵام لەبەر زۆر نزیکییان لێمان هەستی پێناکەین، بۆ نموونە مرۆڤ شەوانە دەخەوێت بەڵام دڵی بە بەردەوامی لێدەدات، وهەناسەدانی بەردەوامە، بەقووڵیی دەخەوێت بەڵام سیستمی هەرس وگورچیلەکان بەتۆکمەیی کاری خۆیان دەکەن، ئەگەر سیستمی هەناسەدان ودڵ وسووڕانی خوێن وهەرس وگورچیلەکان کۆنترۆڵی بەویستی خۆمان بووایە کەس نەیدەتوانی بۆ تەنها چرکەیەکیش بخەوێت، چونکە لەگەڵ خەودا لەکار دەکەوتن، کاری ئەوسیستمانە خۆنەویستە ولەژێر کۆنترۆڵی وویستی مرۆڤدا نییە، کە زۆر سەرسوڕهێنەرانە وبەووردیی کاری خۆیان دەکەن، ئەویش بەهۆی بوونی چەندین سەنتەری تایبەتمەندی خۆنەویست بۆ کۆنترۆڵی لێدانی دڵ وکرداری هەناسەدان وهەرس کردن وکاری کوێرە رژێنەکان وجگەر وپەنکریاس وراگرتنی هاوسەنگی گەرمی لەش وشلەکان وچەندین کرداری تریش کە هیچمان هەستی پێناکەین ولەژێر کۆنترۆڵماندا نییە بەڵام زۆر بەووردیی وتۆکمەیی بەڕێوە دەچن.

بەیارمەتی پەروەردگار لەم نووسینەدا هەوڵدەدەین پەردە هەڵماڵین لەسەر نهێنی هەندێك لە کارە وورد وناوازەکانی سیستمەکانی لەشی مرۆڤ بە مەبەستی دەرخستنی گەورەیی دەسەڵاتی ئەو پەروەردگارەی ئەم سیستمە سەرسوڕهێنەرانەی بەدیهێناوە وهەر ئەویشە کە راگری ووردەکاریی پێکهاتەی دروستکراوەکانە لە ئاسمان وزەویدا:

﴿إن الله يمسك السموات والأرض أن تزولا ولئن زالتا إن أمسكهما من أحد من بعده إنه كان حليما غفورا﴾ (فاطر:٤١) واتە: بەراستی خوا ئاسمانەکان وزەوی راگیردەکات بۆ ئەوەی لەرێرەوی خۆیان لانەدەن وتیانەچن، بەراستی ئەگەر لە رێرەوی خۆیان لابدەن کێ هەیە جگە لە خودا راگیریان بکات بێگومان ئەوخوایە لەسەرخۆی لێبوردەیە.

لێرەدا باسی سیستمی هەناسەدان لە مرۆڤدا دەکەین، کاری سەرەکی سیستمی هەناسەدان بریتییە لە دەستەبەر کردنی گازی ئۆکسجین لە هەواوە بۆ هەمووخانەکانی لەش ورزگارکردنی ئەم خانانە لە گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن، ئۆکسجین توخمی سەرەکی ئەنجامدانی کرداری سووتاندنی مادده خۆراکیەکان ودەرپەڕاندنی ووزەیە لێیانەوە بۆ چالاکییەکانی لەش کە لە ئەنجامدا گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن پەیدادەبێت، پێکهاتەکانی سیستمی هەناسەدان ئۆکسجین لە هەواوە وەردەگرن وپاشان لە رێی خوێنەوە دەیگەننە هەمووخانەکانی لەش، ودواتر کە خوێنەکە دەگەڕێتەوە بۆ کۆئەندامی هەناسە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لەخانەکانەوە لەگەڵ خۆی دەهێنێتەوە بۆ سیستمی هەناسە وئەمیش دەیکاتە دەرەوە لەلەش بۆ ناوهەوا.



**سیستمی هەناسەدان**

**لە مرۆڤدا**

لەبەرئەوەی لـەش ناتوانێت گـازی ئۆکسـجین لەناوشـانەکانیدا هـەڵگرێت بۆیـە گرنگە کە بەردەوام لەرێی هەناسەدانەوە ئەم گازەی بۆ دەستەبەر بکرێت چـونکە دابڕانی شانەکانی لەش لـە ئۆکسـجین بـۆ مـاوەی ٣ خولـەك دەبێتـە هـۆی مـردن، لەکاتێکدا مرۆڤ بەبێ خـۆراك زیـاتر لـە ٣ هەفتـە دەتوانێـت بـژی، وبـەبێ ئاوچـەند رۆژێك دەژی، لەگەڵ ئەم فرمانە سەرەکییەی سیسـتمی هەناسـەدان بـە ٢ فرمـانی تریش هەڵدەستێت:

یەکەمیان بریتیە لە بەکارهێنانی ئەوهەوایـەی لـە سـییەکانەوە دەردەچـێت بـۆ دروسـتکردنی دەنـگ ئـەویش بـە رۆیشـتنی بەناودەنگـەژێکانی قوڕقوڕاگـە ودەم ولووتدا، دووەمیان بریتییە لـە ناسـینەوەی ئەوبۆنانـەی لەسەرچـاوە جیاوازەکـانی دەوروبـەرەوە دەردەچـن بـەهۆی وەرگرەکـانی بۆنـەوە کـە دەکەونـە سـەقفی لووتەوە.

ئەم کردارانە رێژەیـەکی مـەزن لـە زانیـاریی لـەلای مـرۆڤ کۆدەکاتـەوە، یەکـەم دەربارەی پێکهاتەی بەرگەهـەوا وئەوگازانـەی کـە پێکهێنـەرین، دووەم دەربـارەی خانـەکانی جەسـتە وئەوزینـدە کردارانـەی تێیانـدا روودەدات وپێویسـتییەکانی لـە ئۆکسجین وئەوگازانەی خانەکان دروستی دەکەن.

لێـرەدا پێویسـتە ئـەو بەدیهێنـەرەی ئـەم ووردەکارییـەی فەراهـەم هێنـاوە بەشێوەیەکی زۆر وورد حیسابی بـڕی ئـەو ئۆکسـجینە بکـات کـە لـەش لـە هـەموو چرکەیەکدا پێویستێتی وهەروەها بڕی ئەو دووەم ئۆکسیدی کاربۆنەی کە خانەکان دروسـتی دەکـەن، ئەمـەش بـە مەبەسـتی دیـاریکردنی پێوانـەی بەشـەکانی ئـەو سیستمی هەناسەدانەی دروستی دەکات بـۆ مـرۆڤ بەشـێوەیەك بێـت کـە بتوانێـت بەووردی ئەوبڕە ئۆکسجینە دەستبخات لە هەواوە کـەباسمان کـرد وهـەروەها ئـەو گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنەش بکاتـە دەرەوە کـە بەرهـەم دەهێنرێـت لەلایـەن خانەکانی لەشەوە.

ئەم بەدیهێنەرە بۆ ئەوەی بتوانێت رووبەری گشتی ناوەوەی توورەکەکانی هەوا کە پێویستە بۆ هەموو مرۆڤێك لە سییەکاندا دیاری بکات، دەبێت بەشە پەستانی ئۆکسجین ودووەم ئۆکسیدی کاربۆن لەو هەوایەی دەچێتەناو سییەکان ولە خوێنیشدا بەووردیی بزانێت، بۆ ئەوەی رێژەی ئاڵوگۆڕکێی ئەم گازانە لەنێوان هەوای دەرەوە وخوێندا لەرێی دیواری خانەکانی تورەکەکانی هەوا لەناو سییەکاندا دیاری بکرێت.

هەروەها دەبێت ئەم بەدیهێنەرە دیواری خانەکانی توورەکەکانی هەوا ودیواری موولوولەکانی خوێن بەجۆرێك ونەستوورییەکی زۆر وورد تصمیم بکات بەشێوەیەك کە ئۆکسجین ودووەم ئۆکسیدی کاربۆن سەربەستانە وبەرێژەی پێویست بتوانن هاتووچۆ بکەن لەم نێوەندەدا، ئەوپێوەرانەی کە باسمانکردن ئەگەر داوا لە زیرەکترین زانایانی ئەم سەردەمە بکرێت کە دیاریبکەن بەشێوەیەکی تیۆری بە مەبەستی دروستکردنی سیستەمێکی



هەناسەدانی گونجاو بۆ هەر کەسێك ئەوا بێگومـان دەستەوسـان دەبـن لەبەرامبـەر ئەمەدا، ئیتر چۆن مرۆڤێکی ژێر باوەڕدەهێنێت کە تصمیمی سیستمی هەناسـەدان (کـە ئەوپـەڕی ئـاڵۆزیی ووردەکـاریی وتوانـای تێدایـە) لەمرۆڤـدا بەرێکـەوت ولەخۆیەوە بووبێت لەکاتێکدا کە بەهێزترین ژیرییەکانی ئەم سەردەمە نەتوانن ئەم کارە بکەن.

هیـوادارم خوێنـەر دوای ئـەم روونکردنـەوە کورتـەی دەربـارەی پێکهاتـەکانی سیستمی هەناسەدان باسی دەکەین بەروونی بۆی دەرکەوێت کە لە هەمووبەشێکی سیسـتمی هەناسـەداندا چـەندین مـوعجیزە وبەڵگـە هەیـە لـەرووی تصـمیمی پێکهاتـەکانی وتوانـای لـەراددە بـەدەریان بـۆ هەسـتان بەوکردارانـەی پێیـان سپێردراوە، کـە دەیسـەلمێنن لەلایـەن دروسـتکەرێکی بێهاوتـا وبەدەسـەڵات وزانـا وداناوە دروستکراوە: ﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ﴾ (السجدة:٧) واتـە: زاتێکـە هەمووشتێکی بە جوانترین شێوە دروستکردووە.

سیسـتمی هەناسـەدان لـە ٦ بەشـی سـەرەکی پێکـدێت: لـووت، دەم، قـوڕگ، قوڕقوڕاگە، بۆری هەوا، وهەردووسییەکان. **بڕوانە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی لاپەڕە** ( ٣٧١ )

لـووت بریتییـە لـە یەکـەم ویسـتگەی سیسـتمی هەناسـە، خـاوەنی دیزاینێکـی سەرسـوڕهێنەرە بـەجۆرێك کـە بتوانێـت هـەر ٣ فرمانەکـەی سیسـتمی هەناسـە جێبەجێبکات، بەشی دواوەی ئێسکییە وپێشەوەی کرکڕاگەییە ئەمە یارمەتی ئەوە دەدات کە مرۆڤ بەدەست بتوانێت پێشەوەی بگوشێت بۆ دەرهێنانی دەردراوەکـان یان لووتی دابخات بەمەبەستی ڕێگریکردن لـە هەڵمژینی مـاددەی زیانبـەخش یـان بۆنی ناخۆش، کونە لووتەکان کاریان بردنە ناوەوەی هەوایە بۆ ناو بۆشایی لـووت، ئەگەر ئەم پێکهاتەیە بەرێکەوت دروستبووایە ئەوەندە بەس بووکە تـەنها دووکـون بـن بـۆ بردنـە نـاوەوەی هـەوا لـە دەم وچـاودا بـەڵام لەبەرئـەوەی دیزاینەرەکـەی پەروەردگارە دەبینین لایەنی جوانییەکەشی فەرامۆش نەکردووە کە بـەم شـێوەیە

دەرپەڕیوە وچەندین سایز وشکڵی جۆراوجۆری هەیە کە دەبێتـەهۆی دروستبوونی هەمەڕەنگی لە روخساری مرۆڤەکاندا.




بۆشایی ناولووت بە چەند دیوارێکی ئێسکی تـەنك دابەشبووە وبەناوپۆشـێکی تـەنك لـە خانـە داپۆشـراون وتوێـژاڵێك دەردراویشـی لەسـەرە، هـەروەها پـڕە لـە موولوولـەکانی خـوێن کـە کاردەکـەن بـۆ ساردکردنەوە یـان گەرمکردنـەوەی ئـەو هەوایـەی دەچـێت بـۆ سـییەکان لەگـەڵ شـێدار کردنـی، لەسـەر بەشـی پێشـەوە ناوپۆشی لـووت تـووك هەیـە کـە وەك تۆڕێك هەڵدەسـتن بـە گلدانـەوەی تەنۆلکـە گەورەکان وتـەپوتۆز لەوهەوایـەی دەچێتە لووتـەوە، هـەروەها بـوونی گەنـدەموو لەسـەر ناوپۆشـی بەشـی دواوەی لـووت لەگـەڵ ئـەو توێژاڵـە تەنکـە لەشـلەمەنی لەسەریان ئەمانیش دەبنەهۆی گلدانـەوەی تەنۆلکـە ووردەکـانی ناوهـەوا، وپاشـان

جووڵەی ئەم گەندەموانە بەرەو قورگ دەبێت بۆ فڕێدانە دەرەوەی لەڕێی دەمەوە، جۆگەکانی فرمێسکیش کە لە چاوەکانەوە دێن لەبەشی سەرەوەی لووتدا دەکرێنەوە.

لە تەنیشتەکانی لووتدا ولەناوئێسکی کەللەی سەردا چوار جووت گیرفانی هەوایی هەن کە لەناولووتدا دەکرێنەوە وکاریان شێدار کردنی لووتە بە دەردراوەکانیان هەروەها دەبنەهۆی سووککردنی کێشی کەللەی سەر لە مرۆڤدا ورۆڵێکی گرنگیان هەیە لە باشترکردنی کوالیتی دەنگ لە مرۆڤدا وەك بۆشاییەکی دەنگدانەوە (Resonant Cavities)، لە سەقفی لووتیشدا ٢ پارچە ناوپۆشی تایبەت هەیە کە هەریەکێکیان نزیکەی ٥ ملیۆن خانەی وەرگری بۆن (Olfactory receptors)یان تێدایە کە بەکاردێن بۆ بۆنکردن وناسینەوەی بۆنە جیاوازەکان.

فرمانی سەرەکی بۆشایی لووت بریتییە لە ڕێگریکردن لە چوونە ناوەوەی ڕاستەوخۆی هەوا لە بەرگەهەواوە بۆ ناوسییەکان کە لێرەدا پلەی گەرمی هەواکە وەك پلەی گەرمی لەشی لێدەکرێت چونکە هەوای زۆر سارد یان زۆر گەرم دەبێتەهۆی فەوتاندنی خانەکانی ناوپۆشی تورەکەکانی هەوا لە سییەکاندا، هەروەها هەواکە شێداریش دەکرێت بۆ ئەوەی نەبێتەهۆی ووشکردنەوەی ناوپۆشی سیستمی هەناسە.

هەر لە لووتدا هەواکە بەسەر خانە هەستیارەکانی بۆن لە سەقفی لووتدا دەبرێت بە مەبەستی ناسینەوەی بۆنەکان، لەلایەکی تریشەوە مووەکان وگەندەمووەکانی لووت لەگەڵ ئەوتوێژاڵە شلەمەنییەی لەسەریانە دەبنەهۆی پاڵفتەکردنی هەواکە لەوتەنۆلکە گەورە ووردانەی هەڵیدەگرن کە ئەگەر ئەم میکانیزمە نەبووایە سییەکان هەر زوودەفەوتان بەهۆی کەڵەکەبوونی پیسی وتەپوتۆز لەناویاندا.

هـەروەها لـووت وگیرفانـە هەواییـەکانی دەوروبـەری رۆڵێکـی گرنگـی هەیـە لـە باشترکردنی کوالیتی دەنگەکان کە لە دەمەوە دێنـە دەرەوە، مرۆڤـەکان بـەبوونی ئەو ژیرییەی هەیانە هێشتا هەموفرمانەکانی لـووتی مرۆڤیـان بـۆ دەرنەوکـەوتووە وتـەنها دوای چـەندین لێکۆڵینـەوەی دوور ودرێـژ و وورد ئەوسـا درکیـان بـەم فرمانانەی کردووە چ جای بتـوانن پێکهاتەیـەکی وەك لـووت دروسـت بکـەن! ئـیتر چۆن مرۆڤێکی ژیر کە رێز لە زانست وژیریی خۆی بگرێـت بـاوەڕ بـەوە دەکـات کـە ئەم دروستکراوە ناوازەیەوبەرێکەوت هاتبێتە بوون وتەصمیم کرابێت!!!

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أم خلقوا من غير شـيء أم هـم الخـالقون، أم خلقـوا السموات والأرض بل لايوقنون﴾ (الطـور:٣٥)، واتـە: ئایـا ئـەوان بـێ دروسـتکارێك لەخۆیانـەوە دروسـت بـوون؟ یـان خۆیـان دروسـتکاری خۆیـانن؟ ئـەی ئایـا ئـەوان ئاسمانەکان وزەویان دروستکردوە؟(نەخێر وانییە) بەڵکودڵنیانین وگومانیان هەیە.

لەدوای لووت قورگ (Pharynx or Throat) دێت کە بریتییە لە رێڕەوێکی هاوبەش لەنێوان دەم ولووتدا ولە بۆرییەکی ماسولکەیی پێکدێت کە درێژییەکـەی ١٣ سانتیمەترە. **بڕوانە وێنەی رەنگاورەنگی لاپەرە (٣٧٢)**

لەناوقورگدا ٧ دەرچە دەکرێتەوە کە بریتین لـە دەرچـەکانی دەم و٢ دەرچـەی دواوەی لـووت ودووجۆگەلـەی ئۆسـتاکی کـە لـە هـەردووگوێی ناوەڕاسـتەوە دێـن ودەرچەی سەرەوەی قورقوراگە (Larynx)، قورگ بـۆ ٣ بـەش دابـەش دەبێـت: بەشی لووتیی قورگ خانە ناوپۆشـەکانی بـە گەندەموودارپۆشـراون کـە ئاراسـتەیان بەرەوقورگ ودەم دەجووڵێت بۆ گەیاندنی دەردراوەکانی لووت بۆ قورگ ودوایی بۆ دەم، هـەر لـەم بەشـەدا جۆگـە ئۆسـتاکیەکان دەکرێنـەوە کـە فرمانیـان راگرتنـی پەستانی هەوایە لە گوێی ناوەوەدا، بەشـی دەمیـی قـورگ رێڕوێکـی هاوبەشـە بـۆ خـۆراك وهـەوا و٢ جـووت لەوزەتـەینی تێدایـە کـە ئـەم بەشـەی قـورگ لـە دەم جیادەکرێتەوە بەهۆی زمانە بچکۆلەوە (Uvula) کە لـە کـاتی جـووینی خۆراکدا

ئەم زمانە بچکۆلەیە دواوەی دەم دادەخات بە مەبەستی هێڵانەوەی ڕێڕەوی هـەوا بـۆ ناوقورقوڕاگـە وبـۆری هـەوا وبـەردەوام بـوونی هەناسـەدان لـەکاتی جـووینی خۆراکـدا، هـەر ئـەم زمانـە بچـکۆلەیە دەرچـەی لـووتی قـوڕگ دەگرێـت لـەکاتی قووتدانی پارووداً بۆ ئەوەی خۆراك نەگەڕێتەوە بۆ ناوبۆشایی لووت.

بەشی قورقوڕاگەیی قوڕگ بەشی خوارەوەی قوڕگـە کـە ئـەمیش جیادەبێتـەوە بۆ ٢ بەش کە بەشێکیان دەچێتە ناوبۆری خۆراك (سورێنچك) وبەشەکەی تر بـۆ ناو قورقوڕاگە، ولە نێوانیاندا دەرگایەك هەیە کە ئۆتۆماتیکی کۆنترۆڵ وکاردەکـات لـەنێوان قورقوڕاگـە وبـۆری هـەوا لەلایـەك وبـۆری خۆراکـدا لەلایـەکی تـر کـە پێیدەوترێت زمانەی قورقوڕاگە (لسان المزمار Epiglottis)، ئەم بەشەی قـوڕگ بریتییە لە ڕێڕەوێکی هاوبەش لەنێوان ئـەو خۆراکـەی لـە دەمـەوە دێـت بـۆ بـۆری خـۆراك وئـەو هەوایـەی لـە لووتـەوە دێـت بـۆ بـۆری هـەوا، زمـانی قورقوڕاگـە بەشـێوەیەکی ئۆتۆمـاتیکی هەڵدەسـتێت بـە داخسـتنی ڕێـڕەوی هەناسـە لـە قورقوڕاگەدا کاتێـك مـرۆڤ هەڵدەسـتێت بـە قوتـدانی خـۆراك، ئـەویش بەمەبەسـتی ڕێگریکردن لە چوونی ئەوخۆراکە بۆ ناو ڕێڕەوی هەناسە.

حیکمـەت ومیهرەبـانی پـەروەردگار لـە تەصـمیمی ئـەم ڕێـڕەوە هاوبەشـەدا بەروونی دەردەکەوێت، چونکە ٢ ئامانجی زۆر گرنك بەدیدەهێنێت: یەکەم ئەوەیـە کە دەتوانرێت لەکاتی پێویستیدا دەم وەك ڕێـڕەوی هـەوا بـەکاربهێنرێت لـەجیاتی لووت لە کرداری هەناسەداندا، ئەویش کاتێـك مـرۆڤ تووشـی هەڵامـەت وئینفلـوەنزا دەبێت لووتی دەگیرێت بەهۆی کەڵەکە بوونی دەردراوەکان تێیدا، لەم کاتـەدا دەم ڕۆڵی لووت دەبینێت لە گەیانـدنی هـەوا بـۆ نـاوبۆری هـەوا وسـییەکان، دووەمـیش بریتییـە لـە بـەکارهێنانی ئەوهەوایـەی لـە سـییەکانەوە دەردەچـێت بـۆ کـرداری دروست کردنی دەنگ کە لە دەنگەژێکانی ناو قورقوڕاگـەوە دروسـتدەکرێت ودواتـر بـەناو پێکهاتـەکانی دەمـدا دەڕوات بـۆ بەرهـەمهێنانی ئەوقسـانەی لـە دەمـەوە

دەردەچێت، هەروەها قورگ فرمانێکی لاوەکیشی هەیە کە وەك بۆشاییەکی دەنگدانەوە کاردەکات بۆ بەهێز کردن وپاڵفتە کردنی هەندێك لەو لەرە دەنگیانەی کە دەنگەژێکان بەرهەمی دێنن کە دەبێتە هۆی باشتر کردن وخۆشتر کردنی جۆری ئەودەنگانەی لە دەمەوە دێنە دەرەوە.

پێکهاتەیەکی تری سیستمی هەناسە بریتییە لە (قورقوراگە Larynx) کە دوای ئەو بەشانەی پێشتر دەستپێدەکات، وسندوقی دەنگ (Voice Box)یشی پێدەووترێت، بریتییە لە سندوقێکی کرکراگەیی ودەکەوێتە پێشەوەی مل، درێژییەکەی لەپیاواندا دەگاتە (٤٤ملم) ولە ئافرەتاندا (٣٦ملم)ە وتیرەکەی دەگاتە (٣٠ملم)، بەهۆی فرمانە جۆراوجۆرەکانییەوە پێکهاتەیەکی میکانیکی ئاڵۆزی هەیە بەڵام بەشێوەیەکی زۆر وورد دیزاینکراوە بۆ بەئەنجام گەیاندنی فرمانەکانی کە سەرەکیترینیان بریتیە لە دروستکردنی دەنگ.




قورقوراگە لە ٦ جۆر کرکراگە پێکهاتووە کە سیانیان تاك وسیانیان جووتن، گەورەترینیان بریتییە لە کرکراگەی دەرەقی (Thyroid Cartilage) ، کە

پێشی دەووترێت سێوی ئادەم (Adam's Apple) ولە ٢ لەوحی چەماوە پێکهاتووە، کاتێك لەپێشەوە یەکدەگرن بەرزاییەك دروستدەکەن لەپێشەوەی ملدا، گۆشەی نێوان ئەم ٢ لەوحە لە پێشەوەی ملدا لە پیاواندا ٩٠ پلەیە ولە ئافرەتاندا ١٢٠ پلەیە کە وادەکات ئەم بەرزاییەی پێشەوەی مل لەپیاواندا دیارتربێت بەڵام لە ئافرەتاندا زۆر کەمتر دیارە ومەبەست پێی لایەنی جوانییە لە ئافرەتاندا.

ئەم جیاوازییە لە تەصمیمی قورقوڕاگە لەلای پیاوان وئافرەتان کە یەك فرمانیشیان هەیە تەنها مەبەست پێی بەرچاوگرتنی لایەنی جوانییەتی لای ئافرەتان، ئەمە وەڵامێکە بۆ ئەوانەی بێباوەڕن، چونکە هیچ مرۆڤێکی ژیر ناتوانێت بڵێت ئەمە بەرێکەوت دروست بووە، تەنانەت ئەگەر مرۆڤیش ئەمەی دیزاین بکردایە ئەم جیاوازییەی بەهەند وەرنەدەگرت [5] .

یەکێکی تر لە کرکراگەکانی قورقوڕاگە بریتییە لە زمانەی قورقوڕاگە (لسان المزمار Epiglottis) کە لە شکڵی گەڵا یان کەوچکدایە وهەڵدەستێت بە داخستنی قورقوڕاگە بەتەواوی لەکاتی قووتدانی خواردن وخواردنەوەدا بەهۆی گرژبوونی ئەو ماسولکانەی کۆنترۆڵی جووڵەکەی دەکەن.

لە ناوەراستی بۆشایی قورقوڕاگە لەمرۆڤی ئاساییدا ٢ جووت پەردە هەیە کە دەکەونە سەر یەکتری، پەردەی خوارەوە پێیدەووترێت دەنگەژێ راستەقینەکان (True Vocal Cords) وپەردەی سەرەوە پێیدەووترێت دەنگەژێ ناڕاستەقینەکان (False vocal cords) ئەم دەنگەژێیانە بەهۆی چەند ماسولکەیەکەوە دەجوولێنرێن کە گرێدراون بەدیوارەکانی قورقوڕاگەوە، گرژبوون وخاوبوونەوەی ئەم ماسولکانە دەبێتەهۆی داخستن وکرانەوەی ئەم دەنگەژێیانە بەمەبەستی گۆڕینی لەرەلەری ئەو دەنگ وئاوازانەی دروستی دەکەن.

---

[5] Davidson's principles & practice of medicine-page 646 .
- Textbook of Medical physiology page 478 .




ئـەوەی شـایانی باسـە ئـەو٢ دەرچـەیەی لـە دەنگەژێکانـدا هـەن بەیەکـەوە دەکرێنــەوە ودادەخــرێن بەهەماهەنگییــەکی تــەواوەوە، کــە لــەکاتی ئاســاییدا بەتــەواوەتی کراونەتــەوە بــۆ گەیانـدنی هــەوا بـۆ نـاوبۆری هــەوا، بـەلآم لـەکاتی قسەکردندا بەشێوەیەکی ناتەواوادادەخرێن بۆ دروستکردنی دەنگـەکان، یـەکێك لـە فرمانەکانی دەنگەژێکان بریتییە لـە دروسـتکردنی کۆکـە بـە مەبەسـتی دەرکردنـی خۆراك ودەردراوەکان لە قورقوڕاگەوە کاتێك دەپەڕێتە ناوی لە قوڕگەوە.

کـاری سـەرەکی دەنگـەژێکان بریتییـە لـە دروسـتکردنی دەنگـەکان بـەهۆی لەرینـەوەیان لـە ئـەنجامی تێپـەڕبوونی هـەوا بەناویانـدا لـە سـییەکانەوە بـەرەو سـەرەوە، درێـژی دەنگـەژێکان لەپیاوانـدا لـەنێوان (١٧.٥ بـۆ ٢٥ملم)دایـە و لـە ئافرەتاندا لەنێوان (١٢.٥ بۆ ١٧.٥ملم) دایە وئەستوورییان(٢-٣ ملم)ە، لەرەلەری ئـەو دەنگانـەی دروسـتدەبن لـە دەنگەژێکانـەوە پێچـەوانەیە لەگـەڵ درێژییانـدا، هەربۆیە لە قورقوڕاگـەی پیاوانـەوە لەرەلـەری دەنگـەکان دەگاتـە ١٢٥هێرتـز ولـە ئافرەتاندا دەگاتە ٢١٠ هێرتز لە چرکەیەکدا بەهۆی کورتیی دەنگە ژێکانیانەوە ولە منالآنیشدا دەگاتە ٣٠٠ هێرتز لە چرکەیەکدا.

لەگــەڵ ئــەم لەرەلــەرە ســەرەکییانەدا دەنگــەژێکان چــەندین لــەرەی تــر دروســتدەکەن کــە پێیانــدەووترێت دەنگــە ســازەکان یــان هاوســۆزەکان

(harmonics) کە لەرەیان لەوانەیە بگاتـە ٢٠ هـەزار هێرتـز، چـەندین دەنگـی نەویسـتراو لـە دەنگەژێکانـەوە دروسـتدەبن بـەڵام بـەهۆی ڕۆشـتنیان بـەناو بۆشـاییەکانی ڕێڕەوەکـانی سـەرەوەی هەناسـەدا وەك قـوڕگ ودەم ولـووت وقورقوڕاگە وگیرفانەکانی لووتدا، ئەم دەنگانە پاڵفتە وگونجاودەکرێن.

دوای قورقوڕاگـە لـە سیسـتمی هەناسـەدا بـۆری هـەوا (Trachea) دەستپێدەکات کە درێژییەکەی لەنێوان (١٠-١٦سم) دایە وتیرەکـەی لـەنێوان (٢-٣سم) دایە ودەکەوێتە بەردەم سورێنچك، دیواری بۆری هەوا لە ئەڵقەی کرکراگەیی ناتەواو لە بەشـی دواوەی پێکـدێت وژمارەیـان دەگاتـە ٢٠ ئەڵقـە، بەشـی کـراوەی دواوەی ئەم ئەڵقانـە بـەهۆی ڕیشـاڵی ماسـولکەیی خۆنەویسـت پێکـەوە گرێـدراون ولەکاتی گرژبوونیاندا دەبنەهۆی کەمکردنەوەی تیرەی بۆری هەوا [٦].

## بۆری هەوا چەندین فرمانی گرنگی هەیە:

فرمانی یەکەم وسەرەکی بریتییە لە گەیاندنی هەوا بۆ ناوسییەکان کە پێویست دەکـات بـە بـەردەوامی ئـەم بۆرییـە کـراوە بێـت، بـوونی دیـوارە کرکراگەییەکـەی وادەکات ئەم کارە ئاسان ببێت، وهیچ هۆکارێـك نابێتـە هـۆی داخسـتنی بۆرییەکـە مەگەر ئەم پێکهاتە کرکراگەییە تێکبچێت بەهۆی نەخۆشییەکانەوە.

بەڵام بۆ فرمانێکی تری بۆری هەوا کە بریتییە لـە دەرکردنـی بەڵغـەم ومـاددەی تر کە دەپەڕێتە بۆری هەواوە پێویست دەکات تیرەکەی بچووك بکرێتـەوە لـەکاتی کۆکە وپژمیندا بەمەبەستی دەرپەڕاندنی ئەم ماددانە بۆ دەرەوەی بۆری هەوا، کـە ئەمەش بـەهۆی بـوونی پێکهاتـەی ماسـولکەیی لـە دیـواری بـۆری هـەوادا وپاشـان گرژبـوونی ڕیشـاڵە ماسـولکەییەکانی گرێـدەری ئەڵقـەکانی بـۆری هـەواوە دەبێـت، هـەروەها دروسـتکردنی دەنگـیش لـە قورقوڕاگـەدا پێویسـتی بـە تەسـکبوونەوەی

٦ بابەتی: وفي أنفسكم أفلا تبصرون – الجهاز التنفسي.
-Davidson's principles & practice of medicine - page 647

بۆری هەوا هەیە بەمەبەستی لەراندنەوەی دەنگەژێکانی قورقوراگە بەو هەوایەی لە سییەکانەوە دێت.

فرمانی چوارەمی کە لەوانەیە بەخەیاڵی زوربەماندا نەهاتبێت بریتییە لە ئاسانکردنی تێپەڕبوونی خۆراك بەناوبۆری سورێنچکدا کە دەکەوێتە پشتەوەی بۆری هەوا، ودیوارەکانی هەردووکیان پێکەوە نووساون.

بۆ ئەوەی بۆری هەوا هەمووئەم فرمانانە جێبەجێ بکات ئەم دیزاینە ناوازەیەی بۆ کراوە کە لە ئەڵقەی کرکراگەیی ناتەواو دروست بووە وبەشە کراوەکەی بە ریشاڵی ماسولکەیی پێکەوە گرێدراون وئەڵقەکان تەواو دەکەن، کە تەنها لەکاتی قسەکردن یان کۆکە یان پژمیندا گرژدەبێت وبۆری هەوا تەسکدەکەنەوە، بەڵام لەکاتی ئاساییدا کە فرمانی تێپەڕاندنی هەوایە بۆ ناوسییەکان ماسولکەکانی بۆری هەوا خاودەبنەوە بە تەواوەتی، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم بۆرییە بەردەوام کراوە بێت.




بەشە کراوەکەی ئەڵقەکانی بۆری هەوا شوێنی کرانەوەیان بەشێوەیەك هەڵبژێردراوە کە ئەوبەشە بێت کە نووساوە بە بۆری سورێنچکەوە، ئەمە وادەکات بوار بدات بە سورێنچك کە بکشێت لەکاتی قوتدانی خۆراکدا وبە ئاسانی پێیدا

تێپـەڕێت، کـە ئەگـەر بەشـە کڕکڕاگەییەکـەی بـۆری هـەوا بنوسـایە بـە بـۆری سورێنچکەوە ئـەوا بـواری نـەدەدا بـە بـۆری سورێنچـك بـۆ کشـان وگـەورەبوون، دەبنـوارە لـەم وردەکارییـە گەورەیـە لـە دیـزاین وگونجانـدن کـە دەیسـەلمێنێت دروستکراوی پەروەردگارێکی زانا وبەسۆز وشارەزایە.

تەنانـەت دیـزاین کردنـی بـۆری هـەوا بەوشـێوەیەی لـە ئەڵقـەی کڕکڕاگـەیی دروستبووە کە نێوان ئەم ئەڵقانەش بریتیە لە ماسولکەی خۆنەویست مەبەستێکی گەورە لە پشتیەوەیەتی، چونکە گرژبوونی ماسولکەکانی نێوان ئەڵقەکان دەبێتـە هۆی کورت کردنەوەی بۆری هەوا بۆ سەرەوە وپاشان بەرز کردنـەوەی قوڕقوڕاگـە بۆ سەرەوە بەمەبەستی داخستنی دەرچەکەی سەرەوەی بەتوندی لەلایەن زمانەی قوڕقوڕاگەوە لەکاتی قوتدانی خۆراکدا.

ناوپۆشـی نـاوەوەی بـۆری هـەوا لـە خانـەی تـەخت پێکهـاتووە کـە خـاوەنی گەنـدەمووی وردن وبـەرەو سـەرەوە دەجـوولێن وهـەروەها ماددەیـەکی تـەنکی لینجیش دەردەدەن بەمەبەسـتی شـێدارکردنی هـەوا وپاککردنـەوەی لەوخڵتانـەی لەگەڵیدادێن، کە دواتر ئەم ماددەیە بەهۆی گەندەمووەکانەوە بەرەو قورگ پاڵیـان پێوەدەنرێت ولەرێی دەمەوە دەکرێنە دەرەوە.



**داری بۆریچکە هەواییەکان لەناو سییەکاندا**

بـۆری هـەوا دابەشـدەبێت بـۆ ٢ بۆریچـکەی هـەوای لای راسـت وچـەپ کـە هەریەکێکیان دەچێتەناوسیەکی مرۆڤەوە وپاشان لەناوسییەکاندا دابەش دەبن بۆ بۆریچکەی هەوا وبۆریچکەلەی هەوای بچووکتر تـا سـەرەنجام دارێکـی بۆریچـکەلە هەواییەکان (Bronchial tree) دروستدەکەن، پێکهاتەی دیواری ئەم بۆریچکە وبۆریچکەلە هەواییانە وەك پێکهاتەی بۆری هەوا وایە تەنها لەوەدا نەبێت کە ئەڵقە کڕکڕاگەییـەکانیان بازنـەی تـەواوە، چـونکە ئـەمان تـەنها فرمانیـان بریتییـە لـە تێپەڕاندنی هەوا بۆ ناو تورەکەکانی هەوا لەناو هەردوو سییەکاندا، وپێویسـتە ئـەم بۆرییە هەواییانە بە بەردەوامی کراوە وفراوان بن.



داری بۆریچکە هەواییەکان لەناوسییەکاندا (TREE BRONCHIAL)

کۆتایین بەشی سیستمی هەناسە بریتییە لە سییەکان (Lungs)کە ٢ دانەی لای راست وچەپن، کێشی هەردووکیان ١ کگم دەبێت وشکڵیان قووچەکییە وبنکەکانیان لەسەر پەردەیەکی ماسولکەیی خۆنەویست دامەزراون کە پێیدەوترێت ناوپەنچك (Diaphragm).

هەر سییەکیان چەند پلێکیان هەیە: لای راست ٣ پل ولای چەپ ٢ پل، ئەویش بەهۆی بوونی دڵ لەبەردەمی سی چەپدا، سییەکان لەناو بۆشایی قەفەسی سنگدا بە دووچینی پەردەیەکی تەنك داپرۆشران کە پێیاندەوترێت پەردەی سییەکان (Pleura).

چینێکیان نووساوە بە سییەکانەوە وچینەکەی تر قەفەسی سنگی ناوپۆش کردووە ولە نێوانیاندا شلەیەکی روونی کەم هەیە کە یارمەتی لێکخشاندنی ئەم ٢ چینە پەردەیە دەدات بەسەر یەکدا بەبێئەوەی بنووسێن بەیەکەوە، پەردەی داپۆشەری سییەکان رۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لەکرداری هەناسەدان وفراوانکردنی سییەکان بۆ وەرگرتنی هەوای دەرەوە، هەروەها سییەکان دەپارێزن لە لێکخشانیان بەدیواری ناوەوەی قەفەزی سنگ وپەراسووەکان هەروەها کاریگەریی لێدانی دڵ لەسەر سییەکان ناهێڵن.

کۆتایین بەشی بۆریچکەلەکانی هەوا لەناو توورەکەکانی هەوا یان سیکڵدانۆچکەکان (Alveoli) لەناو سییەکاندا دەکرێنەوە کە دیوارەکانیان لە ١چین لە ٢ جۆر خانە پێکدێت:

جۆری یەکەم زۆرترن کە کاریان ئاڵوگۆڕکردنی ئۆکسجین ودووەم ئۆکسیدی کاربۆنە لەنێوان هەوای دەرەوە ومووولوولەکانی خوێندا.

جۆری دووەم ماددەیەك دەرێژن کە پێیدەوترێت (surfactant) کە ناوپۆشی توورەکەکانی هەوا دەکات ودەبێتە هۆی کرانەوەیان بەشێوەیەکی بەردەوام لەکاتی هەناسە وەرگرتن وهەناسەدانەوەدا، واتە توورەکەکانی هەوا وەك میزەڵدان

لێدەکات کە هیچ کاتێك ناقوپێت، ژمارەی ئەم تورەکانەی هەوا زیاتر لە ٣٠٠ ملیۆن دانە دەبن لە هەردوو سییەکاندا وتیرەیان لەنێوان (٠،١ – ٠.٢) ملم دایە.

ئەگەر رووبەری گشتی ناوەوەی ئەم توورەکانەی هەوای سییەکان بپێوین لەنێوان (٧٠ – ١٠٠ مەتر دووجا)دا دەبن، ئەمەش بۆ ئەوەی سییەکان بەوپەڕی تواناوە بتوانن ئۆکسجین لەهەواوە وەرگرن ودووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە لەشەوە بکەنە دەرەوە.

هەریەکێك لەم توورەکانەی هەوا تۆڕێکی چڕ لەموولوولەکانی خوێن دایپۆشیون کە کاری ئاڵوگۆڕکێی گازەکان لەنێوان خوێن وهەوای ناوتورەکەکانی هەوا ئەنجامدەدەن.




لەنێوان تورەکەکانی هەوادا شانەی بەستەری دەوڵەمەند بە ریشاڵی لاستیکی هەیە (elastic fibers) کە پێکهاتە وسروشتێکی نەرم ولاستیکی دەدەنە سییەکان وکاری کشان وچوونەوەیەکی سییەکان ئاساندەکەن، ئەوخوێنبەرەی لە دڵەوە دێت بۆ سییەکان دەبێت دابەش ببێت بۆ ٣٠٠ ملیۆن لق لەناو سییەکاندا، کە دواتر هەریەکێکیان دەگاتە تورەکەیەکی هەوا لە سییەکاندا ولە چواردەوری ئەم توورەکانەدا دابەشدەبن وتۆڕێکی چڕ لە موولوولەی خوێنی خوێنبەر، ودواتر موولوولەی خوێنی خوێنهێنەر دروستدەکەن، کە ئەستوورییەکەی تەنها (٠.٢ ملم) دەبێت.

پاشانیش لێرەوە ئەم موولوولانە دیسانەوە یەكدەگرنەوە بۆ دروستكردنی خوێنهێنەرێكی بچووك، ئەم لقانەی خوێنهێنەریش ژمارەیان دەگاتە ٣٠٠ ملیۆن لق كە بەرەبەرە یەكدەگرن وسەرەنجامیان خوێنهێنەری سەرەكی سییەكان دروستدەكەن ودەچێتەوە ناودڵ. **بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەكانی لاپەڕە (٣٧٣)**

ڕاكێشانی ئەم تۆڕە مەزنە لە بۆرییەكان وموولوولەكانی خوێن لەرووی ژمارەیان و ووردییان وگەیشتنی هەریەكێكیان بەئامانجی خۆی كە توورەكەكانی هەوایە لەسییەكاندا، كارێكە كە ئەگەر هەموو مرۆڤایەتی بۆی كۆببنەوە ناتوانن ئەنجامی بدەن !! ئیتر چۆن بێڕێزی نییە بەژیریی مرۆڤ كە بڵێین ئەمە لە ئەنجامی ڕێكەوتەوە دروستبووە؟! بەڵكودەبێت دانبنێین بەوەدا كە ئەوەی ئەم دیزاینە مەزن وناوازەیەی فەراهەم هێناوە تەنها خودای پەروەردگاری هەموو جیهانیانە (سبحانه وتعالى).

دەركەوتنی ئەم ووردەكارییە گەورانە لە دروستكردنی پێكهاتەكانی لەشی مرۆڤدا بەئاشكرا شایەتی دەدات لەسەر ئەوەی كە بەرهەمی دروستكەرێكی زانا ودانا وبەدەسەڵاتە، كە ئاگاداری هەموو نهێنییەكانە وپەروەردگاری هەموو دروستكراوەكان وراگری ئەم ووردەكارییە گەورەیەیە: ﴿صنع الله الذي أتقن كل شيء إنه خبير بما تفعلون﴾ (النمل) واتە: ئەمە دروستكراوی ئەو خوایەیە كە هەموو شتێكی بەوپەڕی ڕێك وپێكی دروست كردووە بەڕاستی خوا ئاگادارە بەهەر كردەوەیەك ئێوە دەیكەن، هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت﴿هذا خلق الله فأروني ماذا خلق الذين من دونه بل الظالمون في ضلال مبين﴾ (لقمان:١١) واتە: ئەمە دروستكراوی خودایە، دەی نیشانم بدەن ئەوانەی بێجگە لە خودا چییان دروست كردووە (هیچیان دروست نەكردووە) بەڵكوستەمكاران لە گومڕاییەكی ئاشكرادان.

﴿إنّا كل شيء خلقناه بقدر﴾ (القمر) واتە بێگومان ئێمە هەمووشتێكمان بە قەدەر وئەندازە دروستكردووە.

## سەرچاوەکان:


- پوختەی تەفسیری قورئان - م .محمد ملا صالح بامۆکی.

- وفي أنفسكم أفلا تبصرون – الجهاز التنفسي – الدكتور منصور العبادي أبوشريعة – سایتی: (موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة).

- إعجاز الله تعالى في خلق جسم الإنسان – محاضرة لفضيلة الدكتور محمد راتب النابلسي.

- Davidson's principles & practice of msdicine – 22nd Edition- 2014 - Pages: 644-649.

- Textbook of Medical physiology- Guyton & Hall- 11th Edition- 2006 - pages: 471- 49.

# زانستی نویٚ شایەتی پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) دەدات

## ( ١٠٠ ) بەڵگە لە راستییەکانی زانستی نوێوە

ئەم بەشەی کتێبەکەمان بریتییە لە وەرگێڕانی چەند بەشێك لە کتێبی: {هذا محمد رسول الله (ﷺ)وهذه براهين رسالته - ئەمەیە محمد (ﷺ) نێردراوی خودا وئەمانەش بەڵگەکانی پەیامەکەین} .

لە نووسینی (د.عبدالله بن عبدالعزیز المصلح) ئەمینداری پێشووی (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة)، کە کتێبێکی بەپێزە دەربارەی ژیاننامەی پێشەوامان وتێیدا (١٠٠) بەڵگەی زانستیی دێنێتەوە بۆ سەلماندنی راستیی پەیامی پیرۆزی پێغەمبەرمان، منیش پێم خۆشبوو هەندێك لە بەڵگە زانستییەکانی وەربگێڕم بەدەستکاریی گونجاوەوە، بەو هیوایەی بەپشتیوانی خودا لە داهاتوودا بتوانم سەرجەم بەڵگەکان لە دووتوێی کتێبێکی جیاوازدا بەچاپ بگەیەنم.



# پێشەکی

سوپاس وستایش بۆ پەروەردگاری جیهان، سوپاسێك كە شایەنی گەورەیی دەسەڵاتی بێت، درووود وسەلام بۆ سەر گیانی پاكی پێغەمبەر وخۆشەویست وسەركردە وپێشەوامان محمد (ﷺ) درووود وسەلامێكی هەمیشە بەردەوام تا ئەو كاتەی میراتی زەوی وجێنشینەكانی بۆ لای پەروەردگار دەگەڕێتەوە.

محمد (ﷺ) ئەو پێغەمبەرەیە كە بەپەیامەكەی رووناكی ئیمان درەوشایەوە.

محمد (ﷺ) ئەو پەیامبەرەیە كە بەهۆیەوە پەروەردگار مرۆڤەكانی دەرهێنا لە یەكتری پەرستی وبتپەرستیەوە بۆ پەرستنی پەروەردگاری بەخشندەی میهرەبان.

محمد (ﷺ) ئەو كەسەیە كە پەروەدگار بەهۆی ئەوەوە دەروونە رێك ورەوانەكانی دامەزراند وبیروهۆشە پاكەكانی رووناك كردەوە وبەهۆیەوە كۆمەڵگای چاكەكاریی دامەزراند، مرۆڤایەتی سەرلەنوێ بە پەیامەكەی لەدایك بووەوە پاش ئەوەی وونبوو بوو لە رێرەوەكانی بتپەرستی ونەفامی وزۆرداری وستەمی مرۆڤەكان لە برا مرۆڤەكانیان.

یەكێك لەو قوتابیانەی كە لە سەرچاوەی پێغەمبەرایەتی گۆشكرابوو ئەم راستییەی دەربڕی كاتێك كە ووتی: ئێمە گەلێكین خودا ناردووینی بۆ دەرهێنانی مرۆڤەكان لە بەندایەتی بەندەكانەوە بۆ بەندایەتی پەروەردگاری بەندەكان، ولە تەنگەبەری دونیاوە بۆ ئاسۆ فراوانەكان، ولە ستەم وزۆرداریی ئاینەكانی ترەوە بۆ دادپەروەری ئیسلام.

محمد (ﷺ) ئەو پەیامبەرەیە كە سیرە وژیاننامەكەی بەرنامە وپەیڕەوە، كارەكانی دادگەرانە وراست ورەوان بوون، دامەزراویی ئەو لەسەر بانگەوازەكەی پێشەنگە بۆ ئێمە، وبانگەوازەكەی مەشخەڵی دەستی رێبوارانی رێگای راستە، ئەوانەی كە پەروەردگار چاكەی لەگەڵ كردوون لە پێغەمبەران وراستگۆیان

وشـــەهیدان وپیاوچـــاکان، لەهـــەمان کاتـــدا بەڵگـــەکانی ســـەلماندنی راســـتیی بانگەوازەکەی زیندو وزانراو وبینراون.

پەیامبەرمان (ﷺ) ئاینەکەی حەق وراستیی بوو: لە بیروباوەڕ وپەرستشـەکان وخورەووشـت وياسـاكانی بـۆ ژیـان، ئاینـه راسـتەکەی ڕێکخـەری هـەمووکاروباری ژیانـە، ڕێبازەکـەی پـارێزراوە وبەڵگـەکانی ئاشـکران، وهەماهـەنگیی تەواوهەیـە لـەنێوان ئایـەت وبەڵگـە نوسـراوەکان لـە قورئـان وسـوننەتدا وئایـەت وبەڵگـە بینراوەکان لە گەردوون ولەشی مرۆڤدا.

لەمڕۆمانـدا کـاتی ئـەوە هـاتووە بـۆ ئەومرۆڤایەتیـەی کـە بانگـەوازەکانی خراپەکاریی تێیدا زیادیان کردووە وهۆکارەکانی لەخشتە بردن وگومڕاکردن تێیدا جۆراوجۆربـوون ورێگاکـانی گـومڕایی مرۆڤیـان سەرلێشـێواوکردووە، ودەنگـەکانی داواکردنـی ڕزگـاریی وفریـاگوزاریی بـەرز بوونەتـەوە، کـە داوای فریادڕەسێك لـە گـومڕایی ورزگارکـەرێك دەکـەن لـەوەی تووشـی مرۆڤایـەتی بـووە لـە ناڕەحـەتی وتەنگەبـەریی وسەرلێشـێواویی، لێـرەدا مرۆڤـی وەڵامـدەری راسـتگۆیی وهـاوڕێی چاکەخوازیی هاواری بانگەوازی راستی دەکات.

لـەم کتێبـەدا هەڵساوین بـە ناسـاندنی محمـد (ﷺ) کـە سەرمەشـقی هیدایـەت وباشـترینی دروسـتکراوەکانە، ئـەو کەسـەی راسـتیی بـۆ خـەڵك رۆشـنکردەوە وبەڵگەکانی بۆ دەرخستن، لەسەر پەیامێکی سپی ودرەوشـاوە جێـی هێشـتین کـە شـەوورۆژی وەك یـەکن، تـەنها تیاچـووەکان لێـی لادەدەن، کـە تـا رۆژگـاری ئەمڕۆشمان دیار وئاشکرایە.

هـەموو لێکۆڵینـەوەکان لەسـەر قۆنـاغی پـێش پێغەمبەرایـەتی محمـد (ﷺ) وئەوانەش کە ووردبوونەتـەوە لەوسـەردەمەی مێـژوو، وبـاری ئەومرۆڤایەتیـەی کـە خودا بۆ پەرستنی خۆی دروستی کردوون، ودوای گەڕانێکیش بەنێوان لاپـەڕەکانی ئەوسـەردەمە ومێـژووی شارسـتانیەتەکانی ئـەو کاتـەدا، بۆمـان دەردەکـەوێت کـە

بێباوەڕی وبتپەرستیی زاڵبووبوون بەسەر ئاینی راست وراستییە درەوشاوەکانیدا، بەشێوەیەك مرۆڤایەتی بووبوونە كۆیلە وبەندەی تەنانەت بچووکترین شتێك لەسەر زەویدا، ئەومرۆڤەی پەروەردگارەکەی کردیە جێنشین لەسەر زەویدا کە ئازادبێت وتەنها خودا بپەرستێت، ئیتر چی ماوەتەوە دوای ئەوەی کە گوێرەکە ومانگا بەپیرۆز دانران ودار وبەرد دەپەرستران.

کەسەکان وئارەزووەکان پیرۆزکران و چەندین نەتەوەی ئەوەی ئادەم لەسەر ئەم خورافات وشتە پروپوچانە دەژیان؟!

لەوێدا لە کوێرە رێکانی شاخەکانی (توهامە)ی ووشکدا، لەدۆڵێکی بێسەوزایی لە (بكـة)دا، کە لەوێشدا وەك شوێنەکانی تر تاریکییەکانی بێباوەڕی بەناخی مرۆڤەکاندا چووبووە خوارەوە، لێرەدا لووتبەرزیی وملهوڕی هەندێك لە تاکەکان گەیشبووە ئەوپەڕی، بەشێوەیەك کەسانێکیان تێدابووپێشبڕکێی لەگەڵ فیرعەون دەکرد لە سەرلێشێواویی ولەسنوور دەرچوون.

هەرلەوێدا ولەوکاتەدا تاریکییەکی نووتەك باڵی کێشابوو بەسەر دڵەکان وهۆشەکاندا بەهۆی دیارنەمانی رووناکیەکانی یەکتاپەرستی، ماناکانی بەزەیی وسۆز تیرۆر کرابوون وسەرزەوی بووبووە گورگستانێك کە پەلاماردان وتیرۆرکردن تێیدا زاڵبووبێدەسەڵاتەکان نیعمەتی ئارامیی ودڵنیاییان لەدەستدابوو، ئیتر چ خێرێك دەبینرێت لە باوەشی بتپەرستیەك کە بێباوەڕبووە بە دروستکەرەکەی وهەستاوە بەپەرستنی کەسەکان وخوداکەی لەبیرچووەتەوە، ورابەرایتیی داوەتە دەست جادوگەرە بێنرخەکان.

دونیا پێش ناردنی پێغەمبەر (ﷺ) سەرلێشێوایی وبێدەرەتانی گرتبوویەوە، بەشێوەیەك لە توانای خۆڕاگریی دڵەکاندا نەمابوو، ئیتر هیچ سەمەرە نیە کە مرۆڤایەتی لەوکاتەدا شایەنی خەشم وقینی پەروەردگارەکەیان بوون، هەروەك لە فەرموودەدا هاتووە: (پەروەردگار لەوکاتەدا سەیری خەڵکی زەوی کرد، خەشمی

له هەموویان گرت بە عەرەب وعەجەمیانەوە، تەنها چەند پاشماوەیەكی خاوەن كتێبەكان (أهل الكتاب) نەبێت [٧].

هەربۆیە هەڵبژاردنی پەروەردگار بۆ محمد (ﷺ) نیعمەتێك وبەخششێك بوو كە زۆری پێنەچوو گەورەییەكەی دەركەوت لەو تواناییانەی كە خودا پێیبەخشیبوو، لەسەر بەرنامەكەی بەردەوامبوو بەدامەزراندن وپشتیوانی لەلایەن پەروەردگارەوە.

كەمی سامان وهەتیویەكەی كە بەندەكانی (لات وعوززا) وكۆیلەكانی ئارەزووەكان وایاندەزانی نوقسانیە تێیدا، ئەمانە لەگەڵ بەرزیی بنەچەكەی هۆكارێك بوون بۆ ئەوەی لەكاتی گەورەبوونیدا باشترینی سیفەتەكانی هەموو چینەكانی مرۆڤەكانی تێدا كۆببێتەوە.

كاتێك ژیاننامەی ئەم پیاوە مەزنە دەخوێنیتەوە پێش پێغەمبەرایەتیەكەی دەگەیتە باوەڕێكی پتەوكە ئەو (ﷺ) شێوازێكی بەرزی بیركردنەوەی راست ودروست وتێڕوانینێكی قووڵ بوو كە خودا بەئاگاداری خۆی پێی گەیاندبوو، تەنانەت پێش شوانی مەڕ ودوای ئەوە وپێش بازرگانی كردن ودوای ئەوەش بە دڵێكی زیندوو وئاگادارەوە لەناو گێژاوەكانی ژیانی نەفامیدا دەژیا، كەسێكی بیرتیژ وبلیمەت بوو لەناو كۆمەڵی بێئاگا وسەرخۆشەكاندا.

بەڕاستی پەیامی محمەدی كوڕی عبدالله (ﷺ) گەورەترین بەخششی پەروەردگار بووكە دونیا ناسیبێتی بۆ رزگاربوونی ماددی و رۆحی مرۆڤەكان وژێرییان لەدەست پەرستنی غەیری خودا.

پەیامێك ئەمە سیفەتی بێت هاتووە بۆ گێڕانەوەی راستیی بۆ ئاستی بەرزی خۆی، وگێڕانەوەی مافەكان بۆ شوێنی خۆیان، مافی پەروەردگار ومافی بەندەكان.

---

٧ فەرموودەیەكی (صحیح)ە، بڕوانە: صحيح البخاري للألباني (٢٦٣٧).

مـافى پـەروەردگار بـەوەی بـە تـاك وتـەنهايى بپەرستريّت ومـافى بەنـدەكان لـە رزگاربوونيان لە كۆتى بەندايـەتى بـۆ غـەيرى دروسـتكەرەكەيان، بـەلاّم بێبـاوەڕان هەر زوو كەوتنە دژايەتى ئەم بانگەوازەى پەروەردگار دەيەويّت.

ئايا هيچ مرۆڤيّكى ژير گومان دەبات لەوەى پەياميّكى مەزنى ئاوەهـا كـە ئەمـە سيفەتى بيّت تووشى چەند كەسيّكى گومڕا نـەبيّت كـە رەتـى بكەنـەوە وكۆمـەلّيّك دلّى نەخۆش كە دژايەتى نەكەن؟!

لەگەلّ هەموو ئەو هاوسەنگييەى پيّشكەشى دەكات لە رەفتاركردن لەگەلّ هـەر ٣ پيّكهاتەكەى مرۆڤ: رۆح، وژيريى، وجەستە.

هـــەروەها لەگـــەلّ ئەوهاوســـەنگيەى پيّشكەشـــى دەكـــات لـــەنيّوان هـــەر ٥ پيّكهاتەكەى ژيانى مرۆڤەكان لە: تاك، خيّزان، كۆمـەلّگا، وولاّت، وژينگـە، ولەگـەلّ هەموو ئەو سياسەت وياسا بەرزانەى كـە دايڕشـت بـە لەبەرچـاوگرتنى پلەوپايـەى مرۆڤەكان وتواناى لاشەيى وژيرييان.

لەگەلّ هەموو ئەمانەشدا ئەم پەيامە پـيرۆزە تووشـى ناڕەحـەتى ورەتكردنـەوە بـــوو، تووشـــى ناڕەحەتيـــەكى ئيّجگـــار زۆر بـــوو لەلايـــەن ملـــهوڕان وخاوەنـــانى بەرژەوەندى وئارەزووەكان، بەلاّم هەلّگرى ئەم پەيامە مەزنە هيممـەتى بـەرزتربوو لـەوان وسـوور بـوونى لەسـەر گەيانـدنى بانگەوازەكـە گـەرمتربوو تـا ئەوكاتـەى پەروەردگار سەريخست بەسەرياندا، ئەويش لەبەرئەوەى بەلّگەنەويستە كـە حـەق وراستى هەميشە بەرزتر دەبيّت وسەردەكەويّت بەرامبەر بە پڕوپووچيەكانى باتيـلّ وناڕەوا كە هەميشە ملشۆڕ ونزم دەبيّت لەكۆتاييدا.

پەروەردگار دلّيّكى بەسۆز وبە بەزەيى پيّدا بەرامبـەر بـە ئوممەتەكـەى: ﴿قَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ (التوبـة:١٢٨) واتـە: سـويّند بـەخوا بەڕاسـتى بۆتـان هـاتووە پيّغەمبـەريّك لەخۆتان، قورس وگرانە بەلايەوە ناڕەحەتى وناخۆشـى ئيّـوە، زۆر سـوورە لەسـەر

باوەڕهێنانتان وبۆ بڕواداران زۆر دڵسۆز ومیهرەبانە، ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظّاً غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾ (آل عمران:١٥٩)، واتە: بەهۆی بەزەیی خوداوەیە تۆ بۆ ئەوان نەرم ونیان بوویت، ئەگەر تۆ بەدخووقسەڕەق ودڵڕەق بوویتایە ئەوە هەموویلاوەیان دەکرد لەدەورت، کەواتە لێیان ببورە وداوای لێبوردونیان بۆ بکە لەخوا وڕاوێژیان پێبکە لەکاروباردا، جا کاتێك بڕیارتدا ئەوپشت بەخودا ببەستە بەڕاستی خودا ئەوانەی خۆش دەوێت کە پشتی پێدەبەستن.

سووربوونی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر رزگاربوونی دوژمنەکانیشی چەند قات زیاتربوو لە سووربوونی ئەوان وشوێنکەوتووانیان بۆ لەناوبردنی، چونکە ئەم نێردراوی رەحمەتە وهەڵگری ئاڵای خۆشەویستییە، جوانترین سەلامی لەسەربێت.

محمد (ﷺ) موعجیزەی زیندوو ونەمری بۆ هێناین کە قورئانی پیرۆزە، پیاوێکی مەزنە کە پەروەردگار لەژێر چاودێریی خۆیدا دروستی کرد وگەورەی کرد، لە دووتوێی سنگیدا کتێبێکی مەزن لە سەرچاوەدا وموعجیز لە ئایەتەکانیدا هەڵگرتبوو.

ئەم قورئانە ئاگادارکەرەوە وبەڵگەیەکی زیندووە تا هاتنی رۆژی دوایی، پرسیاری لێدەکەیت وەڵامت دەداتەوە، وگفتوگۆی لەگەڵ دەکەیت قەناعەتت پێدێنێت، وشایەتە لەسەر ئەم ئوممەتە بەوەی بە تێپەڕبوونی سەردەمەکان وهاتنی نەوەکان هەمیشە نوێ دەبێتەوە.

ژیریی کەسە سەرمەشقەکانی رەوانبێژی ودروستکەرانی دەربڕین لەبەردەمیدا ملکەچبوون، بەشێوەیەك کە توانایان نەما لە هاوشانی کردنی چ جای بەربەرەکانێ لەگەڵی، گەورەیی ئەو بەرەنگارییە ونهێنی پشت بێوێنەیی قورئان لەوەدایە کە لە بەرزییەکی زۆرەوە دەڕوانێتە میللەت وکەسە بەتواناکان

ولەبوارەکـەی خۆیانـدا دەیانخاتــە سەرســوڕمان، دواتــر تـەنها ئەوەنـدەیان بـۆ دەمێنێتەوە کە بەرامبەری بڵێن: ئـەو ووتانـەی قورئـان زۆر شـیرینن، زۆر ڕۆشـنن، سـەرەتاکەی سـەوز وگـەڵادارە وکۆتاییەکـەی بـەردار وبـەپێزە (وەك یـەکێك لـە بێباوەڕانی قورەیش بەرامبەر قورئان ووتی).

تەنها ئەوەندە بەسە وەك بەڵگە بۆ ڕاستیی سەرچاوەکەی لەلایەن خوداوە کـە ئەوکەسەی هێناویەتی لەوانەنەبووکـە دەیاننووسـی ودەیانخوێنـدەوە چـونکە خـۆی نەخوێندەوار بوو ولەناو گەڵێکی نەخوێندەواریشـدا بـوو، هـەر کەسێکیش ئەمـەی زانی گـەر کـەمترین ژیریـی وشـوێنەواری لێکدانـەوە وزەڕڕەیـەك هەسـتی تێـدابێت چاری نامێنێت تەنها دانانان نەبێت بەم ڕاستییەدا.

نەخوێنـدەواریی خـاوەن پەیامەکــە گــەورەترین بەڵگــەبوو لەبەرامبــەر ئــەو درۆزانانەی کە کاریان درۆ هەڵبەستن بوو بەرامبـەری یـان ئەوانـەی دەیـانوێرا ئـەو بوهتانە دروستبکەن کە محمدی کوڕی عبدالله (ﷺ) ئەم قورئانەی بەدەستی خۆی نوسیوە وخۆی دایناوە: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُومِن قَبْلِـهِ مِـن كِتَـابٍ وَلَـا تَخُطُّـهُ بِيَمِينِـكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ﴾ (عنکبوت:٤٨) واتە :تۆ ئـەی محمـد (ﷺ) پـێش ئـەم قورئانـە هـیچ کتێبێکـت نەدەخوێنـدەوە (واتــە نەخوێنـدەوار بوویـت) وبەدەسـتی ڕاسـتت نەتنوسیووە، ئەگەر وابووایە ئەوکاتە ناڕاستەکان (بێبڕوایان) دەکەوتنە گومانەوە.

ئـەوەتا لەمڕۆشـدا کـە سـەردەمی زانسـتە، گەنجینـەکانی قورئـان بـەردەوام دەردەکەون... چەند ڕاستییەکی زانستین کـە ئایەتـە ڕۆشـنەکان باسـیان کـردووە بـەبێ هـیچ ملبادانێـك یـان زۆرلێکردنێـك لـە ماناکانیـان، بـەڵکو یەکگرتنەوەیـەکی ئاشکرایە کە دوورە لە ناچوونیەکی، وبێکەلێن وکەلەبەرە.

ئەمە پەیامە نەمرەکەیە، وئەوەش قورئانی زیندووە، کە لـەمڕۆدا بـەزمانی ئـەم سەردەمە کە زانستە گفتوگۆمان لەگەڵ دەکات، زانستیش شایەتێکی بـاوەڕپێکراو وبەڵگەیەکی سەلمێنراوە: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ فَيُضِـلُّ

اللّـهُ مَـن يَشَـاءُ وَيَهْـدِي مَـن يَشَـاءُ وَهُـوالْعَزِيزُ الْحَكِـيمُ﴾ (إبـراهيم:٤) واتـه: وەهـيچ پێغەمبەرێکمان رەوانە نەکردووە بەزمانی گەلەکەی خۆی (سەردەمی خۆی) نەبێت بۆ ئەوەی ئایینەکەیان بۆ روونبکاتەوە، ئەوسا خـودا هـەر کەسـی بوێـت گـومڕای دەکات (بەهۆی سەرکەشی خۆیەوە) وهەر کەسێکیشـی بوێـت ڕێنمـوویی دەکـات، هەرئەویش زاڵ وبەدەسەلاتی کاردروستە.

بەزمانی ئەو کەسە قسەمان لەگـەڵ دەکـات کـە خـەڵکی لـەمڕۆدا لـە ووتـەکانی تێدەگەن، بانگەوازیان دەکات بۆلای پەیامەکەی بەزمانێك کـە لـە وردەکارییـەکانی تێدەگەن، بەڕاستی قورئانێکی مەزنە.

هەربۆیە لـەم کتێبـەدا سـوور بـووین لەسـەر ڕۆیشـتن لەسـەر ئـەم بەرنامەیـەی قورئانی پـیرۆز، وگفتوگۆکردن لەگـەڵ خـەڵکی بـەزمانی ڕۆژگارەکـەیان، هەربۆیـە کۆتـایی بەشـەکانی ئـەم کتێبـەمان تـەرخانکرد بـۆ روونکردنـەوەی ١٠٠ راسـتیی زانستی گەردونیی ئەم سەردەمە، کە لە سەردەمی زانستدا شایەتی دەدەن محمـد (ﷺ) نێردراوی خودایە.

لـەکۆتایی ئـەم پێشەکییەشـدا فـەرموون ئێـوە و شـایەتی کەسـایەتییەکی بـە وویژدانی ئەم سەردەمە دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ) کە پرۆفیسۆر (مایکڵ هارت)ە[8] ئەویش لە سەرەتای کتێبەکەی (١٠٠ کەسە مەزنەکەی مێژوو) کە دەڵێت:

{هەڵبژاردنی من بۆ محمد بۆ ئەوەی یەکەم بێت لەنێوان گەورەترین وگـرنگترین پیاوانی مێژوولەوانەیە ببێتە مایەی سەرسوڕمانی خوێنەران، بەلام ئەو تەنها پیاوە لە هەموو مێژوودا کە لەسەر هەردوو ئاستی دینی ودونیایی گەرەترین سـەرکەوتنی بەدەست هێنا، زۆر پێغەمبەر ونێردراو وکەسانی دانا هەبوون کـە پـەیامی مـەزنیان دەستپێکرد، بەلام هەموویان مردن پێش ئەوەی تەواوی بکەن، هەروەك مەسیح لە ئاینی گاوردا.

---

٨ لە گەورەترین زانایانی سەردەمی نوێی ولە شارەزایانی دەزگای فەزایی (ناسا) بوو.

یان ئەوەبووکە خەڵکی تر بەشداری لەگەڵدا کردن یان پێشدەستیان کرد وپێش ئەوان پێی گەیشتن، هەروەك موسی لە ئاینی جوولەکەدا، بەڵام محمد تەنها کەس بووکە پەیامە ئایینیەکەی تەواوکرد، کە بنەماکانی دامەزرا ودیاریکران، چەندین میللەتیش بەتەواوی باوەڕیان پێهێنا هەر لە ژیانی خۆیدا، هەروەها لەبەر ئەوەش کە لەپاڵ ئاینەکەدا دەوڵەتێکی نوێشی دامەزراند، کە تەنانەت لەم بوارە دونیاییەشدا هەستا بە یەکخستنی تیرەکان لەناو یەك گەلدا، وگەلەکانیش لەناو یەك ئوممەتدا، هەروەها هەموو بنەماکانی ژیانیشی بۆ دامەزراندن وکاروبارەکانی دونیاشی بۆ نەخشاندن، وخستنیە سەر ڕێڕەوی دەرچوون وگەیشتن بە هەمووجیهان، کە ئەمەش هەر لە ژیانی خۆیدابوو، کەواتە هەر ئەو بوو کە پەیامی ئاینی ودونیایی دەستپێکرد وهەر ئەویش تەواوی کردن وبەئەنجامی گەیاندن}.

لێرەدا نزیکەی ١٠٠ بەڵگە ونموونەی زانستی نوێ دەخەمە بەردەستی خوێنەری بەڕێز، کە هەموویان پێکەوە راستیی ئەم پەیام وبانگەوازە دووپاتدەکەنەوە، وهاوار دەکەن کە ئیسلام بەرنامەی پەروەردگارە، وقورئانی پیرۆز ووتەی دەرئاسای پەروەردگارە کە ناڕەوای تێکەڵ نابێت، کە بۆ هیدایەتی مرۆڤەکان بۆ ڕێگای راست تا رۆژی دوایی نێردراوە.

ئەم بەڵگانە جۆراوجۆرن، هەندێکیان لە ئایەتەکانی خوادان لە نەفسی مرۆڤدا وهەندێکیان ئایەتەکانن لە ئاسۆکاندا وچەندین بابەتی زانستی لەخۆدەگرن لە زانستەکانی پزیشکیی وزیندەوەرزانی وزەویناسیی ودەریاناسیی وگەردوونزانی وچەندینی تریش، هەمووشیان بەشێوەیەك خراونەتەروو کە هاوئاهەنگی مانای دەقەکانی قورئان وسوننەت وراستییە زانستییەکان بەروونی ئاشکرا کراون، سەرەنجام ئیعجازی زانستیی دەقەکان وحیکمەتە تەشریعییەکانی دەقەکانیش روونکراونەتەوە.

# زانستی پزیشکی وزیندەوەرزانی

## باوەڕهێنان و پەرستشەکان سروشتی مرۆڤن ومایەی چارەسەرن:

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفاً فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (الروم: ٣٠) واتە: کەواتە رووی خۆت رێك بکەرە ئاینی ئیسلام وپاك وڕاست بۆ خوا (شوێن ئاینی یەکتاپەرستی بکەوە)، ئەو ئاینەی کە خوای گەورە فیترەت وسروشتی پاکی مرۆڤی لەسەر دروست کردووە، ئاین ودروستکراوەکانی خودا هیچ جۆر گۆڕانکارییان بۆ نییە، هەرئەوە ئایینی رێك وڕاستە بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللّهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ، الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ طُوبَى لَهُمْ وَحُسْنُ مَآبٍ﴾ (الرعد: ٢٨-٢٩) واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە ودڵیان ئارام دەبێت بەیادی خودا، ئاگاداربن هەر بەیادی خودا دڵەکان ئارامیی وەردەگرن، ئەوانەی بڕوایان هێناوە وکردەوەی چاکیان کردووە خۆشبەختیی وکامەرانیی بۆ ئەوانە لەگەڵ سەرەنجامی چاك.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِمُعْرِضُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ﴾ (المؤمنون: ١-٥) واتە: بەڕاستی بڕواداران رزگاردەبن وسەردەکەون، ئەو کەسانەی کە لە نوێژەکانیاندا لەخواترس وگەردن کەچن، وئەوانەی لەشتی بێهودە خۆیان بەدوور دەگرن، وئەوانەی کە زەکات دەردەکەن، وئەوانەی کە پارێزەری داوێنیانن.

### واتای شەرعی:

ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە دەروونی مرۆڤ گۆشکراوە لەسەر باوەڕهێنان وپەرستش وشتێکی خۆڕسکە تێیدا، هەروەها کردارە چاکەکان دەبنە مایەی چارەسەر وچاکبوونی دەروونی مرۆڤەکان.

## راستییە زانستییەکان:

قوڵبوونەوە لە پەرستنەکاندا لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا چووەتە بواری لێکۆڵینەوە زانستییەکانەوە، لە توێژینەوە زانستییەکاندا باوەڕهێنان بە پەروەردگار تەنها وەك فەلسەفە و بۆچوونێکی تاکەکەسی سەیر ناکرێت وەك پێشتر وا سەیردەکرا، بەڵکودۆزینەوە زانستییە نوێیەکان لەم دواییانەدا دەریانخستووە کە باوەڕهێنان بە پەروەردگار خوویەکی خۆڕسکە لە مرۆڤدا، وغەریزەیەکە پێویستی بەتێرکردن هەیە وەك خواردن وخواردنەوە، هەروەها ئەنجامدانی پەرستنەکان بەملکەچیەوە چارەسەرە بۆ تێکچوون وشڵەژانی دەروونی مرۆڤەکان.

پوختەی ئەو توێژینەوانەی ئەنجامدراون لەسەر مێشك بە بەکارهێنانی تەکنەلۆجیایەکی پێشکەوتووی وێنەگرتنی تیشکیی مێشك کە لە نیسانی (٢٠٠١)دا بڵاوکرایەوە وتیمێکی زانستی پێیهەستان بە سەرۆکایەتی پرۆفیسۆر (ئەندرو نیوبێرگ Andrew Newberg) کە پرۆفیسۆری زانستی تیشکە (Radiology) لە کۆلیژی پزیشکی زانکۆی پەنسلڤانیا لە فیلادلفیای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەوەی دەرخست کە باوەڕهێنان بەخودا وبوونی هێزێکی باڵادەست دیزاینێکی خۆڕسکە (Built-in Design) لە مێشکی مرۆڤدا، کە هیچ کەسێك ناتوانێت بیسڕێتەوە تەنها بە دوورکەوتنەوە نەبێت لە فیترەتی راستی خۆی، وبە پەکخستنی ئەو توانا مەزنە زۆر ئاڵۆز وپێشکەوتووانە نەبێت کە توانای خوێندنەوە وپێشبینی کردن ولێکدانەوەی لۆجیکی وبیرکردنەوەی بەرهەمداری پێدەبەخشن، ئەم دیزاینە خۆڕسکە بەردەوام هانی مرۆڤ دەدات وپاڵی پێوەناوە بەرەو دینداری بەدرێژایی مێژوو.

هەر بەپێی ئەوەی پرۆفیسۆر (نیوبێرگ) رایگەیاند دینداری هەرچەندە شێوازەکانی جۆراوجۆربن دەرخەری ئەو باوەڕە خۆڕسکە جێگیر کراوەیە لە

مێشکی مرۆڤدا کە دەتوانین بەپشت بەستن بەوەی توێژینەوەکان سەلماندوویانە بەوە وەسفی بکەین کە بەشێوەیەکی خۆڕسك ئامادەکراوە وڕێوشوێنی دینداری تێدا جێگیر کراوە (Hard-wired for Religion).

توێژینەوە زانستییەکان ئەوەمان بۆ ڕووندەکەنەوە کە چۆن پەروەردگار مرۆڤی ئامادە کردووە بۆ ئەوەی بیناسێت، هەروەها فێرمان دەکەن کە دینداریی پێویستییەکی سروشتی مرۆڤە بەهاوشێوەی خواردن وخواردنەوە، بەهۆی ئەمەشەوە تەواو دڵنیادەبین لە بوون ودەسەڵاتی گەورەی خودا، ئەی ئیتر سوودی ئەم توانایانە چیە کە دراون بە مرۆڤ ولە گیاندارەکانی تری جیاکردۆتەوە؟!

مرۆڤ ئەگەر لەگەڵ پەرستنەکاندا ملکەچیی وتێڕامان بنوێنێت ئەو کاتە پەرستنەکان دەبنە خاوەنی کاریگەرییەکی چالاکی بەسوود بۆ لەش ودەروون کە دەتوانرێت کاریگەرییەکەی لە تاقیگەکاندا بپێورێت، هەر لەم بۆچوونەوە (نیوبێرگ) دەڵێت: لێکۆڵینەوە دەروونیە ئاینییەکان ئەوەیان دۆزیەوە کە ئاین زۆر دەوڵەمەندە بە بەرزترین شێوازە زانستییەکانی گەیشتن بە هاوسەنگی دەروونی.

هەروەها پرۆفیسۆر (لۆرەنس میکینی) بەرپرسی دەزگای ئەمریکی بۆ چارەسەری تێکچوونە دەروونیەکان دەڵێت: ئەنجامدانی تێڕامانی قووڵ کە شێوازێکە لە شێوازەکانی خوشوع وملکەچی، خۆی لەخۆیدا یارمەتیدەرە بۆ زاڵبوون بەسەر هەستکردن بە ئازارە دەروونیەکان وداڕووخان، وەهەروەها دەبێتە هۆی گێڕانەوەی هاوسەنگی بۆ دابەشکردنی چالاکیەکان لە سەنتەرەکانی مێشکدا، ودەبێتە خاڵی کردنەوەی هەستکردنەکان بە خەمباری وئازار ونەمانی هیوا، تەنانەت لای غەیری باوەڕدارەکانیش.

توێژینەوە دەروونییە ئاینییەکان لە شەستەکانی سەدەی ڕابوردووەوە دەستیان پێکرد، لە ساڵی (١٩٨٠)دا میکینی ویاریدەدەرەکانی زاراوەی لێکۆڵینەوە دەروونیە ئاینییەکانیان (Neuro-theology) بەکارهێنا بۆ

ئەولێکۆڵینەوانە، لە ساڵی (١٩٩٤)یشدا هەمان ناوی لە کتێبەکەی لەو بوارەدا نا، ئەم زانستە پشتگیری تەواوی ئەو راستییە بنەڕەتییەی ئاین دەکات کە ئەویش باوەڕهێنانە بەخودا، (میکینی) دەڵێت: هەر ئەوەندە بەسە کە ئێمە چەند رێگەیەکی زانستیمان دۆزیوەتەوە بۆ پێوانی چالاکییە فیکرییەکان، باوەڕهێنان بەخودا وهەستە ئاینییەکان لەکاتی پەرستنەکاندا وەك چالاکییەکی فیکری نەپێوراو ونەسەلماو نەماونەتەوە بەڵکو بەووردی دەپێورێن لەرێی تەکنەلۆجیا نوێکانی وەك وێنەگرتن بە بەکارهێنانی وێنەی تیشکی لەرەی موگناتیسی (MRI-Magnetic Resonance Imaging) کە بەکردار ئەنجامەکانی (نیوبێرگ)یان سەلماند.

پرۆفیسۆر (بلیترینی) لە زانکۆی (بیزا) لە (ئیتاڵیا) دەڵێت: هەموو شتێك کە ئێمە دەیکەین یان هەستی پێدەکەین لە چالاکیەکی سادەوە وەك جووڵاندنی پەنجەیەك تا قووڵترین هەڵچوونە سۆزییە شارراوەکان لە دەروونداە یان دیارەکانی وەك توورەبوون وخۆشەویستی، دەبنە هۆی نەخشاندنی نەخشەیەکی دیار وئاشکرای ئەو سەنتەرانەی کاریان تێدەکرێت لەمێشکدا، لەگەڵ هەموو هەستێکدا شێوازێکی دیاریکراوی چالاکی روودەدات کە دەتوانرێت بپێورێت وتۆماربکرێت بەتەواوەتی وەك هەر شیکارێکی پزیشکی ئۆرگانیی تر.

ئەم بوارە نوێیەی ناسینەوە وئاشکرا کردنی شارراوەکانی مرۆڤ لە هەستەکان وسۆز وبیرەکان وراددەی کاریگەر بوونیان بە بیروباوەڕە ئاینییەکان لەراستیدا بوارێکی تەواو کارتێکەر وجادووگەرانەیە، کە لەمڕۆدا توێژەران بە ئاگادارییەکی زۆرەوە دەچنە ئەم بوارەوە ئەویش لەبەر سووربوونیان لە بەکارهێنانی پرۆگرامی زانستییانە لەکاتی توێژینەوە وشیکارکردنی بابەتەکان وەك هەمووبوارەکانی تری زانستە تاقیگەییەکان.

هــەروەها دکتــۆر (مــایکڵ مــاکلۆف) لــە زانکــۆی (دالاس) لــە ویلایەتــە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەڵێت: وویژدانی دەروونی ورۆحی مـرۆڤ کاریگـەر دەبێـت بە جیهانی دەرەوە وکاریش دەکاتەسەر ئۆرگـان وجەسـتەی مـرۆڤ، کـە بیروبـاوەڕ وپەرسـتنەکان پـارێزەرن لەبەرامبـەر ئەوکارتێکـەرە سروشـتیانە، توێژینـەوەکان لەمبارەیەوە ئەوەیان دەرخستووە کە سروشتی مرۆڤ بەشێوەیەك دیزاین کراوە کە پەرســـتنەکان ببنـــە مایـــەی پاراســـتنی لـــە تێکچـــوونەکان وبەهاوســـەنگی تەواودەیهێڵنەوە، لە کۆ توێژینەوەیەکی شیکارییدا کـە ٤٢ لێکۆڵینـەوەی مەیـدانی فراوانی گرتەوە پرۆفیسۆر (ماکلۆف) بینی کە ڕێـژەی مردنـەکان کـەمتر دەبێتـەوە بەرۆچوونی مرۆڤ لە نوێـژەکان وپەرستنەکاندا، کـە ئـەم کاریگەرییـە سـەربەخۆیە بەرامبەر چەند کارتێکەرێکی تری زیانبەخش بە تەندروستی وەك مەی خواردنـەوە وجگەرەکێشان. **بڕوانە وێنەی لاپەڕە (٣٧٤)**

پرۆفیسۆر (نیوبێرگ) ئەوەی لەیاد نەچووکە بەرامبەر بەم ئاکامانە بڵێت: ئێمـە تائێســتا نــازانین بەدڵنیاییــەوە کــە چــۆن باوەڕهێنــانی قــووڵ وڕۆچــوون لــە پەرستنەکاندا دەبێتە مایەی پاراستن وسەلامەتی جەستە ودەروون وقەلاچـۆکردنی نەخۆشــی وپەکخســتنی خێرابــوونی میکانیزمــە جەســتەییەکانی مــردن، بــەلام زانیارییــەکانمان دەربــارەی میکانیزمــەکانی ناولــەش، بەتایبــەتی مێشــك، وامــان لێدەکات کە بەرەو ئاسۆیەکی نوێی توێژینەوە بڕۆین بـە مەبەسـتی ئـەوەی ڕۆژێـك لەرۆژان بوونی کاریگەریی جەستەیی بیروباوەڕ وپەرستنەکان بسەلمێنین.

تا ئەمڕۆ ئەمانەمان لێزانیوە: کەمبوونەوەی ژمارەی لێدانـەکانی دڵ ودابـەزینی پەستانی خوێن وگۆڕانکاریی جۆری وڕێژەیی لـە هۆرمۆنەکانـدا وبـوونی پاڵنـەرێکی دەماریی بۆ گەیشتن بە حاڵەتێکی ئارامی دەروونی لە ئەنجامی ملکەچی وڕۆچـوون لــە پەرســتندا، کــە لەوانەیــە ئــەم کارتێکەرانــە وغــەیری ئەمانــەش ببنــە هــۆی چالاککردنی کۆئەندامی بەرگری لەلەشدا.

## لایەنی ئیعجازیی:

بەکورتی دۆزینەوە زانستییەکان دەڵێن: یان ئەوەتا تووشی بڵندیی وبەدەست هێنانی بەختەوەریی وچێژی راستەقینە دەبیت لە پەرستنەکاندا یان تووشی دەردەسەریی ودۆزەخ، کە ئەگەر لێوڵەرەوان لەم بوارە نوێیەی توێژینەوەدا تێبڕوانن دەبینن کە ئەوەی ئەوان پێی گەیشتوون تەنها بەشێکی کەمی گەنجینەکانی قورئانی پیرۆزە لەبەرئەوەی کتێبی کۆکەرەوەی ئامۆژگارییە رەسەنەکانی پێغەمبەرانی پێشینە، وتەنها کتێبی هەڵگری شەریعەت ودەستوورێکی جیهانی نانەتەوەییە کە لەگەڵ سروست وفیترەتی خۆڕسکی رێك ورەواندا یەکدەگرێتەوە، تەنها ئەوەندە بەسە روونی بکەینەوە کە: ملکەچی و رۆچوون لە عیبادەتدا کلیلی بەختەوەرییە.

﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾ (المؤمنون:١-٢)، واتە: بەڕاستی بڕواداران رزگاردەبن وسەردەکەون، ئەو کەسانەی کە لە نوێژەکانیاندا لەخواترس وگەردن کەچن، ﴿الَّذِينَ آمَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللّهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ (الرعد:٢٨) واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە ودڵیان ئارام دەبێت بەیادی خودا، ئاگاداربن هەر بەیادی خودا دڵەکان ئارامیی وەردەگرن.

لەم دواییانەشدا چەندین کتێب ووتوێژینەوەی تر بڵاوکرانەوە کە دووپاتی دەکەنەوە: باوەڕبوون بەخودا لەناو دەروونی مرۆڤدا چێنراوە وبەکارهێنانی ئەم باوەڕە رێگای لەشساغی وبەختەوەرییە، وەك کتێبەکانی: باوەڕ بەخودا بەپتەوی لە جینەکانماندا چێنراوە، نووسینی: دین هامەر، کتێبی: خودا، باوەڕ وتەندروستی، نووسینی: جیف لیڤن ولاری دۆسی، وکتێبی: باوەڕبوون تەندروستی وبەختەوەرییە، نووسینی: ئەندرو بریمان. **بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە (٣٧٤)**

لێرەوە ڕوویەکی تری ڕووەکانی ئیعجازی زانستی لە کتێبی پەروەردگارمان بۆ دەرکەوت، کە راستییە زانستییە نوێکان دەیسەلمێنن باوەڕهێنان خۆڕسکە

لەناخی مرۆڤدا، کە لەوانەیە لەکاتی ئاساییدا بشاردرێتەوە بەڵام لەکاتی تەنگانەدا بەتایبەتی ئەم باوەڕە دەردەکەوێت لە پاڕانەوە وداواکاریی مرۆڤەکە لە پەروەردگارەکەی بەتەنها، هەروەها بۆ زۆر کێشەی دەروونی وجەستەیی چارەسەر وشیفای بێوێنەی تێدایە.









**زیاتر لە ٨٥٪ی دانیشتوانی زەوی (واتە نزیکەی ٦ ملیار کەس) باوەڕیان بەهێزێکی سەروو مرۆڤەکان هەیە کە دروستکەر وراگری هاوسەنگیی ژیانە. ئەمە ونوێترین توێژینەوە زانستییەکان ئەوبۆچوونەیان بەهێزکرد کە بیروباوەڕ سروشتێکە لەناخی مرۆڤەکاندا**

# هەنگ

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتاً وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ (٦٨) ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاء لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٦٩)﴾ (النحل) واتە: وە پەروەردگارت سرووش (ئیلهامی) کرد بۆ هەنگ کە لە چیاکاندا خانوو بۆ خۆت سازبدە ولە کونی دار ودرەختەکان ولەو شوێنانەی کە خەڵکی بۆی دروستدەکەن، پاشان لە هەموو بەر وبوومێك بخۆ، ئەوسا ئەو رێگایانەی پەروەردگارت بگرەبەر بەملکەچی، لە سکی ئەو هەنگانەوە دێتەدەر خواردنەوەیەك (شلەیەك) کە ڕەنگەکانی جیاوازە، کە شیفای تێدایە بۆ خەڵکی، بێگومان لەوەدا نیشانەی گەورە هەیە بۆ کەسانێك کە بیربکەنەوە.

قورئانی پیرۆز لە چەند ووشەیەکدا ژیاننامەی هەنگ باسدەکات:

هەنگ بەسروشتێکی خودای کاربەجێ ودانا لەشاخەکان خانووی بۆ خۆی دروستکردووە ولەوێوە خواربۆتەوە بۆ درەختەکان، وپاشان خانەکانی شانەکەی بەو شێوەیە دروستدەکات کە ئەمڕۆ دەیزانین.

لێکۆڵینەوە زانستییە وورد وفراوانەکانی جیهانی هەنگ ئەوەی بۆ دەرخستووین کە ئیلهامی خودایی بۆ هەنگ وای لێدەکات کە بفڕێت بۆ گەڕان بەدوای خۆراکدا، ومـاوەی هـەزاران مـەتر لـە شـانەکەی خـۆی دوور بکەوێتـەوە وپاشان بۆی بگەڕێتەوە بەبێئەوەی لێی هەڵەببێت وبچێت بۆ شانەیەکی تر، لەگەڵ ئەوەشدا کە شانەکانی هەنگ هەموویان لەیەکدەچن ولە تەنیشتی یەکەوە ریزکراون لەکێڵگەکانی هەنگ بەخێوکردندا بەتایبەتی.

ئەمەش لەبەرئەوەیە کە پەروەردگار رێگاکەی بۆ ئاسانکردووە وتواناکانی خۆ گونجاندنی پیشەیی وهەڵس وکەوتی داوە بەهەنگ، کە ئەمانە یارمەتیدەری بن بۆ

بەرچاورِوونی لە گەشتەکانیدا کە بۆ دۆزینەوەی خۆراك وکۆکردنەوەی وگێرِانەوەی بۆ شانەکەی ئەنجامیان دەدات. **برِوانە وێنە رەنگاورِەنگەکانی لا پەرِە (٣٧٥)**

## راستییە زانستییەکان:

شانەی هەنگ کە بریتیە لەوکۆلۆنیەی هەنك تێیدا دەژی تەنها یەك شاژنی تێدایە، کە هەلَدەستێت بەدانانی گەرای سەدان نێرینە ودەیان هەزار لە هەنگە کارکەرەکان کە مێینەن، کارکەرەکان دەفرِن بەدوای خۆراکدا، کاتێکیش دەیدۆزنەوە شوێنەکەی دیاری دەکەن ولەگەلّ خۆیاندا نموونەیەکی دەبەنەوە بۆ شانەکەیان، وهەلّدەستن بە گەیاندنی زانیارییەکان بۆ ئەندامانی تری تیمەکە ئەویش بەهۆی ئەنجامدانی هەندێك جوولّەی تایبەت کە بەهۆیەوە شوێن وریِّرِەوی خۆراکەکەیان بۆ روون‌دەکەنەوە.

کارکەرەکانی تریش راستەوخۆ بۆی دەچن وهەلّدەستن بە کۆکردنەوەی خۆراکەکە، هەر هەنگێك بۆئەوەی تەنها ١٠٠گرام لە هەنگوین دروستبکات پێویستی بەوەیە کە سەردانی ١ملیۆن گولّ بکات.



پاشان تیمێکی تری کارکەرەکان هەڵدەستن بە هەواگۆڕکێی شانەکەیان بەهۆی خستنەکاری باڵەکانیانەوە بەمەبەستی دەرچوونی شێ لە شانەکە وخەستبوونەوەی ئەوشیلەیە کە دوایی دەبێتە هەنگوین، پاشان تیمێکی تری هەنگەکان پاش ئەوەی کە دڵنیادەبێت لەوەی هەنگوینەکە پێگەیوە هەڵدەستن بەداخستنی خانە شەش پاڵووەکان بە توێژاڵێکی تەنك لە مۆم بۆئەوەی بەتازەیی بمێنێتەوە بۆ کاتی زستان کە پێویستیان پێی دەبێت کاتێك کێڵگەکان لە گوڵ خاڵی دەبنەوە.

ئەوەش سەلماوە کە جیاوازی پێکهاتەی خاك وکێڵگەکان کە هەنگ خۆراکی لێکۆدەکاتەوە کاریگەرییەکی گەورەی دەبێت لەسەر رەنگی هەنگوینەکە، بۆ نموونە ئەوهەنگوینەی لە شیلەی گوڵەکانی لۆکەوە دروستدەکرێت رەنگەکەی تۆخە، بەپێچەوانەی هەنگوینی گوڵەکانی وێنجە کە رەنگەکەی کراوە دەبێت، وهەنگوینی گوڵەکانی دارسێوکە رەنگی زەردێکی کاڵ دەبێت، وهەنگوینی تووی رەش کە رەنگەکەی ئاویی دەبێت، وهەنگوینی گوڵەکانی نەعنا کە بۆنخۆش ورەنگی زەردی عەنبەری دەبێت، وهی تریش ... **بڕوانە وێنەی لاپەڕە ( ٣٧٦ )**





لـە گەشـتی دۆزینــەوە وكۆكردنـەوەی خۆراكـدا كاركـەرەكان پشـت دەبەسـتن بەوهەستانەی پەروەردگار پێیداون بەتایبەتی هەستێكی بـۆنكردنی بـەهێز بـەهۆی هەردووشاخە هەستەوەرەكەی سەریەوە، هەروەها چـاوەكانی جیـاوازە لـە چـاوی مرۆڤ بەوەی هەسـت بـە تیشـكی سەروووەنەوشـەیی دەكـات هەربۆیـە ئەوشـتانێك دەبینێت كە چاوەكانی ئێمە نایبینن وتـەنها بـە وێنـەگرتنی بـەكامێراكانی تیشـكی سەروووەنەوشەیی هەستی پێدەكەین.

هەركاتێكیش دەنیشێتەوە لەسـەر گـولێكی كـراوە دەتوانێـت تـامی شـیلەكەی بكات وبەسروشتی خۆی رادەی شیرینیەكەی دیاری دەكـات، هـەروەها لەگەشـتی گەڕانەوەیدا هەنگەكان بەهۆی هەردووهەستی بینین وبۆنكردنەوە شانەكەی خۆیان دەدۆزنـەوە وبـەهۆی بۆنكردنـەوە بـۆنی تایبـەتی جیاكـەرەوەی شـانەكەی خـۆی دەناسـێتەوە، هــەروەها هەســتی بیــنین یارمــەتی دەدات لەناســینەوەی شوێنەوارەكانی گەشتی دۆزینەوەكەی.

چونكە تێبینی كراوە كە هەنگەكان كاتێـك لـە شـانەكەیان دەردەچـن ئـاوڕێكی بەلادا دەدەنەوە ولەبەردەمیدا ماوەیەك یان دەوەستن یان دەسوڕێنەوە بەدەوریدا هەروەك ئەوەی بیەوێت جـوان بیپشـكنێت وتێیبڕوانێـت تاوەكوشـوێنەوارەكەی لـە یادەوەریەكەیدا بچەسپێت، پاشان وردە وردە بەشێوەیەكی بازنـەیی بەدەوریـدا دەفڕێت تا دوور دەكەوێتەوە، كاتێكیش دەگەڕێتەوە شانەكەی هەمووتێرەكەی لە وردەكارییەكانی گەشتەكەی ئاگادار دەكاتەوە، ورێنمـایی هاوەڵـەكانی دەكـات بـۆ شوێنی خۆراكەكـە، ئـەوانیش بـەدوای یەكـدا دەردەچـن بـۆ كۆكردنـەوەی شـیلەی گوڵـەكان وزۆری لێدێننـەوە بـۆ هـەڵگرتنی بـۆ كـاتی زسـتان كـە تایبەتمەنـدە بـە سەرمای زۆر وخۆراكی كەم.

لەوانەیە سەیرترین شتێك كە زانستی نوێ دۆزیویێتیەوە لە مێرووزانیدا ئەوەبێت كە هەنگ زمانێكی تایبەت بەخۆی هەیە كە بەهۆیـەوە لەیـەكتری تێدەگـەن لـەرێی

سەماکردنەوە کە زانایەکی ئەڵمانی شیکاری ئەم بابەتەی کرد لە کتێبێکیدا بەناوی (ژیانی سەماکەرانەی هەنگ) ئەویش دوای چەندین لێکۆڵینەوە کە زیاتر لە ساڵێکی خایاند وبەهۆیەوە خەڵاتی (نۆبڵ)ی ساڵی (١٩٧٣)ی بەدەستهێنا، ئەم زانایە بۆی دەرکەوت کە لە لەشی هەنگە کارکەرەکاندا چەندین ئامێری تێدایە کە بەهۆیەوە دەتوانێت پێوانی دووری وماوە وگۆشەکانی نێوان دیسکی خۆر وشانەکەی بکات، هەروەها زمانێکی نهێنی بۆ ئاخاوتن بەکاردەهێنێت لەرێی چەند سەمایەکی تایبەتی مانادار کە بەهۆیەوە خوشکەکانی ئاگادار دەکاتەوە لەبوونی شیلەی شیرین، کە شوێنەکەی زۆر بەووردی بۆیان دیاری دەکات لەرێی دیاریکردنی گۆشەی ئاراستەکەی ودووری لە شانەکەیانەوە.






ووتەی پەروەردگار: ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ﴾ (الوحي): بریتییە لە ئیلهام کردن وهیدایەتدان، لەراستیشدا دەبینین کە هەڵس وکەوتی هەنگ وچۆنێتی هەڵبژاردنی شوێنی شانەکەی وچۆنێتی رێنموویی کردنی بۆ شوێنی خۆراك ودروستکردنی هەنگوین هەمووی بەپشت بەستن بە هیدایەت وئیلهامی پەروەردگار دەبێت، دەبینین کارکەرەکان بریتین لە کارمەندی پاککەرەوەی شانەکە بەوپەری چالاکی وگورج وگۆڵی، هەروەها بەخێوکەری هەنگە بچکۆلەکانن وشەونخونی

دەكــەن بــۆ ئیســراحەت وســەلامەتیان، هــەروەها ئەنــدازیارێكی بلیمــەتن لــە نەخشــەدانان وبیناكردنــدا كــە پــێش شــارەزاترین ئەنــدازیاری ئــەمڕۆ وئــامێرە ووردەكانی سەردەم بۆ پێوانەیان داوەتــەوە، هــەروەها پاســەوانێكی ئەمینــە كــە ئامادەیە خۆی بــەخت بكــات بــەبێ ســاردی ودوودڵــی بەرامبــەر هــەر دوژمنێــك كــە ئاسایشی شانەكەی بخاتە مەترسیەوە.

(ابــن عاشــور) لــە تەفســیرەكەیدا دەڵێــت: لێــرەدا وەحــی بــۆ ئەوبنیاتنانــە شــارراوەیە بــەكارهاتووە كــە پــەروەردگار لــە سروشــتی هەنگــدا داینــاوە، كــە دەبێتــەهۆی بەگەڕخســتنی بــۆ ئەنجامــدانی كــارێكی رێكخــراو ومورەتتــەب، وشوبهاندوویەتی بە ئیلهام وهاندان بەووتەیەكی نزم وشارراوە.

هەندێك لە لێكۆڵەرەوان لەوانەیە ئەوە بكاتە بەڵگە كە (یاء)ی ئاخاوتنی مێینــە لەم ئایەتانەدا بەكارهاتووە: ﴿اتَّخِذِي، كُلِي، فَاسْلُكِي﴾ ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی زانستی نوێ سەلماندوویەتی لەوەی كە كاری ناوشانەی هەنگ تەنها مێینەی هەنگ پێی هەڵدەستێت (كــە كاركــەرەكانن)، ئەمــەش پێویســتە لەبەردەمیــدا بوەســتین چونكە لەرووی زمانەوانیەوە ئەو (یاء)ە بریتیــە لــە ئــامرای ئاخــاوتنی رەگــەزەكان وهەردوو مێینە ونێرینەش دەگرێتەوە، هاوشێوەی ئەمــەش ووتــەی پــەروەردگارە: ﴿يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ﴾ (سبأ) واتە: ئەی چیا وباڵندەكان لەگــەڵ داوود زیكــر وتەسبیحاتی خودا بكەن، هەروەها ووتەی پێغەمبەر (ﷺ): ﴿يا خيل الله اركبي﴾ لەگەڵ ئەمەشدا دان بەو راســتییە زانستیەشــدا دەنــێین كــە ئــەوەی كاردەكــات لــە شــانەی هەنگــدا تــەنها كاركــەرە مێینــەكانن، نێرینــەكانیش كارەكــەیان تــەنها ئەوەندەیە كە پێشــبڕكێ دەكــەن لــە پیتانــدنی شــاژن لــە وەرزی زاووزێــدا، كــاری شاژنیش تەنها دانانی گەرای هەنگە.

كاركەرەكانی هەنگ بریتین لە مێینەیەكی نەزۆك، بەشەكانی دەمی بەشێوەیەك ئامــادەكراوە كــە شــیلەی گــوڵ كۆبكاتــەوە، قاچــەكانی دواوەی ئامــادەكراوە بــۆ

کۆکردنەوەی دەنکە هەڵاڵەی گوڵ، هەروەها رژێنی ژێرقورگی هەیە کە خواردنی شایانەی لێوە دەرژێت، ورژێنی مۆم ورژێنی بۆنەکانیشی هەیە، کارکەرە گەڕیدەکانیش ئەوانەن کە دەچنە دەرەوە بۆ گەڕان بەدوای سەرچاوەی خۆراکدا، کە دەگەڕێنەوە هاوەڵەکانیان ئاگادار دەکەنەوە دەربارەی ئەوخۆراکەی دۆزیویانەتەوە.

رەوانبێژی سەرسوڕهێنەر لەووتەی پەروەردگاردا دەردەکەوێت: ﴿يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ﴾ واتە: لەسکی ئەو هەنگانەوە دێتەدەر خواردنەوەیەك (شلەیەك)، کە لە راستیدا بریتیە لە شلەیەك هێشتا نەگۆڕاوە بۆ هەنگوین، بەوەش دەکرێت بە هەنگوین کە پێکهاتە ئاویەکەی کەمبکرێتەوە بەشێوەیەك کە راددەی ئاو تێیدا لە (١٤-١٨٪) زیاتر نەبێت، ئەمەش بەوە دەکرێت کە کارکەرەکان بەهۆی باڵەکانیانەوە هەواگۆڕکێ دەکەن، هەروەها بەگۆڕینی شەکری دوانی (سوکەرۆز) بۆ شەکری تاك (گلوکۆز - فرەکتۆز) دەبێت، ئەویش بەکاریگەریی ئەنزیمی (ئینڤێرتەین) کە لە لیکە رژێنی کارکەرەکانەوە دەردەدرێت، کاتێکیش هەنگوینەکە پێدەگات نزیکەی (٢-٥ رۆژ) دەوێت، لەکاتی کۆکردنەوەیەوە کارکەرەکان هەڵدەستن بە داپۆشینی بە چینێکی تەنك لە مۆم بە مەبەستی پارێزگاری لێکردنی.

ووشەی (کُلِي) ئاماژەیە بۆ خۆراکی هەنگ لەسەر شیلەی گوڵ، وخواردنی ئەودەنکە هەڵاڵانەی کە کۆیاندەکاتەوە کە تەنها سەرچاوەی پرۆتینە بۆیان، کە ئەم دەنکە هەڵاڵانە پرۆتین وچەوری وشەکر وخوێی کانزایی وڤیتامینیشی تێدایە، کارکەرەکانی هەنگ دەتوانن دەنکە هەڵاڵەکان کۆبکەنەوە لە عەمبارێکی تایبەتیدا کە دەکەوێتە سەر قاچەکانی دواوەی، بوونی مووی بەربڵاو بەسەر لەشیەوە یارمەتی ئەم کارەی دەدات کە ژمارەیەکی زۆر لە دەنکە هەڵاڵە بەم موانەوە دەنووسێت، کە لەنێوان ٢٥٠هەزار بۆ ٦ملیۆن دەنکە هەڵاڵە دەبێت.

دەربارەی سوودە پزیشکیەکانی هەنگوینیش چەندین فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوون لەوانە:

﴿إن كان في شيء من أدويتكم خير ففي شرطة محجم أوشربة عسل، أولذعة بنار توافق الداء وما أحب أن أكتوي﴾ واتە: ئەگەر لە شتێك لە دەرمانەكانی ئێوەدا سوود هەبێت ئەوە لە برینێكی كەڵەشاخدایە یان لە خواردنەوەی هەنگویندا یان داخكردنێكدا بەپێی نەخۆشیەكە، بەڵام من حەزم لە داخكردن نییە.

هەنگوین یارمەتی چارەسەری زۆرێك لە نەخۆشیەكان دەدات، لەمڕۆدا سەدان توێژینەوەی زانستیی باوەڕپێكراو لەسەر سوودە پزیشكییەكانی هەنگوین لە چەندین سەنتەری جۆراوجۆر لەهەموو جیهاندا ئەنجامدراون.

هەنگوین چەند جۆرێكە بەپێی ڕەنگەكانی كە لەبنەڕتدا دەگەڕێتەوە بۆ جۆری ئەوگوڵەی كە دەبێتە خۆراكی هەنگەكان.

پەروەردگار زۆر ڕاستی فەرمووە: ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتاً وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ (٦٨) ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاء لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (النحل).

## لایەنی ئیعجازیی:

لەوەی پێشتر ڕوونمان كردەوە بۆمان دەركەوت لەڕووی زانستییەوە هەنگوین چارەسەری تێدایە وجۆرەكانی جیاوازە، كە ئەم جیاوازییە بەندە بە جۆری ئەوگوڵانەی دەیكەن بەخۆراك، هەموو ئەمانە یەكدەگرێتەوە لەگەڵ مانای دەقە قورئانیەكەدا، كە ئەگەر تێبینی نەزانینی خەڵكیش بكەین بۆ ئەم ڕاستییانە لە سەردەمی دابەزینی قورئاندا پێش ١٤٠٠ ساڵ زیاتر ئەمە ڕوویەكی تری ئیعجازی قورئانی پیرۆزمان بۆ دەردەخات.

**ئەمانەش هەندێك لایەنی ئیعجازی ئایەتەکەیە:**

١- زاراوەی (كُلِي) ئاماژەیە بۆ خۆراکی هەنگ لەسەر شیلەی گوڵ، وخواردنی ئەو دەنکە هەڵاڵانەی کۆیاندەکاتەوە کە تەنها سەرچاوەی پرۆتینە بۆیان، کە ئەم دەنکە هەڵاڵانە پرۆتین وچەوری وشەکر وخوێی کانزایی وڤیتامینیشی تێدایە.

٢- ئاماژەدان بەوەی لەسکی هەنگ دێتەدرەوە بە شلەمەنی وشەرابێك لەووتەی پەروەردگاردا: ﴿يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ﴾، کە لە راستیدا بریتیە لە شلەیەك کە هێشتا نەگۆڕاوە بۆ هەنگوین، بەوەش دەبێت بە هەنگوین کە پێکهاتە ئاویەکەی کەمبکرێتەوە بەشێوەیەك کە رادەی ئاو تێیدا لە (١٤-١٨٪) زیاتر نەبێت، وچەند گۆڕانکارییەکی تریش کە پێشتر ئاماژەمان پێدان.

٣- ئاماژەدان بەبوونی شیفا وچارەسەری پزیشکی لە هەنگویندا.



# بەراز سەرچاوەی نەخۆشی ودرمەکانە

پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّماً عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَودَماً مَّسْفُوحاً أَولَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوفِسْقاً أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (الأنعام:١٤٥) واتە: ئەی محمد (ﷺ) بڵێ: نابینم لەوەی کە وەحی وسرووشم بۆ کراوە هیچ خۆراکێك حەرام بێت بۆ کەسێك کە بیخوات جگە لە مردارەوە بوو یان خوێنێکی ڕژێنراو نەبێت، یان گۆشتی بەراز، چونکە بێگومان ئەوەش پیس وحەرامە، یان سەربڕاوێك کە کاتی سەربڕین ناوی غەیری خوای لەسەر هێنرابێت، جا هەرکەس ناچاربوو کە ئەو حەرامانە بخوات با زیاد لەپێویست نەخوات ومەبەستی سنوور بەزاندن نەبێت، ئەوە بێگومان پەروەردگارت لێبوردەی میهرەبانە.



### ماناکانی دەقە پیرۆزەکە:

لە ٣ شوێنی تردا قەدەغە کردنی گۆشتی بەراز وبەکارهێنانی وەك خۆراك هاتووە کە ئەمانەن: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (البقرة:١٧٣)

واتـه: ئـەوەی کـەخودا قەدەغـەی کـردووە لێتـان تـەنها مـردارەوە بـووە وخـوێنی ڕۆیشتووگۆشتی بەراز وئەوەی کـە سـەربڕدرابێ بـەناوی غـەیری خـوداوە، ئـەمجا هەر کەسێك ناچار بوو بەخواردنی یـەکێك لەمانـە بـەبێ یـاخیبوون ودەرچـوون لـە سنوور ئەوە هیچ گوناهێکی لەسەر نییە، بێگومان خودا لێخۆشبووی میهرەبانە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالْدَّمَ وَلَحْمَ الْخَنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ فَمَنِ اضْـطُرَّ غَيْـرَ بَـاغٍ وَلاَ عَـادٍ فَـإِنَّ اللّـهَ غَفُـورٌ رَّحِـيمٌ﴾ (النحـل:١١٥) واتـە: بێگومـان خـودا ئـەوەی حـەرامی کـردووە لەسـەرتان تـەنها مـردارەوە بووەخـوێن وگۆشـتی بـەراز وئـەوەی کـە سـەربڕاوە ونـاوی غـەیری خـوای لێهێنـراوە، بـەڵام هەرکەسێك ناچاربوولەوحەرامانە بخوات بێدەستدرێژیی وزیادەڕۆیی ئەوە بێگومـان خودا لێبوردەی میهرەبانە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيـرِ وَمَـا أُهِـلَّ لِغَيْـرِ اللّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ بِالأَزْلاَمِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ﴾ (المائدة) واتە: لەسـەرتان یاسـاغ کـراوە گۆشـتی مـردارەوە بـوو وخـوێن وگۆشـتی بـەراز وئـەو ئاژەڵـەی لـەکاتی سەربڕیندا ناوی غەیری خـوای لێبرابێـت، وئـاژەڵی خنکـاو وئـەوەی کـە لێیـدرابێت تاگیـانی دەرچـووبێت، وئـەوەی لەبـەرزی کەوتبێتـە خـوارەوە ومردبێـت، وشـۆخ لێدراوکەپێی مردبێت، وئەوەی دڕندە لێی خواردبێت، بێجگە لەوانـەی پـێش مـردن سەرتان بڕیبێت، هەروەها لێتان یاساغ کراوە ئەو ئاژەڵانەی لەسەر بەرد یان گلکۆ ومەزارگـە سـەر دەبـڕدرێن، وداواکردنـی بـەش وبـەخت ونیازگرتنـەوە، کـە ئەمانـە هەمووی لەفەرمان دەرچوون وتاوانە.

ئـەم قەدەغـە کردنـەی گۆشـتی بـەراز هـەموو شـتێکی خـوراو دەگرێتـەوە وەك چەورییەکەشـی، تەنانـەت پێکهاتـەکانی تـری لەشیشـی دەگرێتـەوە وەك زانایـان وتوویانـە، بەڵگـە نەوویسـتە کـە قەدەغـە کردنـی گۆشـتەکەی قەدەغـە کردنـی

چەورییەکەشــی دەگەیــەنێت، تەنانــەت ئەگــەر وەك ئــاڵفی هــەر حــەیوانێکیش بەکاربهێنرێت کە مرۆڤ دەیخوات.

وەســفکردنی قورئــانی پــیرۆز بــۆ بــەراز بــە زاراوەی (رجــس) ووردەکارییــەکی گەورەی تێدایە، چونکە ووشەیەکی کۆکەرەوەی هەموو مانایــەکی خراپــە کــە هــەر کەسێك نزیکی بکەوێت تووشی زیان ونەخۆشــی دەکات، ئەمــەش هــەمان حاڵــەتی ئاژەڵەکەشە کە خۆی هەڵگری پیسی وزیانە.

## راستی زانستی:

زانستی ئەمڕۆ هەندێك رووی دەرخستووە لە هۆکاری قەدەغەکراوەکان لە یاسا ئیسلامیەکاندا، کە بووەتە هــۆی پاراســتنی شــوێنکەوتووانی ئاینەکــە بــۆ چــەندین سەدە پێش دۆزینەوەی ووردبینەکان، بەم شێوەیە:

ئــاژەڵی مــردوو مایــەی گەشــەکردنی میکرۆبەکانــە، پاشــان خــوێن کــە تێیــدا میکرۆبەکان خێراتر گەشە دەکەن بەتایبەتی ئەگەر دوای مردنی ئاژەڵەکە بــەزۆری لە لەشیدا بمێنێتەوە، لە کۆتاییدا بەراز کە لە لەشیدا چەندین بەلا کۆدەبێتەوە کە بــە هــیچ پاککردنەوەیــەك لاناچێت، توێژینــەوە زانســتییەکان لــەمڕۆدا هەنــدێك لــە هۆکارەکانی نەخۆشیان دۆزیوەتەوە کە لەشی بەراز هەڵیدەگرێت ولەرێی خواردنی گۆشتەکەیەوە یان بەکارهێنانی پێکهاتەکانی تری لەشی بەراز بڵاودەبێتەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کە هــەموو دونیــا ئــەم زیانانــە دەزانــن خــواردنی گۆشــتی بــەراز لەجیهانــدا کــەمی نــەکردووە، ولــە هۆکارەکــانی راگەیاندنیشــدا گرنگییــەکی ئــەووتۆ بــەم بابەتــە نادرێــت، کــە بــە بــەردەوامی هــاوار دەکــەن بــۆ پاراســتنی تەندروستی گشتی!؟ [9]

موسوڵمانانیش دەبێت بەردەوام سوپاسگوزاری پەروەردگاربن بۆ ئــەم بەرنامــە جوانە کە هەمیشە بەرگریی لێکردوون لە خواردنی پیسیەکان وزیانبەخشەکان، کــە

---

[9] دەربارەی خواردنەوەی (مەی)یش هەمان ووتە راستە.

بەمە پاراستوونی لە هەموو نەخۆشی وزیانێك چەندین سەدە پێش دۆزینەوەی هۆکارەکانی نەخۆشی وداهێنانی ووردبینە زانستییەکان.

بەراز ئاژەڵێکی بەدخووە، بەراز لانەی چەندین میکرۆبی هەلپەرست وبەکتریا وڤایرۆسە کە بڵاوی دەکاتەوە بۆ مرۆڤ وئاژەڵەکانی تر.

هەندێك مشەخۆر تەنها تایبەتە بە بەرازەوە، وەك: مشەخۆری سکچوونی بەلەنتیدی (Balantidium Dysentery)، ومشەخۆری توکنی حەلەزۆنی (Trichinella Spiralis)، وکرمی شریتی بەراز (Taenia Solium)، وکرمی میزەڵانی (Cysticercosis)، هەندێکیان چەندین نەخۆشی هەڵدەگرێت کە هاوبەشە لەنێوان مرۆڤ وئاژەڵاندا (Zoonotic)، لەوانە:چەندین جۆری ئینفلوەنزا (Influenza)، ومشەخۆری فاشیۆلا (Fasciolop buski) لە چین، وکرمی مارئاسای ناوسك یان ئەسکارس (Ascaris).

پەتای سکچوونی بەلەنتیدی زۆر بڵاوە لەنێوان شوانەکانی بەراز وئەوانەی تێکەڵاویان دەکەن، ولەوانەیە بەشێوەی پەتایەکی خێرا بڵاوببێتەوە وەك ئەوەی لە یەکێك لە دورگەکانی زەریای هێمندا روویدا پاش ئەوەی کە زریانێك بووە هۆی بڵاوکردنەوەی پیسی بەراز لەنێودورگەکەدا.

لەهەر شوێنێك بەرازی لێبێت ئەو نەخۆشیانەشی لێیە، تەنانەت لە وڵاتە پێشکەوتووە تەکنەلۆجیەکانی وەك ئەڵمانیا وفەرەنسا هەروەك لە فیلیپین وفەنزوێلا وایە، کە ئەمە ئەوگومانە پەرچ دەداتەوە کە لەوانەیە بەهۆی هۆکاری تەکنیکی نوێوە بتوانرێت بەسەر پیسیەکانیدا زاڵبن، وبڵێن هۆکاری حەرامکردنی گۆشتەکەی بەڵگەی زانستیی لەسەر نییە، بەڵام راستییە زانستیەکان ئەم دەعوایەی بەتاڵ کردەوە.

تووشبوون بە نەخۆشی کرمی حەلەزۆنی لە ئەنجامی خواردنی گۆشتی ماسولکەی بەرازێکی تووشبووەوە دەبێت، کە مێیەی کرمەکە دیواری ریخۆڵەکان

کون دەکات بۆ دانانی گەراکانی کە دەگەنە نزیکەی (١٠٠٠٠) گەرا، دواتر بەهۆی خوێنەوە ئەم گەرایانە دەگوێزرێنەوە بۆ ماسولکەکان ودەبنە تورەکەیەکی تووشکەر.

تووشبوون بە کرمی شریتی بەراز بەهۆی خواردنی ماسولکەی بەرازی توشبووەوە دەبێت، ئەم کرمە لە ریخۆڵەکانی مرۆڤدا گەشەدەکات کە لەوانەیە درێژییەکەی بگاتە ٧ مەتر وخاوەنی سەرێکی دڕکدارە کە دەبێتە هۆی برینداركردنی دیواری ریخۆڵەکان وخوێنبەربوون لێیەوە، ودواتر تووشبوون بە کەمخوێنیەکی زۆر، هەروەها خاوەنی ٤ مژەرە لە سەریدا وملێکی هەیە کە پارچەکانی لەشی کرمەکە لەمەوە پەیدادەبن، وئەم پارچانە نێرەموکن و وەك گیاندارێکی سەربەخۆ وان وژمارەیان لەوانەیە بگاتە ١٠٠٠ دانە کە لە هەر یەکێکیاندا زیاتر لە ١٠٠٠ گەرا دروست دەکرێن.

تووشبوون بە کرمی میزەڵانی (Cysticercosis) کاتێك دەبێت کە مرۆڤ خۆراکێك بخوات کە بە گەرای کرمەکە پیس بوو بێت، پاشان کرمۆکەکان بەهۆی خوێنەوە بۆ هەموو ئەندامێکی لەش دەتوانن بچن کە راددەی مەترسی نەخۆشیەکە جۆری ئەندامە تووشبووەکان دیاری دەکات.

ئەم نەخۆشییانە بەهیچ شێوەیەك بەهۆی جۆرەکانی تری کرمی شریتیەوە وەك کرمی شریتی مانگا (Taenia saginata)وە دروستنابن، کە سەرەکەی دڕکدار نییە وزیانەکانی زۆر کەمترن.

هەروەها بەراز پیسخۆرە وخووەکانی زۆر خراپن، تەنانەت لای زوربەی ئاینەکانی تریش حەرامە خواردنی گۆشتەکەی کە شوێنکەوتووەکانیان بەگوێی ئەم فەرمانە ناکەن، دەبینین لە (سفر اللاويين: ٧-١١) دا هاتووە: (بەراز.. پیسە بۆئێوە...)، هەروەها لە: (سفر التثنية: ٨-١٤)دا هاتووە: (بەراز... پیسە بۆئێوە، کە نە لە گۆشتەکەی بخۆن ونەدەست لە لاشەشی بدەن).

قورئانی پیرۆزیش هۆکاری رێگری کردن لە خواردنی گۆشتەکەی لە ووتەی پەروەردگاردا: ﴿فَإِنَّهُ رِجْسٌ﴾ زۆر بەجوانی و ووردیی بۆمانی روونکردۆتەوە، (الرجس Filth) ووشەیەکی کۆکەرەوەیە کە ماناکانی پیسی وگلاوی وزیانبەخشی وهەڵگری ئەزیەت وزیان دەگەیەنێت، ئەم ووردەکارییە لە وەسفکردندا دیارە کە زانیاریی خودای زانا ودانایە [10].

---

١٠ بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر حیکمەتی حەرامبوونی گۆشتی بەراز کورتەیەکی بابەتی: (گۆشتی بەراز لەروانگەی زانست وئاینەکانەوە) دێنینەوە، لە نووسینی: پزیشکی ڤێتێرنەری (د.پێشنیار محمد عطا) کە لە ژمارە (٣٨)ی گۆڤاری (هەیف)دا بڵاوی کردۆتەوە:

- بەراز ئاژەڵێکی گۆشتخۆر وگیاخۆرە کە لە پیسترین جێگەدا دەلەوەڕێت، وناتوانێت خواردنی پیس وپاك لە یەکتر جیابکاتەوە، هەر شتێك لە بەردەمیدا بێت دەیخوات وەك زبڵ وخواردەمەنی وگۆشتی بۆگەن وبەچکە بەرازی تۆپیوو ومشك وجرج وقوڕ وچڵپاو وپیسایی مرۆڤ تەنانەت پیسایی خۆیی وبەرازی تریش، بەگوێرەی ئەو ژینگەیەی کە بەراز تیایدا دەژی وئەو خواردنەی دەیخوات وەك کێڵگەیەکی لێهاتووە بۆ زۆربەی مشەخۆر وبەکتریا وڤایرۆسەکان، هەروەك وەسف دەکرێت بە زبڵدانێك کە لەسەر ٤ پێ دەڕوات ونەخۆشی بۆ مرۆڤ دەگوازێتەوە.

چەندین هۆرمۆن وچەوری ومادەدەی تری زیانبەخش لەپێکهاتەی گۆشتی بەرازدا بەدی دەکرێت کە زیان بەتەندرووستی مرۆڤ دەگەیەنێت، هەروەها ئەم ئاژەڵە بەرپرسیارە لە گواستنەوەی ٥٧ نەخۆشی مرۆژەڵی (نەخۆشییە گوازراوەکانی نێوان مرۆڤ وئاژەڵ)، کە ٣٢ نەخۆشییان بەهۆی مامەڵەی ڕاستەوخۆی مرۆڤەوە دەگوازرێتەوە، و٢٨ نەخۆشی تریش بەهۆی پیسبوونی ژینگەی مرۆڤەوە، وزیاتر لە ١٦ نەخۆشی دیکە بەهۆی خواردنی گۆشتی بەرازەوە دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤ، ئەم نەخۆشییە گوازراوانەش پێکهاتوون لە ٣٠ نەخۆشی مشەخۆری، وزیاتر لە ١٥ نەخۆشی تر بەهۆی بەکتیریاوە، و ٨ نەخۆشی ڤایرۆسی (کە گرنگترینیان ئەنفلوەنزای بەرازە)، وهەروەها ٣ نەخۆشی تر کە هۆکاری کەڕووەکانە.

ئەگەر پرسیار بکرێت: کەواتە بۆچی بەراز بەخێودەکرێت؟ لە وەڵامدا:

بەراز لە تەمەنی ٤-٥ مانگیدا توانای ئاوسبوونی هەیە، وهەموو ٢١ ڕۆژ جارێك مێینەکان ئامادە دەبن بۆ جووتبوون، وماوەی ئاوسبوون ٣ مانگ و٣ هەفتەیە، وهەر مالۆسێك بە یەك جار (٣-١٢) بێچوو (پەڵخ)ی دەبێت، بەم شێوەیە لەماوەی ساڵێکدا ٣ جار مالۆس ئاوس

دەبێت، واتە لەماوەی ساڵەکەدا بەتێکرا ١٥–٢٠ بەچکەی دەبێت، بەراز زۆر بەخێرایی گەشە دەکات بەهۆی بوونی ڕێژەیەکی زۆر لە هۆرمۆنی گەشە (growth hormones) لە لەشیدا بەجۆرێك لە کاتی زایینیدا ٢ کیلۆگرامە، لەماوەی ٦ مانگدا ٥٠ جار کێشی زیاد دەکات تا دەگاتە ١١٢ کیلۆگرام، ئەگەر بەراوردێك لەنێوان بەخێوکردنی مەڕ وبزن وبەرازدا بکەین دەبینین کە لە ساڵێکدا ئەمان ١–٢ کار وبەرخیان دەبێت، واتە ئەگەر کەسێك ١٠٠ مەڕی هەبێت لە کۆتایی ساڵەکەدا ڕانەکەی دەبێتە ٢٠٠ سەر، بەڵام ئەگەر ١٠٠ بەرازی هەبێت ئەوا بەرهەمەکەی دەبێتە زیاتر لە ٢٠٠٠ سەر، ئەمە جگە لەوەی کێشی هەر مەڕێك ئەوپەڕی ٥٠ کیلۆگرامە بەڵام هەر بەرازێك نزیکەی ١٠٠ کیلۆگرامە.

زۆربەی ئاین وبیروباوەڕەکانی جیهان گۆشتی بەرازیان حەرام کردووە، وەك :ئاینی ئیسلام، ئاینی جولەکە، ئاینی مەسیحی، هندۆسی، زەردەشتی، یەزیدی، بوزی، کۆنفۆشیوسی، وچەندینی تر.

## پێکهاتەی گۆشتی بەراز وزیانەکانی خواردنی لە لایەن مرۆڤەوە:

لە تێکڕای یەك کیلۆ گرام گۆشتی بەراز نیوکیلۆگرامی چەوریە، جگە لەوچەوریەی لە دەوری ڕیشاڵە گۆشتییەکان ژمارەیەکی زۆر لە چەوری لە ناوخانەکانی بەرازدایە، ئەمەش لە گیانەوەرانی تردا نییە، ئەم چەوریەش بڕێکی زۆری کۆلیسترۆڵی زیانبەخشی تیادایە کە مەزەندە دەکرێت بە ١٠ ئەوندەی ئەوڕێژەیەی کە لە گۆشتی مانگادا هەیە، کۆلیسترۆڵی زیان بەخشیش دەبێتەهۆی ڕەقبوون ونەستووربوونی بۆرییەکانی خوێن وبەرز بوونەوەی پەستانی خوێن وجەڵتەی دڵ.

مرۆڤ تووشی گرفتەکانی هەرس دەبێت لەئەنجامی خواردنی گۆشتی بەرازەوە چونکە ڕۆنی بەراز درەنگ هەرس دەبێت بۆیە ئەگەر گۆشتی مانگا بە ٣ کاتژمێر هەرس ببێت ئەوا گۆشتی بەراز ٤ کاتژمێری پێویستە بۆ هەرس کردن.

گۆشتی بەراز هەندێك جار مرۆڤ تووشی گرفتەکانی حەساسیەت وئاڵۆش وبرینی گەدە دەکات، چونکە گۆشتی ئەم ئاژەڵە بڕێکی زۆر هستامین وئیمیدازۆڵی تیادایە کە مرۆڤ تووشی خوران وهەوکردن وسووربوونەوەی پێست دەکات، بۆیە هەندێك لەوانەی کە تووشی نەخۆشییەکانی خورانی پێست وئازاری گەدە دەبنەوە، کاتێك واز لە خواردنی بەراز دەهێنن لەوگرفتانە ڕزگاریان دەبێت.

هـەروەها گۆشـتی بـەراز بڕێکـی زۆر لـە هۆرمۆنـەکانی گەشـەکردنی تیادایـە کـە هانـدەری گەشەی ناڕێك وپێك وهەندێك جار هاندەری گەشەسەندی خانەکانی شێرپەنجە وەوکردنن.

گەر پارچەیەك لە گۆشتی مـەڕ ومانگـا وبـەراز لەبـەر هـەتاودا دابنرێـت دەبیـنین بـە زوویـی گۆشتی بەرازەکە بۆگەن دەکات پاشان مەڕ ئینجا مانگا، هەندێك جار لەوانەیە گۆشتی مانگاکـە وشك ببێتەوە بێئەوەی بۆگەن بکات، لێکدانەوەی زانستی بۆ ئەوەی کە گۆشتی بـەراز هـەڵگری ڕێژەیەکی زیاترە لە میکرۆب ئەوەیە کە گۆشتی بەراز بڕێکی کەمتر لە گلایکـۆجینی تیادایـە بـە بەراورد لەگەڵ ئەوگیانەوەرانەی گۆشتیان دەخورێـت، سـودی گلایکـۆجین ئەوەیـە بـە کارلێکـە کیمیاییەکان دەگۆڕێت بۆ شەکرەکان کە لەش وەك ووزە بەکاری دەهێنێت، ولەپاش سـەربڕینی گیانەوەرەکـە هەنـدێك بـەکتریای سـوودبەخش هـەن گلایکـۆجین دەگـۆڕن بـۆ ترشـەکان، بۆیـە بەبڕێکی کەم ڕاددەی ناوەندی ترشێتی لەش بەرزدەبێتەوە کە دەبێتە هۆی لەناوبردنی زۆربەی زۆری بەکتریاکان، بەڵام لەبەرئـەوەی گۆشـتی بـەراز بڕێکـی کـەمی لـە گلایکـۆجین تێدایـە ئـەم ڕووداوەش کـەمتر ڕوودەدات، بۆیـە گۆشـتی بـەراز هـەڵگری ڕێژەیـەکی زۆری بەکتریایـە وخێـرا بۆگەن دەکات.

چەوری بەراز زۆر بەخێرایی دەئۆکسێت لە هەوادا بۆیە دەبێـت لـە خـوار ١٤ پلـەی سـەدی هەڵبگیرێت بە بەراورد لەگەڵ چەوریەکانی تردا کە دەتوانرێت لەم پلەیەدا هەڵبگیرێت، هـەروەك ڕۆنـی بـەراز وگۆشتەکەشـی خێراتـر بۆگـەن دەکـات چـونکە دوای سـەربڕین ڕێـژەی ٢٪ ترشـە چەورییە سەربەستەکانی تیادایـە، ئەمـە جگـە لـەوەی ئـەم پێکهاتەیـەی ڕۆنـی بـەراز زۆر زیـاتر لەلایەن ڕیخۆڵکانەوە هەڵدەمژرێت، ولە لەشدا کۆدەبێتەوە ودەبێتە هۆی قەڵەوی وگرفتەکانی.

هەندێك لە لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە کە ڕۆنی بەراز هەڵگری بڕێکی زۆر لە کۆگردە کـە هۆکـارێکی شـێرپەنجەیە لـە ئەندامـەکانی لەشـی مرۆڤـدا، وەك کۆڵـۆن وپرۆسـتات ومـەمك وپەنکریاس ومنداڵدان وزراو.

بەستەرە شانەکانی بەراز کە ڕێژەیکی زۆر پێکهاتەی گۆگردی تیایـە دەبێتـە هـۆی نیشـتنی میوکـەس (mucus) لـە ژێکـان وکرکراگەکانـدا و، دەبێتـە هـۆی هـەوکردنی جومگـەکان وڕۆماتیزم، بوونی ئـەم ڕێـژە زۆرەی گـۆگرد ئەوگرفتـە ڕوون دەکاتـەوە کـە لـە کۆنـدا هەمیشـە ئەومەنجەڵە گڵێنانـەی کـە گۆشـتی بـەرازیان تێدا کوڵاوە هەمیشـە بـۆنی ناخۆشـیان لێهـاتووە

بەهۆی بوونی گازی هایدرۆجینی گۆگرد، هەروەها ئەوە روون دەکاتەوە کە لاکی بەرازی تۆپیوبۆنی ناخۆشترە بە بەراورد لەگەڵ ئەوگیانەوەرانەی کە گۆشتیان دەخورێت.

### هەندێك لە نەخۆشییە گوازراوەکان لە بەرازەوە بۆ مرۆڤ:

کرمی فاشیۆلۆپسس بوسکی Fasciolepsis buski، کرمی بەلهاریزیا Schistosomiasis، کرمی شریتی بەراز Pork tapeworm، کرمی بازنەیی بەراز Round worm، کرمی ئەسکارسی بەراز Ascaris suum، نەخۆشی تریکینیلۆسس Trichinellosis بەهۆی کرمی: تریکێنێلا سپایرالس Trichinella spirals، کرمی سی Paragonimus، کرمی کلۆنۆرکس سینینسس Clonorchis sinensis، کرمی گیگانسورینکەس Giganthorinchus، نەخۆشی ماکراکانسورینکۆسس Macracanthorhynchosis، نەخۆشی ئیسۆفیگۆستۆمۆسس Oesophagotomosis، نەخۆشی گۆنگایلۆنیمۆسس Gongylonimosis، نەخۆشی بەلانتیدیۆسس Balantidiosis کە هۆکارەکەی بریتییە لە مشەخۆر بەلەنتیدیەم کۆلی Balantidium coli، تریپانۆسۆمای ئەمەریکی American trypanosomiasis بەهۆی پرۆتۆزوا Trypanosoma cruzi، نەخۆشی دەردە پشیلە Toxoplasmosis، برۆسیلۆسس (تای مالتا) Brucellosis، گرانەتا Salmonelosis، سواین ئیریسیپلەس swine erysipelas بەهۆی بەکتریای Erysipelothrix rhusiopathia، نەخۆشیی ئەنسراکس (سپڵە قەویلە Anthrax) بەهۆی بەکتریای بەسیلەس ئەنسراسیس Bacillus anthracis، نەخۆشی کەمپایلۆبەکتریۆسس Campaylobacteriosis بەهۆی بەکتریای Campaylobacter jejuni، ژەهراوی بوونی خۆراکی کلۆستریدی بەهۆی بەکتریای Clostridia perfringens type A، نەخۆشی سیل Tuberculosis بەهۆی بەکتریای Mycobacterium tuberculosis.

ستریپتۆکۆکۆسس Streptococcusis بەهۆی بەکتریای Streptococcus swis type II لیپتۆسپایرۆسس (نەخۆشی وایلس Leptospyrosis)، تولاریمیا Tularaemia، کۆلیبەسیلۆسس Colibacillosis، بەهۆی بەکتریای Escherichia sp، هاری (داء الكلب Rabies)، تەبەق (جنون البقر Foot and mouth disease) بەهۆی ڤایرۆسی aphthovirus، هەوکردنی مێشك لە جۆری یابانی Japanese encephalitis بەهۆی ڤایرۆسی Japanese encephalitis virus، ئەنفلوەنزای بەراز Pig flu بەهۆی ڤایرۆسی swine influenza virus، دێرماتۆفایتۆسس Dermatophytosis بەهۆی تووشبوون بە کەڕووی Tricophyton Microsporum Sp.

## لایەنی ئیعجازیی:

دوای ئەوەی بینیمان لە یەکگرتنەوەی راستییە زانستییەکان ومانای دەقە پیرۆزەکان بۆ زیانەکانی بەراز کە پێش زیاتر لە ١٤ سەدە قورئان دووپاتی کردووەتەوە لەو ئایەتانەی کە بەرازیان بەپیس ناوبردووە، وبۆیەش پەروەردگار خواردنی حەرام کردووە، وپاشان زانیمان کە زانینی ئەوە مەحاڵ بووە لەکاتی دابەزینی قورئاندا، کەواتە ئەمە بەڵگەیەکی ترە لەسەر راستێتی پەیامی محمد (ﷺ)، ئیتر تاکەی نەیاران چاوی خۆیان کوێردەکەن بەرامبەر راستییە ئاشکراکان ودوای ئارەزووە سەرکێشانەکانیان دەکەون، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَكَذَّبَ بِهِ قَوْمُكَ وَهُوَالْحَقُّ قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ (٦٦) لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ (٦٧)﴾ (الأنعام) واتە: گەلەکەت باوەڕیان بەم قورئانە نەکرد کە هەر ئەوە حەق وراستی، بڵێ من پارێزەر وبەرپرستان نیم، بۆ هەموو هەواڵێك کاتێکی دیاریکراو هەیە کە راست ودرۆی تیادا روونده‌بێتەوە (ومانای هەواڵەکەی تێدا دەچەسپێت) ولە داهاتوودا دەزانن.



# قۆناغەکانی دروستبوونی شیر

پەروەردگار دەفەرموێت: {وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِلشَّارِبِينَ} (النحل٦٦) واتە: (بەڕاستی لە ئاژەڵ وماڵاتیشدا بۆئێوە پەند وئامۆژگاریی هەیە لەوەی لەناوسکیدایە بەئێوەی دەنۆشین، لەنێوان پیسیی وخوێندا شیرێکی پاکی بێخەوشتان پێدەنۆشین).

## مانا زمانەوانیەکان:

(الفرث) بریتیە لەوەی لەناوسکدایە، ووتراوە بریتیە لە پاشەڕۆی ئاژەڵ مادام لەناوسکدایە، هەندێك لە موفەسیرەکان لەمانای (مِن بَيْنِ)ی ئایەتەکەدا وتوویانە: مانای ئەوەیە کە شیرەکە لە هەندێك پاشەڕۆ وهەندێك خوێنەوە دروست دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە چۆنێتیەکەیان نەزانیوە چونکە مرۆڤ تەنها دوای چەندین سەدە لە دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چۆنێتیەکەیان بۆ دەرکەوت بەشێوەیەکی زانستی.

زاراوەی (خَالِصًا) لە ئایەتە پیرۆزەکەدا بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی ماددەکانی ناوشیر لەخوێنەوە پاڵفتە دەکرێن دوای ئەوەی پێشتر لە پیسیی جیاکراوەتەوە لە ریخۆڵەدا.

## راستیی زانستی:

دوای ئەوەی مرۆڤ نهێنییەکانی هەرسکردن وقۆناغەکانی وکاری ئەندامەکانی سیستمی هەرسکردن وکارەکانی ئەندامەکانی سیستمی دڵ وسووڕانی خوێن وفرمانەکانی لوولەکانی خوێن ورۆیشتنیان بەناولەشدا وپەیوەندییان بە سیستمی هەرسەوە دۆزییەوە، هەروەها کارەکانی سەرجەم سیستمەکانی لەش بەتایبەتی

رژێنـەکانی شـیری لـە ئاژەڵانـدا دۆزییـەوە، تـوانی میکـانیزمی دروسـتبوونی شـیر لەوخواردنەی ئاژەڵان دەیخۆن ئاشکرا بکات.

## قۆناغەکانی دروستبوونی شیری پاڵفتە:

دروســتبوونی شــیر لــە ئاژەڵانــدا بەهاوئاهەنگییــەکی وورد دەبێــت لــەنێوان سیسـتمی هەرسـکردن وسیسـتمی سـووڕانی خـوێن وسیسـتمی زاووزێ کـە لـەرێی رژێنەکانی شیر لە گوانەکاندا دەڕژێنرێت، هەریـەکێك لـەم ئەنـدام وسیسـتمانە کـار وفرمانی تایبـەتی خـۆی هەیـە کـە پێـی هەڵسـن بـۆ ئـەوەی سـەرەنجام ئەوشـیرە پاڵفتەیە دروست ببێت، دەتوانین قۆناغەکان بەم شێوەیە کورت بکەینەوە:

١- هەرسکردن:بەچــەند شــێوازێك دەبێتــە لەوانــە هەرسـکردنی میکـانیکی وهەرسـی کیمیـایی وهەرسـی میکرۆبـی بـەهۆی ئەوبەکتریایانـەی لەناوریخۆڵـەی ئاژەڵاندایە، سـەرەتا هەرسـکردن لـە دەمـدا بەهـەردووجۆری میکـانیکی وکیمیـایی روودەدات کـە ماددەکـانی ئـاڵف بـەجووین لـەت وپـەت دەکـرێن وتێکـەڵ بـە لیـك دەکـرێن کـە ئـەنزیمی (ئەمیلـەین)ی تێدایـە کـە هەڵدەسـتێت بەهەرسـکردنێکی سـەرەتایی، دواتـر قووتـدەدرێت بـۆ ناوگـەدە کـە لەوێـدا هەرسـکردنی میکـانیکی وکیمیایی ومیکرۆبی روودەدات.

پاشان خواردنەکە کاوێژدەکرێتەوە بۆ ناودەم وجارێکی تـر دەجوورێـت ولیکـی بەسەردا دەکرێت وقووتدەدرێتەوە، کە پاشتر بەکتریاکانی ناوریخۆڵە شیدەکەنەوە وکاربۆهیـدرات وپرۆتینـەکانی لێجیادەکەنـەوە وهـەر لەناوریخۆڵـەدا هەرسـکردنی کیمیـایی بـەهۆی ئەنزیمـەکانی (پێپسـین ورەنـین)ەوە روودەدات، لـە ئـەنجامی هەمووئـەم کردارانـەی هەرسـکردنەوە ئاڵفەکـە دەبێتـە هەرسـکراو(فـرث)، ئـەم هەرسکراوە دەچێتەناو ریخۆڵـە باریکـە ولەوێدا کردارەکـانی هەرسـکردن بـەردەوام دەبێـت وئـەم مـاددە هەرسـکراوە دووچـاری ئەنزیمـەکانی ریخۆڵـە وپـەنکریاس وزەرداوی جگەر ورزاو دەبێت.

لێرەدا ئەو خواردنەی لە گەردە ئاڵۆزەکان پێکهاتبوو شیدەبێتەوە بۆ گەردە سادەکان، نیشاستە وکاربۆهیدراتەکان شیدەبنەوە بۆ شەکرە سادەکان، وچەورییەکان دەگۆڕێن بۆ ترشەلۆکە چەورییەکان، وپرۆتینەکان دەبن بە ترشە ئەمینییەکان وپێپتیدەکان، بەڵام ڤیتامینەکان وخوێکان پێویستییان بەهەرسکردن نییە پێش هەڵمژینییان.

٢- پاڵفتەکردن لە هەرسکراوەوە: مەمیلە ووردەکانی ریخۆڵە باریکە هەڵدەستن بە هەڵمژینی ماددە خۆراکییە سادەکان بەچەند میکانیزمێك لە هەرسکراوەکەوە لەریخۆڵەدا، ئەم ماددانە دەگەنەناو موولوولەکانی خوێن لەژێر ناوپۆشی ریخۆڵە، ولەوێوە بۆناو سووڕی خوێن.

٣- پاڵفتەکردن لە خوێنەوە: خوێن هەڵدەستێت بەگواستنەوەی ماددە خۆراکییەکان بۆ هەموو شانەکانی لەش، لەوانە شانەکانی رژێنەکانی شیر لە گوانەکاندا کە لێرەدا پێکهاتەکانی شیر لخوێنەوە پاڵفتە دەکرێت بۆ ناو گوانەکان.



٤- دروستکردنی شیر له گوانەکاندا: گوانەکانی ئاژەڵان شارێکی پیشەسازین کە لە چەند سێکتەرێك پێکهاتوون، هەر سێکتەرێك لە چەند پلێك پێکهاتووە، هەر پلێکیش لەنێوان ١٥٠-٢٢٠ پێکهاتەی میکرۆسکۆبی تێدایە، ئەمانە پێکهاتەیەکن لەشێوەی کیسدا کە شیریان تێدا دروستدەکرێت ودوایی دەرێژرێت.

ئەم پێکهاتانە هەریەکێکیان وەك یەکەیەکی پیشەسازی سەربەخۆ کاردەکەن کە پێکهاتووە لە بۆشاییەك بۆ کۆکردنەوەی شیر کە دەورەدراوە بەچینێك لەخانەی ناوپۆش، هەرخانەیەك لەمانە یەکەیەکی سەربەخۆیە کە ئەومادده خاوانەی تێیدایە ولە خوێنەوە وەریگرتووە دەگۆڕێت بۆ دڵۆپێك شیر ودەڕژێتەناو بۆشایی توورەکەکەوە، خانە ناوپۆشە شیردروستکەرەکان ئەو شوێنەیە کە پەروەردگار تێیدا هەمووکردارەکانی دروستکردنی شیری تێدا کۆکردۆتەوە، کاتێك مادده خاوەکان لەرێی خوێنەوە دەگەنە خانەکان ولەرێی پەردەی خانەکەوە دەچنەناو پێکهاتە جیاوازەکانی ناوخانەکە، لەوێدا ئەوکردارە پێویستانەی بەسەردادێت کە خودای زانای نهێنییەکان بۆی دیاریکردوون ولەکۆتاییدا لە بەشی سەرەوەی خانەکەوە ماددەیەکی نوێ دەردەچێت کە لەگەڵ ماددەکانی تر پێکەوە ئەوشیرە دروستدەکەن کە گوانەکان دەریدەدەن، باپێکەوە بەدواداچوون بۆ رێڕەوی هەر ماددەیەك وسەرەنجامی لەناوخانەکاندا بکەین:

١- ترشە ئەمینییەکان: ئەم ترشانە کە لەخوێنەوە دێن دەچن بۆ بەشی تایبەت بەخۆیان لەناوئەم کارگانەدا کە بریتین لە رایبۆسۆمەکانی ناوخانە کەبڵاوبوونەتەوە لەسەر تۆڕی ئیندۆپلازمی زبر، لێرەدا یەکدەگرن بۆ دروستکردنی پرۆتینەکانی ناوشیر.

٢- شەکری شیر (لاکتۆز): شەکری گلوکۆز کە لەخوێنەوە دێت دەچێتەناوخانەکانەوە، هەندێکیان دەبێت بە گالاکتۆز وپێکەوە دەچنەناودەزگای گۆلجی وکارلێکی تایبەتیان بەسەردێت کە دەبێتەهۆی دروستبوونی شەکری شیر

یان لاکتۆز کە ماددەیەکی گرنگی پێکهێنەری شیرە، لاکتۆز وئاووپرۆتینەکان کۆدەبنەوە وچاوەڕێی پێکهاتەکانی تر دەکەن بەتایبەتی چەورییەکان.

٣- چەورییەکان: خانە ناوپۆشەکان ترشەلۆکە چەورییەکان وگلیسرۆلی ئامادە لەخوێنەوە وەردەگرن، ولێیانەوە ماددەیەکی چەوری دروستدەکەن لە تۆڕی ئیندۆپلازمییەوە، کە چەورییەکە بەرەوپەردەی سەرەوەی خانەکە دەڕوات، ولەگەڵ پێکهاتەکانی تری شیر کۆدەبنەوە ودواتر بەهیدایەتی خودایی لەخانەکەوە دەڕژێنە دەرەوە لەشێوەی شیردا.

٤- دژە تەنەکان: ئەم ماددانە لەخوێنەوەدێن لەرێی پەردەی لاتەنیشتی خانەکانەوە دەمژرێن ولەرێی گوێزەرەوەکانی نا خانەوە دەگوێزرێنەوە بۆ پەردەی سەرەوەی خانەکان وبەبێئەوەی گۆڕانکارییان بەسەردابێت دەڕژێنرێنە دەرەوەی خانەکە لەگەڵ پێکهاتەکانی تری شیردا.

٥- پێکهاتەی تری وەك ئاووخرۆکە سپییەکانی خوێن وکانزا وخوێکان رێڕەوەی خۆیان لەنێوان خانەکاندا دەکەنەوە بۆ ناوبۆشایی تورەکەکان.

کەواتە رژێنەکانی شیر لە گوانەکاندا هەڵدەستن بە پاڵفتەکردن ودروستکردنی شیر لە پێکهاتەکانی هەرسکراوەکەوە کە رژاونەتە ناوخوێنەوە، لەگەڵ هەندێك پێکهاتەی جێگیری تریش لەخوێنەوە وەك پرۆتینەکانی بەرگری وهەندێك ئەنزیم وپێکهاتەی کیمیایی کە لەخوێندا دروستدەکرێن، پاشان رژێنەکان هەمووئەم ماددانە ئامادە دەکەن وهەندێك پێکهاتەی تری بۆ زیاد دەکەن وەك شەکری لاکتۆز، ئیتر لێرەدا ئەم گەشتە ئەندازە بۆدانراوەی پێکهاتەکانی شیر بەوویستی پەروەردگار تەواودەبێت. **بڕوانە وێنە رەنگاورەنگەکانی لاپەڕە ( ٣٧٧ )**

## رووی ئیعجاز:

هیچ مرۆڤێك پێش داهێنانی مایکرۆسکۆب وئامێرەکانی توێکاریی لەم ٢سەدەیەی رابوردوودا نهێنییەکانی ئەوەی روودەدات لە سیستمی هەرسکردنی

مرۆڤ وئاژەڵدا وووردەکارییەکانیان وپەیوەندییان بەسیستمی سووڕانی خوێنەوە وقۆناغەکانی دروستبوونی شیر لەسکی ئاژەڵاندا نەدەزانی.

کاتێك ئامێرەکانی پێویست داهێنران وتوێژینەوە زانستییەکان بەدرێژایی سەدەکان گەیشتنە پایان ئەوسا مرۆڤ بۆی دەرکەوت کە پێکهاتەکانی شیر پاڵفتە دەکرێن دوای هەرسکردنی خۆراك لەوهەرسکراوەی لەریخۆڵەکاندایە ودەچێتە سووڕی خوێنەوە، دواتر دەگەنە رژێنەکانی شیر لە گوانەکاندا کە هەڵدەستێت بە پاڵفتە کردنی پێکهاتەکانی شیر لەخوێنەوە بەبێئەوەی هیچ شوێنەوارێکی هەرسکراوەکە یان خوێن خۆی لەناوشیردا بمێنێت، وپاشتریش لە رژێنەکانی شیردا شەکری لاکتۆزی بۆ زیاد دەکرێت بۆ ئەوەی تامێکی خۆش وقبوڵکراوی بداتێ لەلای ئەوانەی دەیخۆنەوە.

ئەم نهێنییانە شارراوە بوون لای مرۆڤەکان وتەنها دوای گەشتێکی دوور ودرێژ پێیگەیشتن لە تاقیکردنەوە وتوێژینەوە، کە چەندین سەدەی خایاند وتێیدا چەندین ئامێری نوێ بەکارهێنراون کە بۆ یەکەمجار لە مێژوودا دروستکران وپێشتر کەس نەیبینیبوون، بەڵام قورئانی پیرۆز بەدەستەواژەیکی کورت وپوخت وپڕ مانا ئەم نهێنییەی دەرخست پێش ١٤٠٠ساڵ زیاتر، باشە دەبێت کێ محمدی (ﷺ) لەناو هەموو مرۆڤەکاندا فێری ئەم نهێنییانەی کۆئەندامی هەرس وسوڕانی خوێن ووردەکاریی ئەوەی روودەدات لەناو رژێنەکانی شیر، تەنها ئەو پەروەردگارە نەبێت کە ئاگاداری هەموو نهێنییەکانی ئاسمان وزەوی ونهێنییەکانی هەموو دروستکراوەکانێتی ﴿لَّكِنِ اللّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلآئِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللّهِ شَهِيداً﴾ (النساء:١٦٦).



# شیرپێدان بۆ ماوەی ٢ ساڵی تەواو

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾ (البقرة:٢٣٣) واتە: دایکان شیربدەن بە منداڵەکانیان بۆ ٢ساڵی تەواو، ئەمە بۆ کەسێکە کە بیەوێت شیری تەواو بدات.

﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾ (لقمان:١٤) واتە: وە فەرمانمانداوە بەئادەمی بەچاکی هەڵس وکەوت کردن لەگەڵ دایك وباوکیدا، دایکی هەڵیگرتووە بە دووگیانی کە پێی لاواز دەبێت لاوازی لەدوای لاوازی وبڕینەوەی لەشیر لەدوای ٢ساڵیەوەیە، وفەرمانمان بە ئادەمی دا کە سوپاسگوزاری من ودیك وباوکت بکە وتەنها بۆلای منە گەڕانەوەتان.

﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا ۚ﴾ (الأحقاف:١٥)، واتە: وە ئێمە ئامۆژگاریی ئادەمی مان کرد بەچاکە کردن لەگەڵ دایك وباوکیدا، دایکی بەناڕەحەتی وئازارەوە هەڵیگرتووە وبەئازارەوە وبەناڕەحەتی بوویەتی، کە ماوەی دووگیان بوونی دایکی پێیەوە تا شیربڕینەوەی ٣٠ مانگە.

﴿وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۖ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ۖ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَىٰ﴾ (الطلاق:٦) واتە: وە ئەگەر (ئافرەتەکە) دووگیان بوون ئەوە ئێوە خەرجییان بکێشن تا سکەکەیان دادەنێن، ئەوسا ئەگەر شیریاندا بە منداڵەکەتان ئەوا ئێوەش کرێی شیردانەکەیان بدەنێ، وە لەناو خۆتاندا راوێژ بکەن بەچاکی دەربارەی منداڵەکە، وە ئەگەر تەنگیتان کرد ونەسازان لە کرێکەدا ئەوا با ئافرەتێکی تر شیری بداتێ.

## ماناى دەقەكان:

ئەم دەقانە وەك (الشوكاني) موفەسیر دەربارەیان دەڵێت: (هەواڵێكە مانای فەرمان پێكردن دەگەیەنێت چونكە پێویستە ناوەرۆكەكەی جێبەجێ بكرێت، كە بە زاراوەی (كاملین) واتە (زۆر تەواو) دووپاتكراوەتەوە، كە ئەوە شیردانی تەواوە بۆ منداڵ)[11].

كەواتە لێرەدا تەئكید كراوەتە سەر شیری دایك كە گونجاوترینە بۆ كۆرپەكەی خۆی نەك منداڵی تر، ئەویش لەبەرئەوەیە كە خۆراكی دوای لەدایكبوونی وەك خۆراكی كاتی ناومناڵدانی لە دایكییەوە دەبێت، هەربۆیە پێویستە لەسەریان شیر بە منداڵەكانیان بدەن[12].

كەواتە ئەم دەقانە ئاماژە بۆ ئەوە دەدەن كە هیچ شیرێك چاكترنییە بۆ منداڵ لە شیری دایكی خۆی، ماوەی شیردانەكەش كە ٢ ساڵە بە زاراوەی (كاملین) واتە زۆر تەواو تەئكید كراوەتەوە ئەویش بۆ ئەوەی باوك لەوماوەیەدا نەفەقە وبەخێوكردنی دایك وكۆرپەكەی لەئەستۆ بێت، وهەروەها ئەولەویەتی شیردانەكەی داوە بەدایكەكە، ونەیفەرمووە كە با كەسی تر لەسەر مەسرەفی باوكەكە شیربدات بەمنداڵەكە، بەڵكو هەڵبژاردنی یەكەم بۆ شیردان دایكی منداڵەكەیە، هەروەها ئایەتە پیرۆزەكانیش بەهیچ شێوەیەك باسی شیری ئاژەڵیان نەكردووە وەك جێگرەوەی شیری مرۆیی: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَا تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ ۚ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ ۗ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا ۗ وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّا آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ﴾ (البقرة:٢٣٣).

---

١١ بڕوانە: فتح القدير للشوكاني ٦٠/١.

١٢ بڕوانە: تفسير التحرير والتنوير – ابن عاشور: ٤٣١/٢.

## راستییه زانستییه‌كان:

توێژینه‌وه زانستییه‌كان له‌بواری خۆراكی منداڵانی تازه له‌دایكبووكۆكن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه شیردانی سروشتی له‌لایه‌ن دایكه‌وه سوودمه‌ندترین خۆراكه بۆیان به‌ره‌هایی، ئه‌وه‌ش سه‌لماوه كه شیری دایك هیچ جۆره هه‌ستیارییه‌ك بۆ كۆرپه‌كه دروستناكات، كه له‌وانه‌یه رێژه‌ی هه‌ستیاریی منداڵان به‌شیری ئاژه‌ڵی بگاته ۳۰٪، ئه‌م شیرانه تێكچوونی كرداری هه‌رس وتێكچوونی كاری ریخۆڵه‌كان دروستده‌كه‌ن، كه‌مته‌رخه‌میش له پاككردنه‌وه‌ی بتڵی شیر ده‌بێته‌هۆی تووشبوون به هه‌وكردنه‌كان وسكچوون كه پاشان ووشكبوونه‌وه وبه‌دخۆراكی به‌دوای خۆیدا دێنێت، كه له‌وانه‌یه ببێته‌هۆی گیان له‌ده‌ستدانی كۆرپه‌كه، به‌پێی ئاماره‌كانی رێكخراوی ته‌ندروستی جیهانی ساڵانه زیاتر له ۱ ملیۆن منداڵ به‌هۆی نه‌خۆشییه‌كانی كۆئه‌ندامی هه‌رس وسكچوون گیان له‌ده‌ست ده‌ده‌ن، زۆرێك له‌وحاڵه‌تانه به‌هۆی به‌كارهێنانی شیره ده‌ستكرده‌كانه‌وه ده‌بێت.

توێژینه‌وه نوێكان ده‌ریانخستووه كه شیری دایك به‌تایبه‌تی (ژه‌گ)ی دوای منداڵبوون كه له رۆژه یه‌كه‌مه‌كاندا ده‌رێژرێت سه‌رچاوه‌ی به‌رگرییه بۆ منداڵه‌كه، به‌تایبه‌تی دژی ئه‌وكارتێكه‌ره ژینگه‌ییانه‌ی ده‌بنه‌هۆی له‌ناوبردنی خانه‌كانی په‌نكریاس كه هۆرمۆنی ئینسولین ده‌رێژن، پشتبه‌ستن به‌شیری مانگا بۆ كۆرپه ده‌بێته‌هۆی له‌ده‌ستدانی ئه‌م به‌رگرییه، وئه‌م منداڵانه له‌داهاتوودا به‌رێژه‌یه‌كی زیاتر تووشی نه‌خۆشی شه‌كره ده‌بن، ئه‌وه‌ی ئه‌م بۆچوونه به‌هێزتر ده‌كات بوونی رێژه‌یه‌كی به‌رزی دژه‌ته‌نه دژی پرۆتینه‌كانی شیری مانگا له‌خوێنی ئه‌ومنداڵانه‌ی تووشی نه‌خۆشی شه‌كره بوون به‌به‌راورد به‌و منداڵانه‌ی شه‌كره‌یان نییه.

پێش كامڵ بوونی سیستمی هه‌رس له كۆرپه‌دا پرۆتینی شیری مانگا ده‌كرێت به‌بێ هه‌رسكردن له‌دیواری ریخۆڵه‌وه بمژرێت بۆ ناوخوێن، كه ئه‌نزیمه ناكامڵه‌كانی هه‌رس ناتوانن به‌ته‌واوه‌تی تێیبشكێنن بۆ ترشه ئه‌مینییه‌كان، ئه‌مه ده‌بێته‌هۆی

هاندانی کۆئەندامی بەرگری بۆ دروستکردنی دژەتەن دژی ئەم پرۆتینانە، ئەوەی مایەی سەرسورمانە بوونی ئەم دژەتەنانەیە دژی شیری مانگا بەرێژەیەکی بەرز لەخوێنی ئەومندالانەی پێش ٢ساڵی شیری مانگایان خواردووە بە بەراورد بەومندالانەی دوای ٢ساڵی شیری مانگا دەخۆن، کە ئەمە بە تەواوەتی یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ماوەی لەشیر برینەوە کە لە قورئاندا دیاریکراوە بە ٢ساڵی تەواو، هۆکارەکەشی کامڵ بوونی گەشەی ریخۆڵەکانە دوای تەمەنی ٢ساڵی.

لەلایەنی دەروونیشەوە دەبینین شیردانی سروشتی دایك بۆ کۆرپەکەی پەیوەندییەکی تایبەتی لەنێوانیاندا دروست دەکات، کە دەبێتەهۆی تێرکردنی غەریزەی دایکایەتی وپێویستییەکانی کۆرپەکەش تێردەکات، لەلایەنی کارئەندامزانیشەوە شیری مرۆڤ گونجاوترینە بۆ کۆرپە وشیری ئاژەڵی لەوانەیە زیانی گەورە بەلەشی کۆرپەکە بگەیەنێت، هەربۆیە لە قورئاندا باسی شیری ئاژەڵ بۆ مرۆڤ نەکراوە وتەنها باسی شیردانی سروشتی مرۆیی کراوە، وەك لە ئایەتی:

﴿وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۖ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ۖ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَىٰ﴾ (الطلاق: ٦) واتە: وە ئەگەر دووگیان بوون ئەوە خەرجییان بکێشن تا سکەکەیان دادەنێن، ئەوسا ئەگەر شیریاندا بە منداڵەکەتان ئەوا ئێوەش کرێیان بدەنێ، وەلەناو خۆتاندا راوێژ بکەن بەچاکی دەربارەی منداڵەکە، وەئەگەر تەنگیتان کرد ونەسازان لە کرێکەدا ئەوا با ئافرەتێکی تر شیری بداتێ.

لەرووی زانستیشەوە سەلماوە کە جێگرەوەی شیری مرۆیی وەك شیری مانگا دەبنەهۆی زیان بۆ کۆرپەکە وبەسوودترین شیر سەرچاوەی مرۆییە بەتایبەتی لە دایکی خۆیەوە، دەتوانرێت لەشیر برینەوە لەپێش ٣مانگ لە تەواوبوونی ٢ساڵەکە دەست پێبکات ئەگەر دووگیانی ٩مانگ بخایەنێت، بەبەڵگەی ئایەتی: ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا﴾ (الأحقاف:١٥) واتە: (ماوەی دووگیان بوونی دایکی پێیەوە

تا شیربڕینەوەی ٣٠ مانگە)، بەڵام لەشیربڕینەوەی تـەواوەتی لـە ٢ساڵیدا دەبێت دوای کامڵ بوونی ئەندامەکانی کۆرپەکە، بەدەقی ئایەتی: ﴿وَفِصَالُهُ فِـي عَـامَيْنِ﴾ (لقمان:١٤) واتە: (وەبڕینەوەی لەشیر لەدوای ٢ساڵیەوەیە)، لەرووی زانستیشـەوە دەرکـەوتووە کـە زیـانی شـیری مانگـا لەسـەر کۆرپەکـە کەمدەبێتـەوە تـاوەکو بەتـەواوەتی نامێنێـت دوای ٢سـاڵ، ئـەویش بـەکامڵبوونی ئەندامـەکانی لەشـی کۆرپەکە.

## رووی ئیعجاز:

دوای جێگیربوونی گرنگیی شیردانی سروشتی دایکان بـۆ منداڵـەکانیان لـەرووی زانسـتییەوە، ودەرکـەوتنی ئەوسـوودە جەسـتەیی ودەروونییانـەی لەشـیردانەوە بەمنداڵەکە دەگات، ودەرکەوتنی گرنگیی تەواوکردنی ٢ساڵ لەشـیردانی سروشـتی پێش لەشیر بڕینەوە، لێـرەوە یەکگرتنـەوەی تـەواوی ئامـاژە قورئانییـەکانمان بـۆ دەردەکـەوێت لەگـەڵ راسـتییە زانسـتییەکاندا، وروویـەکی ئیعجـازی زانسـتی قورئانمان بۆ روونکردەبێتەوە، کە مرۆڤەکانی پێشتر ئاگاداری ئەم راستییانە نـەبوون وتەنها لەرۆژگاریی ئەمرۆدا بەتوێژینەوەی زانستی بۆمان رونبووەوە.



# شیردانی سروشتی

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ﴾ (البقرة:٢٣٣) واتە: (دایکان شیربدەن بە منداڵەکانیان)، ﴿وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَى﴾ (الطلاق:٦) واتە: (وەئەگەر تەنگیتان کرد ونەسازان لە کرێکەدا ئەوا با ئافرەتێکی تر شیری بداتێ).

ئەم دەقە پیرۆزە ڕێنوماییمان دەکات بۆ گرنگی شیردانی سروشتی دایکان بۆ کۆرپەکانیان، تەنانەت دەقی دووەم تەئکید لەسەر ئەم ئامۆژگارییە دەکات بەوەی دەبێت پارمەتی شیردەرێکی تر وەربگیرێت بۆ شیردانی کۆرپەکە لەکاتێکدا دایکەکەی خۆی لەبەر هەر هۆکارێك نەتوانێت شیربدات بەکۆرپەکە، ئەویش لە ووتەی پەروەردگار ﴿فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَى﴾.

## راستی زانستی:

چەندین توێژینەوە وتاقیکردنەوەی زانستی لەبواری خۆراك پێدانی کۆرپە ئەنجامدران، بەمەبەستی زانینی گونجاوترین خۆراك بۆیان، ئەوەبووبۆ زانایان تایبەتمەندیی شیری دایك دەرکەوت بەسەر شیریی دەستکرددا کە چارەسەریشی تێدایە سەرەڕای ئەوەی کە گونجاوترین خۆراکیشە، بەتایبەتی ژەگ (Colostrum) کە بە ڕێژەیەکی زۆر دوای منداڵبوون دەرێژرێت وماوەی (٣-٧) رۆژ دەخایەنێت، ئەم ماددەیە زۆر گرنگە بۆ ژیانی کۆرپەکە وبەرگریی لەشی دژی نەخۆشییە جۆراوجۆرەکان لەبەر بوونی ڕێژەیی بەرز لە دژەتەنەکان (گلۆبیولینەکان Globulins)ی تێیدا، کە زۆر گرنگن بۆ بەرەنگار بوونەوەی بەکتریا وڤایرۆسە جۆراوجۆرەکان وپاراستنی تازە لەدایك بووەکە لەتووش بوون بە هەوکردنەکان، هەروەها شیری دایك پرۆتینەکانی بەرگریی تێدایە وەك

(ئینتەرفیرۆن) کە دژە بەکتریا ودژە ڤایرۆسە، لەگەڵ بوونی ژمارەیەکی زۆر لە خرۆکە سپیەکانی خوێن کە بەرگریی پێدەدەن دژی چەندین نەخۆشی، بینراوە کە کەوچکێکی چا لەشیری دایك زیاتر لە ٣ ملیۆن خانەی بەرگریی تێدایە، لەکاتێکدا شیری دەستکرد بەتەواوەتی خاڵییە لە هەمووجۆر دژەتەن وخانە وپرۆتینە بەرگرییەکان، هەربۆیە سوود وەرگرتنی ئەومندالآنەی کە شیری دەستکرد دەخۆن لە کوتانەکان زۆر کەمترە بە بەراورد بەو مندالآنەی شیریی سروشتی دایکیان دەخۆن.

ئەوەی پێشتر لایەنی پارێزەری شیردانی سروشتی دایکان بووبۆ کۆرپەکانیان، لەلایەنی خۆراك ئەومادەدانەی لە شیری دایکدا بوونیان هەیە نموونەیە لە دابینکردنی سەرجەم پێداویستییە خۆراکییەکانی کۆرپەکە وهەروەها گونجاوترینە بۆ کۆرپەکە لەرووی لایەنە کیمیایی وفیزیایی ودەروونییەکانەوە، تەنانەت شیردانی سروشتی دایکان بۆ منداڵەکانیان سوودی زۆری بۆ دایکەکەش هەیە،

چەندین توێژینەوەی زانستی دووپاتی زیادبوونی نەخۆشییەکانی هەستیاری وحەساسیەت دەکەنەوە لەنێوان مندالآنی شیری دەستکرد بە بەراورد بەومندالآنەی پشت بەشیردانی سروشتی دەبەستن، ئەومندالآنەی شیری مانگایان دەدرێتێ تووشی هەستیاریی کۆئەندامی هەرس دەبن بەرێژەی ٦٠٪ وزیاتر، وهەستیاریی سیستمی هەناسەدان ورەبو تێیاندا دەگاتە ٣٠٪ وهەستیاریی پێست دەگاتە ٧٠٪، هۆکاری ئەم نیشانانە دەگەرێتەوە بۆ توانای هەندێك لە پرۆتینەکانی شیری مانگا بۆ پەرینەوە بۆناو خوێن لەرێی ریخۆڵەکانەوە بەبێ هەرسکردن بەهۆی کامڵ نەبوونی سیستمی هەرسکردن، ئەمە دەبێتە هۆکاری پەیدابوونی ئەو جۆرانەی هەستیاریی لە داهاتوودا.

شیردانی سروشتی منداڵ دەپارێزێت لە تووشبوون بە نەخۆشی شەکرە لە جۆری یەکەم (شەکرەی مندالآن)، مایەر (Mayer) وچەند توێژەرێکی تر

دەريانخست كە شيردانى سروشتى دەبێتەهۆى كەمبوونەوەى ئەم نەخۆشييە لەنێوان منداڵاندا بەرێژەى ٢٥–٥٠٪، چونكە پرۆتينەكانى شيرى مانگا دەبێتەهۆى وورووژاندنى سيستمى بەرگرى لەشى كۆرپەكە بۆ دروستكردنى چەندين دژەتەن كە هێرش دەكەنەسەر ئەوخانانەى (بێتا) كە هۆرمۆنى ئينسۆلين دروست دەكەن لەرژێنى پەنكرياسدا ولەناويان دەبەن.

تعرفوا معنا علي الفرق بين حليب الأم والحليب الصناعي

لكي يتضح لكم أن لا شيء مماثل لحليب الأم

فكل 100 مل من الحليب يحتوي علي:

| الخصائص | حليب الأم | الحليب الصناعي | ملاحظات |
|---|---|---|---|
| عوامل نمو | موجوده وليست هرمون انما عوامل مساعده | لا توجد | نمو افضل مع حليب الأم |
| انزيمات هاضمه | موجوده لكل مغذي | لا توجد | هضم افضل |
| عوامل مناعه | موجوده بكثره (اكثر من 40 عامل) | لا توجد | مناعه اقوي مع حليب الأم |
| كريات دم بيضاء | موجوده من الأم | لا توجد | مناعه اقوي مع حليب الأم |
| الوسط | حامضي | قاعدي | الجراثيم تعيش في الوسط القاعدي |
| السعرات الحراريه | 67 كيلو كالوري | 87 كيلو كالوري | متساويين |
| البروتين | 1جم/100مل | 12,2 جم /100مل | في الصناعي اكثر ولكنه صعب الهضم. في الطبيعي اقل ولكن يمتص كله بسهوله |
| السكر | 7جم/100مل | 5-9جم /100مل | في الطبيعي اقل فيقل التخمر والغازات |
| الدهون | 4جم/100مل | 4جم/100مل | متساويين |
| الحديد | 0,7جم/100مل | 0,3جم-1جم/100مل | الطبيعي اقل ولكنه يمتص بالكامل عكس الصناعي لا يمتص |
| فيتامين سي | حسب غذاء الأم | 5مج/100مل | تلقيف الحوامل علي تنوع الغذاء |
| فيتامين د | نقطه/100مل | 4نقاط/100مل | يقل فيتامين د في الطبيعي لأنه من الفيتامينات المذابه في الدهون لذا يجب ان تتعرض الأم والطفل للشمس |
| الملح | 13-40جم/100مل | 15جم/100مل | أكثر في الصناعي مما يشكل ضغط علي الجهاز الكلوي |
| بروبيوتك | كثير طبيعي | قليل مضاف | اضيف للصناعي بكميات قليله ذو فعاليه محدوده |

هەروەها لەومندالآنەی کە شیری قوتودەخۆن دیاردەی مردنی کۆرپەی کتوپڕی بێهۆ (Sudden Infant Death Syndrome-SIDS) زۆردەبێت کە لەرووی پزیشکییەوە بە مردنی ناولانکە ناسراوە، ئەم دیاردەیە زۆر دەگمەنە لەومندالآنەی شیری سروشتی دایکیان دەخۆن، ولەمندالآنی شیری قوتودەگاتە ٢ئەوەندە زیاتری مندالآنی شیردانی سروشتی، گەشەی دەروونی ئەو مندالآنەی شیری دایکیان دەخۆن زۆر هاوسەنگ دەبێت، بەلآم لە مندالآنی شیری قوتوڕێژەی نەخۆشییە دەروونییەکان زیاتر وجۆراوجۆرە. **بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە** ( ٣٧٨-٣٧٩ )

سەبارەت بەدایکەکەش شیردانی سروشتی چەندین سوودی هەیە، لەوانە: یارمەتی گرژبوونی منالّدان (رەحم)ی دایکی شیردەر وگەڕانەوەی بۆ قەبارەی ئاسایی خۆی دەدات دوای مندالّبوون، لەدایکانێك کە راستەوخۆ شیرنادەن بەکۆرپەکانیان ئەم گرژبوونە درەنگتر روودەدات، چونکە شیردان دەبێتەهۆی زیاتر رژاندنی هۆرمۆنی ئۆکسیتۆسین (Oxytocin) کە پێویستە بۆ رژاندنی شیر لە مەمکەوە، هەر ئەم هۆرمۆنەیە کە زۆر گرنگە بۆ گرژکردنی رەحم وگێڕانەوەی بۆ قەبارەی ئاسایی خۆی دوای منالّبوون، بەهۆی گرژبوونی ماسولکەی منالّدانەوە رێدەگیرێت لە نەزیفی بەهێزی دوای منالّبوون ودایکەکە دەپارێزێت لە ماکە مەترسیدارەکانی دوای منالّبوون ولەوجەلّتانەی لەوانەیە لەکاتی بێنوێژی دوای منالّبوون تووشی دایکەکە ببێت.

شیردانی سروشتی یارمەتیدەر دەبێت لە بەهێزکردنی پەیوەندی بەسۆزی نێوان دایك وکۆرپەکەی، وحالّەتێك لە رازیبوون وتێربوونی سۆزداری ودەروونی بەدایکەکە دەبەخشێت.

هەروەها شیردان بەزۆری رێدەگرێت لە دووگیانی لەلای دایکانی شیردەر بەبێبوونی پێویستی بۆ بەکارهێنانی رێگرەکانی دووگیانی، چونکە شیردانی سروشتی دەبێتەهۆی زیاتر رژاندنی هۆرمۆنی پرۆلاکتین لە ژێرمێشکە رژێنەوە کە

دەبێتەهۆی زیاتر ڕژاندنی شیر وخاوکردنەوەی هێلکەدانەکان ووەستاندنی سووڕی مانگانەی ئافرەتان، بەمەش دووركەوتنەوە ڕوودەدات لەنێوان دووگیانیەکاندا کە بەسوود دەگەڕێتەوە بۆ دایك وکۆرپەکەی پێکەوە.

لە نوێترین دۆزینەوەی تاقیکاریی زانستیدا کە زۆر سەرنجڕاکێشە دکتۆری ئوسترالی (د.مارك کریگان Mark D. Cregan) وهاوەڵەکانی لە زانکۆی (Western Australia) لە (ئوستراليا) ساڵی (٢٠١٠) بوونی خانەی کۆرپەلەیی بنەڕەتی (Stem Cells) لەشیری سروشتیدا دۆزییەوە کە لەداهاتوودا ڕۆڵیان دەبێت لە کامڵ بوونی جەستەیی منداڵە شیرەخۆرەکە، ئەمەش نزیکییەکی کۆرپەلەیی وپێکهاتەیی دروستدەکات لەنێوان منداڵە شیرەخۆرەکە وشیردەر ومنداڵەکانیدا، ئەم ڕاستییەش بەشێکی حیکمەتی حەرامبوون وخزمایەتی لەڕێی شیرخواردنەوە دەردەخات، هەروەك لە ووتەی پەروەردگار: ﴿وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ﴾ (النساء:٢٣) واتە: ئەودایکانەتان کە شیریان پێداون وخوشکەکانتان لە شیرەوە.

خانە بنەڕەتییەکانیش (ستێم سێڵ) بریتین لە خانەیەکی سەرەتایی ناتایبەتمەند کە بەنزیکەیی لەهەموو ئەندامەکاندا بوونی هەیە و وەك یەدەگێك بۆ قەرەبووکردنەوەی خانە زیانلێکەوتووەکان بەکاردێت، بۆ نموونە لەناو مۆخی ئێسکدا خڕۆکەکان وخەپلەکانی خوێن دروستدەکات بۆ جێگرتنەوەی ئەوخڕۆکانی سووڕی ژیانیان تەواوبووە.

توێژینەوە زانستییە نوێکان هەوڵی گەشە پێکردنی خانە بنەڕەتییەکان دەدەن بەمەبەستی گۆڕینی بۆ ئەوجۆرە خانانەی لەش لەدەستیداوە وپێویستێتی، بۆ نموونە گەشە پێکردنی خانەی پەنکریاس لە خانە بنەڕەتییەکانەوە بۆ جێگرتنەوەی خانە زیان لێکەوتووەکانی پەنکریاس کە هۆرمۆنی ئینسۆلین دەڕێژن، لەمەوە چارەسەری کۆتایی نەخۆشی شەکرە دەکرێت.

(د.مارك كريگان) دەڵێت: (توانای خانە بنەڕەتییەكانی ناو شیری دایك بۆ تایبەتمەندبوون بەهێزترە لە توانای ئەو خانە كۆرپەلەییانەی لە وێڵاشی منداڵەوە لەسكی دایكیدا وەردەگیرێت)، كەواتە لێرەوە دۆزینەوەیەكی زۆر گرنگ ونوێ وسەرسوڕهێنەر كرا كە شیری دایك تەنها ماددەیەكی خۆراكی نییە بۆ كۆرپە وەك پێشتر وا دەزانرا. **بڕوانە وێنەكانی لاپەڕە ( ٣٨٠ )**

## رووی ئیعجاز:

لە ووتەی پەروەردگار ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ﴾ (البقرة:٢٣٣) واتە:(دایكان شیربدەن بە منداڵەكانیان)، ئامۆژگارییەكی ئاشكرا ودووپاتكراو هەیە بۆ پشت بەستن بەشیری دایك، كە مانای ناوازەیی وباڵادەستیی دەگەیەنێت بەسەر هەموو شێوازەكانی تری خۆراك پێدانی كۆرپەدا.

بەكرداریش لە رۆژگاری ئەمڕۆدا سەلماوە كە شیری دایك گونجاوترینە بۆ كۆرپەكەی، كە ئەگەر نەگونجا دەبێت شیردەرێكی تر بەم كارە هەستێت، لێرەوە لەپێشیی شیری مرۆیی لە قورئاندا پارێزراوە.

بەكرداریش دەركەوتووە كە شیری مانگای ووشككراو زیانی تێدایە بۆ كۆرپە، لێرەوە بۆمان روونبووەوە كە ئەوەی قورئانی پیرۆز پێش ١٤٠٠ساڵ ئامۆژگاریی كردووین یەكدەگرێتەوە لەگەڵ نوێترین دۆزینەوە زانستییەكان لەمڕۆماندا، كە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان ووتەی پەروەردگارە وئەو كەسەشی قورئانی پێراگەیاندووین (كە پێغەمبەرە) لەرێی سرووش ونیگای خوداییی پێیگەیوە، ئەمەش ژێربێژیی بابەتی ئیعجازی زانستییە.

❀❀❀

# مێش

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ ۚ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ (٧٣) مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ (٧٤) ﴾ (الحج) واتە:ئەی خەڵکینە نموونەیەك هێنراوەتەوە جا گوێی بۆبگرن، بێگومان ئەوانەی هاواریان لێدەکەن لەجیاتی خودا هەرگیز ناتوانن مێشێك دروست بکەن هەرچەند هەموشیان بۆی کۆببنەوە، وەئەگەر مێشێك شتێکیان لێبفڕێنێت ناتوانن لێی وەرگرنەوە ولێی بسێننەوە، داواکار وداوالێکراو لاواز وبێدەسەلاتن، ئەوانە بەوشێوەی پێویستە خوا بناسن وقەدری بگرن نەیانناسیوە بێگومان خودا بەتوانای بەدەسەلاتە.

لێرەدا پەروەردگار ئەوەمان بۆ روونده‌کاتەوە کە ئەوەی مێش دەیخوات لە خۆراك ناتوانرێت وەك خۆی لێی وەربگیرێتەوە، ئەویش بەهۆی تایبەتمەندییەك کە زانستی ئەمڕۆ دەریخستووە کە مێش خۆراکەکەی لە دەرەوەی ریخۆڵەکانی هەرسدەکات لەرێی کۆمەڵێك ئەنزیمی هەرسکەر کە لەگەڵ لیکەکەی دەیڕژێت، پاشان دوای هەرسبوونی وبوونی بەشلەیەك هەڵدەستێت بە هەڵمژینی لەدەمیەوە.

## راستیی زانستیی:

وەك ووتمان ووتەی پەروەردگار ﴿وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ﴾ واتە: وەئەگەر مێشێك شتێکیان لێبفڕێنێت ناتوانن لێی وەرگرنەوە ولێی بسێننەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مێش لە دەرەوەی لەشی خۆراکەکەی هەرس دەکات، کە پاشان لەدەمیەوە دەیمژێت ولەرێی سیستەمی هەرسکردنەوە دەگوێزرێتەوە بۆناو سوڕی خوێن ودواتر دەچێت بۆ سیستەمەکانی لەش

وخانــەکانی ووەك ووزە بەکاریـدێنن لـە فـڕین ودروسـتکردنی خانــە وشـانەی نـوێ لەلەشـیدا، وپاشماوەکـەی فـڕێ دەدرێتــە دەرەوەی لـەش، لێـرەوە دەبیـنین ئـەو خۆراکە هەر لە دەرەوەی لەشی پێکهاتەکەی دەگۆرێـت وشـیدەبێتەوە ودواتـر بـە هەموو لەشیدا بڵاودەبێتەوە، ئـیتر کـێ دەتوانێـت وچ هۆکارێـك هەیـە کـە بتـوانین بەهۆیەوە ئەو خۆراکە وەربگرینەوە؟! **بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی لاپەڕە** (٣٨١)

مــێش لــەرووی توێکــاریی وکارئەندامزانییــەوە پێکهاتەیــەکی زۆر ئــاڵۆز وخۆگونجـانێکی بێوێنـەی هەیـە لەگـەڵ دەوروبەریـدا، ئەمـە بەرپـەرچـی بـوونی رێکەوتی کوێرانە دەداتەوە لە دروستبوونی وئامادەکردنی بۆ ژیانی تایبەتی خۆی، بەڵکو بەڵگەیەکە لەسەر گەورەیی دەسەلات ودانایی وزانـایی دروسـتکەرەکەی کـە پـەروەردگاری کاربەجێیـە، لەسـەرەتادا مێش هەڵدەسـتێت بـە پشـکنینی خـۆراك لەرێی کۆمەڵێك چاوی ئاڵۆزەوە لەگەڵ چەندین هۆکـاری کیمیـاییش کـە بەهۆیـەوە شوێنی خۆراك دەدۆزێتەوە.

پاشـان ئەوئەندامانـەی بـۆ فـڕین پێویسـتیەتی ئامـادە دەکـات، دواتـر بـاری ئامادەباشی بۆ فڕین وەردەگرێت بە رێك کردنەوەی ئەندامەکانی هاوسەنگیی لەش لەبەشی پێشەوەی لەشیدا، لەکۆتاییدا پێوانەی گۆشەی هەسـتان دەکـات بەپشـت بەستن بەرێڕەوی با کە پێوانەی دەکات بەپشت بەستن بەو هەستەوەرانەی لەسەر شـاخەکانی هەسـتکردن لەسـەریدا هـەن، ودەفرێـت بـەهۆی باڵەکانیـەوە بـەرەو خۆراکەکە، کـە دەتوانێـت خێرایـی فرینـی زیـاد بکـات تـا ڕاددەی ١٠کیلۆمـەتر لـە چرکەیەکدا ئەگـەر پێویسـت بکـات، هەموئـەم کـردار ومیکانیزمانـەی باسـمانکرد تەنها ١بەش لە ١٠٠بەشی چرکەیەك دەخایەنێت.

لەکاتی فرینی لەهەوادا بەرێڕەوێکی پێچاوپێچدا دەفرێت کە ئەستەمی دەکـات لەسەر مێرووە راوکەرەکان کە بتوانن راوی بکەن وبیخۆن، مێش نازنـاوی پسـپۆری فرینی بەهلەوانی یان پێچاوپێچی لێنراوە، کە دەشـتوانێت بەشـێوەیەکی سـتوونی

له شوێنی وەستانی بەرز ببێتەوە وبفڕێت، هەروەها دەتوانێت بەسەرکەوتویی بنیشێتەوە لەسەر هەموو ڕووەیەك هەرچەندە لێژبێت تەنانەت ئەگەر سەقفیش بێت، چونکە قاچەکانی ئامادەکراون بۆ خۆقایم کردن بە قورسییەك زۆر لەکێشی خۆی زیاتربێت، لەسەر کۆتایی پێکانی چەند کوشنێك هەیە کە ماددەیەکی لینج دەردەدەن هەرکاتێك لەسەر سەقفێك بنیشێتەوە، مێشەکە هەڵدەستێت بەدرێژ کردنی قاچەکانی بەرەو سەقفەکە کاتێك لێی نزیك دەبێتەوە، هەرکاتێکیش قاچی بەر سەقفەکە بکەوێت پێچی پێدەدا وخۆی دەگرێت بە سەقفەکەوە.




مێشی ناوماڵ ٢باڵی تەنکی هەیە کە لەکاتی فڕیندا بەرەوپێشەوە ودواوە دەجووڵێن لەسەر یەك تەوەرە ولەهەمان کاتدا، لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانێت باڵێکیان بەراددەیەکی زیاتر لەوی تریان بەکاربێنێت کە ئەمەیە وای لێدەکات بتوانێت بەپێچاوپێچی بفڕێت وخۆی بەدوور بگرێت لەنێچیربی، مێش توانای لەرادده بەدەری بۆ فڕین وەردەگرێت لە ئەندازەی ناوازەی باڵەکانی، کۆتایی باڵەکانی ولوولەکانی خوێن لەسەری داپۆشراوان بەچەند هەستەوەرێکی زۆر وورد

که بەهۆیانەوە دەتوانێت ڕێڕەوی هەوا وفشارە میکانیکییەکان لەکاتی هەستان ونیشتنەوە دیاری بکات، هەستەوەرەکانی ژێر باڵەکانی ولەسەریدا هەڵدەستن بگواستنەوەی زانیارییەکانی فڕین بۆ دەماغی، کە ئەگەر مێرووەکە لەکاتی فڕینیدا دووچاری شەپۆلێکی هەوای نوێ ببێت یەکسەر ئەم هەستەوەرانە هەڵدەستن بەگواستنەوەی زانیارییە نوێکان بۆ دەماغ، کە لەسەر بنەمای ئەم زانیارییە نوێیانە ماسولکەکان هەڵدەستن بە ڕێنمایی کردنی باڵەکان بەرەو ڕێڕەوە نوێکە، بەم شێوەیە مێشەکە دەتوانێت هەست بە گۆڕانکارییەکانی دەوروبەری بکات لەکاتی فڕیندا وهەست بە گۆڕانکاریی ڕێڕەوی هەوا بکات وبەهۆیەوە بتوانێت رابکات بەرەوشوێنێکی ئەمین لەکات وساتی گونجاودا.

چاوی مێش پێکدێت لە ٦٠٠٠ پێکهاتەی بینینی ٦پاڵویی کە پێیان دەووترێت گەندەچاو، هەریەکێك لەم گەندەچاوانە ئاراستەیەکی جیاواز وەردەگرێت بەومەبەستەی بتوانێت هەموولاکانی دەوروبەری ببینێت، واتە بواری بینینی دەوروبەر لەمێشدا فراوان دەبێت وبەگۆشەی ٣٦٠پلە دەتوانێت هەمووشتێك لە دەوروبەری ببینێت، ئەمە وای لێدەکات بەووردیی شوێنی خۆراك دیاری بکات وبەخێرایی بتوانێت بەئاراستەی پێچەوانەی هەر سەرچاوەیەکی مەترسیی بفڕێت.



ئەو وێنانە پێشتر پێکهاتەی چاوێکی مێشمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە لە هەزاران گەندەچاو پێکهاتووە، هەریەکێك لەم گەندەچاوانە بەهۆی ٨دەماری هەستەوەریی بینین بەستراوەتەوە بەمێشکەوە کەوای لێدەکات لەوپەڕی توانا وخێراییدا بێت بۆ بینینی وێنەکانی دەوروبەری، بەشێوەیەك لە هەر چرکەیەدا زیاتر لە ١٠٠ وێنە لێکدەداتەوە وکاری لەسەر دەکات! **بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی لاپەڕە** ( ٣٨٢ )

کێیە ئەم حیساباتە هەرە ووردانەی بۆ کردووە وبەم شێوە ناوازە تویکاری وکارئەندامزانیە ئامادەی کردووە ؟

مێشی میوە گەراکانی لەناو میوەکاندا دادەنێت بۆ ئەوەی گەراکان دوای تروکانیان لەسەر ئەومیوانە بژین، زۆرجار ئەومیوانە دەکەونە سەرزەوی وگەراکان سووڕی ژیانیان لەناوخاکدا تەواو دەکەن.

بینراوە لێکچوونێکی زۆر هەیە لەنێوان جیناتی مێشی میوە وجیناتی مرۆڤدا، ولێکۆڵینەوەیان بوارێکی فراوان دەکاتەوە بۆ خزمەت کردنی مرۆڤایەتی بەمەبەستی چارەسەری نەخۆشییەکان بەتایبەتی شێرپەنجە.

(تۆماس هانت مۆرگان) لەسەرەتای سەدەی ٢٠دا یەکەم کەس بوو کە گرنگیی مێشی دۆزییەوە لە لێکۆڵینەوە بۆماوەییەکانی مرۆڤدا، لەوکاتەوە بۆ ماوەی ١٠٠ساڵ مێشی میوە لەلێکۆڵینەوە بۆماوەییەکانی تایبەت بەمرۆڤ بەکارهێنراوە لەبەر چەند هۆکارێك، لەوانە لێکچوونی لەگەڵ مرۆڤ لەزیاتر لە ٢٠جینی بۆماوەیی تایبەت بەسوتاندنی چەورییەکاندا، بینراوە کە کرداری دەرهێنانی ووزە لە چەورییەکانەوە لەمێشدا تاڕادەیەکی زۆر لەلەشی مرۆڤ دەچێت، ئەمەش دەرگایەکی باشە بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرە ونەخۆشییەکانی جگەر، خانەکانی هەندێك جۆری مێشی میوە تەنها ٣جووت کرۆمۆسۆمی گەورە وروون لەڕووی میکرۆسکۆبییەوە لەخۆدەگرێت، لەکاتێکدا لە مرۆڤدا ٢٣جووتە، کە ئەمە لێکۆڵینەوەیان ئاسانتر دەکات، لەهۆکارەکانی تری بەکارهێنانی مێشی میوە لە توێژینەوە بۆماوەییەکاندا:




التشابه الجيني بين الإنسان وذبابة الفاكهة

١- قـــــەبارەیان زۆر بچـــووکە وتەمـــەنیان کورتـــە کـــە وادەکـــات لێکۆڵینەوەی چەند نەوەیـەکی یـەك لەدوای یەکی ئاسان بێت.

٢- زۆر بـــــــــەخێرایی زاووزێ دەکات چونکە سـووڕی ژیـانی لـە ٢ هەفتـە تێناپـەڕێت لەگـەڵ ئاسـانیی بەخێوکردنیان وکەمیی تێچووەکەی وزۆر کـــەمیش نەخۆشـــی بـــۆ مـــرۆڤ دەگوێزێتەوە.

٣- کرۆمۆســــۆم وجینــــەکانی گـــــەورە وســـــادە وئاســـــانن بـــــۆ لێکۆڵینەوە.

٤- لێکچوونە زۆرە جینییەکـەی لەگەڵ مرۆڤدا.

مێینەی مێش لەشەڕکردندا پشت دەبەستێت بـەمانۆڕ وخـۆلادان، ونێرینەکـەی پشتدەبەستێت بـە هەڵپـە وخێرایـی ولـەناکاویی لەهێرشـدا، کـە دەتوانرێـت ئـەم ئوسلوبی جەنگە لەلای هەردووکیان بگۆڕدرێت بەگۆڕینی جینێکی بەرپرسیار لـەم هەڵسوکەوتە، واتە دەتوانرێت سیفاتەکانیان بگۆڕدرێت.

جینێکی تایبەتی لەمێشدا دۆزراوەتـەوە کـە لەوجینـە دەچێت کـە لـە مرۆڤـدا بەرپرسیارە لە پیربوونی زوو وناوەخت، ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێت کـە دەتوانرێـت هۆکارەکـانی زوو پیربـوونی مـرۆڤ پـەکبخرێت بـە لێکۆڵینـەوەی بۆمـاوەیی مـێش، هـــەروەها تـــوانراوە پرۆتینێکـــی گـــرنگ بـــۆ گەشـــەی کۆرپەلـــەکانی مێشـــی میـــوە جیابکرێتەوە کە یارمـەتی شـیردەرەکان دەدات لـە سـاڕێژبوونی برینـەکانیان، کـە

ئەمە ئاسۆیەکی نوێ دەکاتەوە سەبارەت بە میکانیزمی سارێژبوونی برینەکان لەلای مرۆڤ، مێشی میوە دەتوانێت یارمەتی دۆزینەوەی چەندین پێکهاتەی نوێ بدات کە چالاکیی لەش زیاد دەکەن لەدژی ماددە ژەهرییەکان، ئەمە یارمەتی دۆزینەوەی چارەسەری شێرپەنجە دەدات.

کەواتە مێش گونجاوترینە لە توێژینەوە بۆماوەییەکانی تایبەت بەمرۆڤ، بەڵام بۆ ماوەی چەندین ساڵ کە توێژینەوە لەسەر مێشی میوە کراوە وگۆڕانکاریی جینیی وبازدانیان تێدا دروستکراوە، ئەمە بووەتە هۆی پەیدابوونی زیاتر لە ٤٠٠ جۆری نوێ کە هەموویان شێواو ونەزۆکن و وەچە ناخەنەوە.

پێش ئەوەی زانستی بۆماوەزانی پەیدابێت وتوێژینەوەکان لەبواری وەبەرهێنان وگواستنەوەی سیفاتەکان لەمرۆدا ببێتە واقعێکی هەستپێکراوقورئانی پیرۆز پێش ١٤٠٠ساڵ لەپایەی پێغەمبەرایەتیدا ئاماژەیداوە بە هەوڵەکانی مرۆڤ بۆ دروستکردنی مێش ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِاجْتَمَعُوا لَهُ﴾ (الحج:٧٣)، بەکارهێنانی ووشەی (ذُبَاب) کە مانای کۆیە ئەوە دەگەیەنێت کە مێش بەهەردوو رەگەزەکەی لەوانەیە گونجاوبێت بۆ لێکۆڵینەوە بۆماوەییەکان، هەموو هەوڵەکانیش بۆ دروستکردنی خانەیەکی لەشی مێش شکستی هێناوە، چ جای سیستەمەکانی لەشی مێش کە لەوپەڕی ئاڵۆزی ورێکخراوەیی وتوانای کارکردندایە، یان بەرهەم هێنانی مێشێکی نوێ کە توانای ژیان وزاووزێی هەبێت.

## رووی ئیعجاز:

توێژینەوە زانستییە درێژخایەن وهەمە لایەنەکان ئەوەیان سەلماندووە کە ناتوانرێت ئەوەی مێش دەیبات لێی وەربگیرێتەوە، بەهۆی میکانیزمی گۆڕینی پێکهاتەی ئەوخۆراکانەی دەچێتەسەری وهەرسکردنیان،ئەم دەقە قورئانییە پێش ١٤٠٠ساڵ هاتووە لەکاتێکدا مەحاڵ بووە مرۆڤەکان ئەوراستییە بزانن کە تەنها لە سەدەی بیستەمدا بۆ مرۆڤەکان روونبووەوە.

ئەمەش نموونەیەکی ناوازەی ئیعجازی زانستییە لە قورئان وسوننەتدا.

# مێشووله

پەروەردگار دەفەرموێت:﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِ كَثِيرًا وَيَهْدِي بِهِ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلَّا الْفَاسِقِينَ﴾ (البقرة:٢٦) واتە:بێگومان خوا شەرم ناكات بەوەی كە نموونەیەك بهێنێتەوە بە مێشووله وبچووكتر لەویش، ئەمجا ئەوانەی باوەڕدارن چاكدەزانن كە ئەو نموونە هێنانەوەیە راست ودروستە لە پەروەردگاریانەوە، ئەوانەش كە بێباوەڕن دەڵێن خوا چی وویستووە بەم نموونە هێنانەوەیە، زۆر كەسی پێگومڕا دەكات، وڕێنموونی زۆر كەسیشی پێدەكات، وگومڕا ناكات بەو نموونە هێنانەوەیە مەگەر بەدكاران نەبێت.

لەم ووتەیەی پەروەردگاردا گرنگیی مێشووله ومەترسیی لەسەر ژیانی مرۆڤ روونكراوەتەوە، كە لەوانەیە مرۆڤ بە بچووك وبێنرخی بزانێت، هەروەها ئامارەی تێدایە بۆ بوونی لەوبچووكتر ومەترسیدارتر [١٣].

## راستییە زانستییەكان:

لەم دەقەدا ئاماژەی تێدایە بۆ ئەونەخۆشییەكانی كە مێشووله لەوانەیە دروستی بكات وئاشكرا كردنی ئەم راستییە پێش دۆزینەوەی ووردبین لەسەدەی حەڤدەیەمدا وناسینی زیندەوەرە ووردەكانی وەك مشەخۆرەكان ومیكرۆبەكان وكەڕووەكان وڤایرۆسەكان، كە ئەم ئاماژەیە لەهیچ سەرچاوەیەكی تری نیگادا

---

١٣ ئیمامی (الطبري وابن كثیر) دەڵێن: لە ماناكەیدا ٢ را هەیە: یان مەبەستی لەو بچووكترە یان لەو گەورەتر ، (الكسائي وابوعبیدة وغەیری ئەمانیش) دەڵێن: واتە لەو بچووكتر، بۆ نموونە: لە زمانی عەرەبیدا كە دەپرسیت: (أتراه قصیرا) واتە: ئایا تۆ ئەوكەسە بە كورت دەبینیت؟ وەڵامەكەی دەبێت بە: (أو فوق ذلك) واتە: لەوە كورتترە كە دەیبینیت.

نەهاتووە پێش قورئـان، لێـرەدا نموونەیـەکی ئاشـکرای بـەرزیی قورئـان وخـۆدوور خستنی هەیە لـە بینینـی شـتەکان بەشـێوەیەکی نیسـبیی، وخـۆدوور خسـتنی لـە بۆچوونە باوە هەڵەکان، لـە سـەردەمی دابـەزینی قورئانـدا تـەنها ئـەوە دەربـارەی مێشوولە دەزانرا کە بچووك وبێبایەخە، وبەشەرمیان دەزانی باسی بکـەن لەبابەتـە گرنگەکاندا وهیچ گرنگییەکی پێنەدەدرا وباسنەدەکرا، ئیتر لێـرەوە مێشـوولە وەك نموونەیەکی بچووکی وبێبایەخی تەواوبووکاتێك قورئـان مەترسـییەکەی دەرخسـت (کـە لـە کاتـەدا گوێبیسـتەکانی قورئـان نەیانـدەزانی)، دەریخسـت کـە مێشـوولە بچووکترین شـت نییـە وەك وایانـدەزانی، ئەمـەش پـێش دۆزینـەوەی ووردبینـەکان وناسینی نەخۆشییە مەترسیدارەکان، روونیکردەوە کە زیندەوەری بچووکتر هەیـە کە وەك ئەو مەترسـیدارن وچـەندین جیهـانی زینـدەوەری وورد ونـەبینراو بوونیـان هەیە، لێرەدا قورئان ئاسۆی زانیاریی گوێگرەکانی تا چەندین سەدە تێپەڕاندووە، وپـەردەی لەسـەر نـەزانراوەکان بەیـەکجاریی هەڵداوەتـەوە. **بڕوانـە وێنـە ڕەنگاوڕەنگەکانی لاپەڕە** (٣٨٣-٣٨٤).

ئیمـامی موفەسـیر (الـرازي) دەڵێـت: مەبەسـتی لـە (فمـا فوقهـا) ئەوەیـە کـە لەوبچووکترە، لێکۆڵەرەوەکانیش بەلای ئەم مانایەدا چوون کـە وتوویانە:مەبەسـت لێرەدا ئەوەیـە کـە پـەروەردگار ئاسـاییە لای شـتی بچـووك بکـات بەنموونـە، لـەم شوێنەشدا ئەوەی دووەم جار بەدوای شتی یەکەمی بچـووکدا باسـدەکرێت دەبێـت لەوبچوکتربێت، هەرشتێکیش هەتا بچـووکتربێت دۆزینـەوەی نهێنییـەکانی قورسـتر دەبێــت، کــە ئەگــەر کۆتابێــت لەبچــووکیدا ئەوکاتــە تــەنها پــەروەردگار هەموونهێنییــەکانی دەزانێــت، لێــرەوە ئــەم نموونــە هێنانەوەیــە بەشــتە بچــووکترینەکان بــەهێزتر دەبێـت لــە دەرخســتنی کـامڵیی دانـایی وتوانـای دروستکەرەکەی لە شتە گەورەترەکان.

هـەرکاتێکیش ووتـرا ئـەم شـتە لەسـەرووئەوەوەیە لەبچووکیدا مەبەسـت پێـی لەوبچووکترە، (الماوردي) دەڵێت:(فما فوقهـا) واتـە لەبچـووکیدا چـونکە مەبەسـت

پێی بچووکییە، (الآلوسي)یش دەڵێت:ئەوزیادەیەی لەمانادا کە ئەولێکچوواندنە مەبەستێتی بریتییە لە بچووکێتی و ووردێتی، چونکە مەبەستی لەبچووکەوەیە بۆ بچووکتر.

هەروەها (السعدي) دەڵێت: ئەو مانایەی ئەم ئایەتە مەبەستێتی بریتییە لە بچووکی وبێنرخی، واتە لەبچووکەوە دادەبەزێت بۆ بچووکتر، ناشبێت بڵێین چۆن نموونە بە لەمێشوولە بچووکتر دێنێتەوە؟ کە مێشوولە کۆتایە لە بچووکیدا! چونکە ئایەتەکە ماناکە تەواو دەکات کە دەڵێت: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ ئەمە وایان لێدەکات لەم بابەتە تێبڕوانن ولێبکۆڵنەوە، کە ئەگەر بۆیان دەرکەوت ئەوەی مەبەستێتی چییە بەروونی، دەبێتە هۆی زیاد بوونی ئیمانیان، بەڵام لەهەمان کاتیشدا باوەڕیان وایە ئەوەی باسی کردووە حەق وراستییە، ئەگەر تەنانەت راستییەکەشیان بۆ دەرنەکەوێت، چونکە دەزانن پەروەردگار بەهەوانتە ئەم نموونەیەی نەهێناوەتەوە بەڵکو لەبەر حیکمەتێکی گەورەیە.

ئێمە لەمڕۆدا بەپشت بەستن بە دۆزینەوە نوێکان حیکمەتەکەیمان بۆ روونبووەتەوە، هەروەها (نوري الجاوي) لە تەفسیری (مراح لبيد)دا دەڵێت: دروست نییە بابەتی لە مێشوولە بچووکتر رەتبکرێتەوە چونکە بەهەوانتە باسنەکراوە، ونهێنی تێدایە.



زانینی رۆڵی مێشووله له گواستنهوهی مشهخۆری مهلاریا تهنها پێش سهرهتای سهدهی بیستهم دۆزرایهوه، کاتێك (ئهلفۆنس لاڤیران) مشهخۆری مهلاریای دۆزییهوه له ساڵی (١٨٨٠)دا، ولهساڵی (١٨٩٧)دا (سێر رۆناڵدز رۆز) ئاشكرای كرد كه مهلاریا لهرێی مێشوولهی (ئهنۆفیلس)وه دهگوازرێتهوه، ولهساڵی (١٨٩٨)دا تیمێكی توێژهران رۆڵی مێشوولهیان سهلماند له گواستنهوهی نهخۆشی مهلاریادا، زاراوهی (مهلاریا) ووشهیهكی ئیتاڵییه بهمانای ههوای پیسبوودێت، كه تا ئهمرۆش بهكاردێت وئهو بۆچوونه مێژووییه ههڵهیهمان وهبیر دێنێتهوه كه وایاندهزانی نهخۆشییهكه لهرێی ههوای پیسهوه بۆ مرۆڤ دهگوێزرێتهوه، ئهویش پێش ئهوهی رۆڵی مێشووله بزانرێت له گواستنهوهی مشهخۆره ووردهكهی دروستكهری نهخۆشییهكه [١٤].

هۆكاری نهخۆشی تای زهرد (Yellow Fever) كه ساڵانه ههزاران كهسی پێدهمرێت تا سهرهتای سهدهی بیستهم نهزانرابوو، لهساڵی (١٨٨١) كارلۆس فینلای گریمانهی گواستنهوهی لهلایهن مێشوولهوه راگهیاند، و(مهیجهر والتهر) له ساڵی (١٩٠٠)دا دووپاتی كردهوه، وله سهرهتای سهدهی بیستهم (ویلیام گۆرگاس) سهلماندی لهرێی مێشوولهی (ئهیدس)هوه دهگوێزرێتهوه، كاتێكیش

---

١٤ مێشووله زیاتر له ٣٠٠٠ جۆری ههیه كه له ههموناوچهكانی جیهاندا بڵاوبوونهتهوه، بهڵام زیاتر له ناوچه كهمهرهیی وسهروووخوار كهمهرهیی زهوی بڵاوترن، تهنها مێینهی مێشوله لهسهر خوێنی مرۆڤ وئاژهڵان دهژی، مێشوله شوێنی خانهخوێكهی لهرێی ئهوگهنده مووه ههستیارانهی لهسهر شاخه ههستهوهرهكانی بوونیان ههیه دهدۆزێتهوه، كه ٢ جۆرن ههستهوهری میكانیكی (MechanicalReceptors) وههستهوهری كیمیایی (Chemical receptors)، مێشوله كاتێك مرۆڤ دهگهزێت وخوێنهكهی دهمژێتهناو لووته درێژهكهیهوه سهرهتا ههڵدهستێت به شیكاریی بۆ خوێنهكه له لووتیدا كه وهك كارگهیهكی شیكاریی خوێن كاردهكات وگونجاویی ئهوخوێنه لهگهڵ لهشیدا دیاریدهكات، دواتر ههڵدهستێت بهمژینی خوێنهكه بۆناولهشی وهك خۆراك. بڕوانه: الإعجاز العلمي في قوله تعالى: إن الله لا يستحي أن يضرب مثلا بعوضة فما فوقها، للأستاذ الدكتور مصطفى إبراهيم حسن – من أبحاث المؤتمر العالمي العاشر للإعجاز العلمي – الهيئة العالمية للإعجاز العلمي.

مێشـــوولەکە قەلاچـــۆکرا لـــەکاتی هەڵکەنـــدنی کـــەناڵی پەنـــەما لـــەنێوان هەردووئەمریکاکەدا ئەمە بووەهۆی کەمبوونەوەی نەخۆشییەکە لەنێوان کرێکارانی هەڵکەندنی کەناڵەکەدا، دواتر (پاتریك مانسۆن) مشەخۆری (فیلاریـا)ی دۆزییـەوە وزانـرا کـە لەڕێگـەی مێشـوولەی (کیـولیکس)وە بڵاودەبێتـەوە، ئەمـە ودەیـان نەخۆشی تر کە مێشووله مشەخۆرەکانیان کە لەخۆی زۆر بچووکترن لەسەر لەشی هەڵدەگرێت ودواتر لەکەسی تووشبووەوە دەیگوێزێتەوە بۆ کەسانی تەندروست.

## رووی ئیعجاز:

پەروەردگار نموونەی بە مێشووله هێناوەتەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە قەبارەی زۆر بچـووکە وبـەبێنرخ لەلایـەن مرۆڤەکانـەوە سـەیر دەکرێـت، نموونـە هێنانـەوە بـە مێشووله لەسیاقی تەحەددایە بەزانستێك کە هـیچ کەسـێك لەسـەردەمی دابـەزینی وەحیـدا نهێنییەکـەی نـەزانیوە، لێـرەدا ئاماژەیـەك هەیـە بـۆ مەترسـیی ئـەم زیندەوەرە لەسەر ژیانی ئەوانـەی قورئـان گفتووگۆی لەگـەڵ کـردوون، دۆزینـەوە زانستییەکانیش لەمبوارەدا یەکانگیریی مانای دەقە قورئانییەکەی بۆ سەلماندین.

بـەکارهێنانی ئـەو راسـتییە زانسـتیانەی لەلایـەن غـەیری موسـوڵمانانەوە دۆزراونەتـەوە بەتایبـەتی دەربـارەی مێشـووله و زیانـەکانی، ئـەویش بـۆ بەڵگـە هێنانەوە لەسەر راستی قورئان ئەوەندەی تر ئیعجـازی زانسـتیی قورئـان بـەهێزتر دەکات، چونکە ئەگـەر ئـەم راستیانە لەلایـەن موسـوڵمانانەوە بدۆزرانایـەوە ئـەوا دەیانووت خۆتان هەڵتان بەستووە بۆ بەرگری کردن لـە ئاینەکـەتان، بـەڵام کاتێـك نەیاران ئەو شایەتیە دەدەن ئـەوا گومـانی تێدا نامێنێت (والفضـل مـا شـهدت بـه الاعداء)، لەلایەکی تـرەوە نابێـت ئێمـەی موسـوڵمان خەمسـارد بـین وتـەنها پشـت ببەسـتین بـەو دۆزینەوانـەی غـەیری موسـوڵمان ئـەنجامی دەدەن بـۆ سـەلماندنی راستییەکانی قورئان وسوننەت، بەڵکو دەبێت خۆمـان هەوڵبـدەین بـە ئەنجامـدانی توێژینەوەی زانستی. **بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی لاپەڕە ( ٣٨٦ )**

هێنانەوەی نموونەی مێشوولە بۆ دەرخستنی گەورەیی دەسەڵاتی خودا وبێتوانایی نەیارەکانی لەلوتکەی تەحەددا دایە بۆ بێباوەڕان، لەهەمان کاتدا ئیعجازێکی زانستی درەوشاوەش لەخۆدەگرێت [15].

✿✿✿

---

١٥ لایەنەکانی ئیعجازی زانستی لە مێشوولەدا ئەمانەن:

١- ووشەی (بعوضة) لە ئایەتەکەدا هاتووە بە ڕەگەزی مێینە، کە زانست سەلماندوویەتی مێینەکان خوێنی مرۆڤ دەمژن وکاریگەرییان لەسەری هەیە، بەڵام نێرینەکان لەسەر خوێن ناژین.

٢- توانای بۆ دیاریکردنی خانەخوێکەی کە مرۆڤ یان ئاژەڵ بێت.

٣- توانای بۆ دیاریکردنی ئاوکە شیرین یان سوێربێت بە مەبەستی دانانی گەراکانی.

٤- توانای یەك بەیەکی خانەکانی گەدەی مێشوولە بۆ هەستان بەهەمووکردارە زیندەگییەکانی سەرجەم خانەکانی گەدەی مرۆڤ لە: ڕژاندنی ئەنزیمەکان، ومژین، ودروستکردن وڕژاندنی ئەوپرۆتین وئەنزیمانەی دەتوانن هۆکارە جیاوازەکانی نەخۆشی لەناوبەرن وەك: بەکتریا وکەڕووەکان وڤایرۆسەکان.

٥- توانای خانەکانی مێشوولە بۆ لەناوبردنی ڤایرۆسی (ئەیدز) وڤایرۆسی هەوکردنی جگەر لەجۆری (C).

٦- توانای بۆ دانانی گەرای زۆر (زیاتر لە ٣٠٠ دانە) وتوانای فڕین کە بواری داوەتێ نزیکەی ١٥٠ ملیۆن ساڵ لەسەر زەوی بمێنێتەوە.

٧- چەندین نەخۆشی بۆ مرۆڤ دەگوێزێتەوە لەڕێی گواستنەوەی مشەخۆر وبەکتریا وڤایرۆسەکان، وەك نەخۆشی: مەلاریا وفیلاریا وهەوکردنی مێشك وتای زەرد و.......تاد.

ئەگەر ووتەی پەروەردگار (فما فوقها) بە لە مێشوولە بچووکتر وەربگرین، توێژینەوە نوێکان گەشتوونەتە ئەو ڕاستییەی کە چەندین زیندەوەری تر لەسەر لەش ولەناو گەدەی مێشوولەدا دەژین، کە پەیوەندییەکی زۆر ئاڵۆز بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە. **بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی لاپەڕە (٢٨٢)**

لە توێژینەوەیەکی تایبەت بەم بوارە دەرکەوت کە ئەم زیندەوەرە ووردانە لەناولیکەرژێن وگەدەی مێشوولەدا دەژین: لەوانە ١٧ جۆری بەکتریا و ٢ جۆری کەڕوو و ٦ جۆری ڤایرۆس و ٢ جۆری کرم، کە هەندێکیان گرنگن بۆ ژیانی وهەندێکیان زیانبەخشن، هەروەها هەندێك زیندەوەری تر دۆزرانەوە کە لەسەر لەشی مێشوولەکە لە ناوچەکانی سنگ وسك دەژین ودەبنەهۆی لەناوبردنی. (بڕوانە: الإعجاز العلمي في قوله تعالى: إن الله لا يستحي أن يضرب مثلا بعوضة فما فوقها، للأستاذ الدكتور مصطفى إبراهيم حسن – من أبحاث المؤتمر العالمي العاشر للإعجاز العلمي – الهيئة العالمية للإعجاز العلمي).

















**هەندێك لەو نەخۆشییانەی بەهۆی مێشولەوە بڵاودەبنەوە**

# پیریی

پـەروەردگار دەفـەرموێت:﴿وَمَـن نُعَمِّـرْهُ نُنَكِّسْـهُ فِـي الْخَلْـقِ أَفَـلَا يَعْقِلُـونَ﴾ (يس:٦٨) واتـە: ئـەوەی تەمـەنی درێژدەکـەین پێکهاتـەی لاواز دەکـەین (لـە هێـز وچالاکییەوە بـۆ لاوازیـی وکـەمتوانایی دەچـێت)، ئـیتر بـۆ بیرناکەنـەوە وژیرییـان ناخەنەکار.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُـمَّ يَتَوَفَّـاكُمْ ۚ وَمِـنكُم مَّن يُـرَدُّ إِلَـى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئًا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾ (النحل:٧٠) واتـە: بێگومـان خـودا ئێـوەی دروسـت کـردووە وپاشـان دەتانمرێنێـت، وە هەنـدێك لـە ئێـوە زۆر پیردەبێت تا دەگەڕێنرێتەوە بۆ لاوازترینی تەمەن، بۆ ئـەوەی لـەپاش زانـین هـیچ نەزانێت، بەڕاستی خودا زانای بەتوانایە.

﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَـلَ مِـن بَعْـدِ قُـوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۖ وَهُوَالْعَلِيمُ الْقَدِيرُ﴾ (الروم:٥٤) واتە: خـوا زاتێکـە ئێوەی دروست کردووە لە لاوازیی، پاشان دوای لاوازیی بـەهێزی کـردوون، لـەدوای بەهێزکردنتان لاواز وپیرتان دەکاتەوە، خودا هەرچی بوێت دروستی دەکات، وهـەر ئەوە زانای بەدەسەڵات.

﴿هُوَالَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُـمَّ لِتَبْلُغُـوا أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا شُيُوخًا ۚ وَمِنكُم مَّن يُتَـوَفَّى مِـن قَبْـلُ ۖ وَلِتَبْلُغُـوا أَجَلًـا مُّسَـمًّى وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ (غافر:٦٧) واتە: ئەو خوایەیە کە ئێوەی لەخاك دروست کردووە، لەپاشان لە دڵۆپێك ئاو، پاشان لە پارچە خوێنێکی هەڵواسراو، پاشان بـە سـاوایی دەتان هێنێتەدەر لەسکی دایکتان، لەپاشان دەگەنە تینی هێز ولاویتان، لەپاشـان پیردەبن، وە هەندێکتان پێش پیربوون دەمرێنرێن، هـەتا دەگەنـە ئـەو کاتـەی کـە بۆتان دیاریکراوە، ئەمەش بۆ ئەوەی کە بیربکەنەوە.

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ ۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِن بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا ۚ وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾ (الحج:٥).

واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە لە گوماندان دەربارەی زیندووبوونەوە، ئەوە بزانن بەڕاستی ئێمە ئێوەمان دروست کردووە لە خوڵ، پاشان نەوەکان لە نوتفەیەك دروست دەبن دواتر دەبێتە خۆهەڵواسەرەیەك، دوای ئەوە دەبێتە گۆشتپارەیەك کە هەندێکی شکڵ وشێوەی کێشراوە وهەندێکی دروستنەبووە بۆ ئەوەی روونی بکەینەوە بۆ ئێوە، وە لە منالدانەدا دەیهێڵینەوە ئەوکۆرپانەی کە بمانەوێت لەبار نەچێت تا کاتێکی دیاریکراو، پاشان لەسکی دایکتان دەرتاندێنین بەساوایی، پاشان گەورە دەبن تا دەگەنە تەواوی هێز وتواناتان وە لەم تەمەنەدا هەندێکتان دەمرێنرێن وهەندێکتان دەگەیەنرێنە ئەوپەڕی پیریی بۆ ئەوەی نەزانێ ولەبیری نەمێنێت هەرچی کە دەیزانی، وە زەوی لە زستاندا خامۆش وووشك وبێگیانە، جا کاتێك بارانمان بەسەردا باراند زەوی دەجووڵێت ودەلەرێتەوە ودەئاوسێت وڕووەکی لێدەڕوێ لەهەمووجۆرە گیا وگوڵێکی جوان.

ووتەی پەروەردگار ﴿وَمَن نُّعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ أَفَلَا يَعْقِلُونَ﴾ بریتییە لە گۆڕانی روخسار بەهۆی هەندێك گۆڕانکاریی سروشتییەوە لەکاتی پیریدا کە پەیوەستە بەتەمەنی مرۆڤەوە، تەنانەت ئەگەر هیچ نەخۆشییەکیش تووشی مرۆڤەکان نەبێت، ئەم گۆڕانکارییانە شکڵ وفرمانەکان دەگرێتەوە وتووشی هەمووخانەکانی لەش دەبێت، گرنگترین ئەوگۆڕانکارییانە بریتییە لە لەدەستدانی توانا ژیرییەکان بۆ فێربوون، وەك پەروەردگار دەفەرموێت:﴿وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئًا﴾ واتە: وە هەندێك لە ئێوە زۆر پیردەبێت تا

دەگەڕێنرێتــەوە بـۆ لاوازترینــی تەمــەن بـۆ ئـەوەی لـەپاش زانـین هـیچ نـەزانێت، هەروەها ئایەتی:﴿وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِن بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا﴾، وئایـەتی:﴿وَمَن نُّعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ أَفَلا يَعْقِلُونَ﴾، لـەم ئایەتـە پـیرۆزەدا پەروەردگار پێمـان رادەگەیـەنێت کـە ئەوکەسـەی تەمـەنی درێـژدەبێت پێکهاتـەی بـەرەوداڕمان دەچـێت، واتــە حـاڵی ئاوەژوودەبێتــەوە وتواناکـانی دەچـنە دواوە وبـەرەو بێهێزیـی ولاوازیـی دەچـێت، وەك ئـەو کەسـەی لێدێت کـە سـەرەو خـوار بووەتەوە.

ئــەم وەســفە ووردە زانیــاریی دەربــارەی حاڵــەتێکی گشــتگیر لــە مرۆڤــدا دەخاتەڕوو، لە داڕمان وهاتنە دواوە بەشێوەیەکی فـراوان کـە هـەموو گۆڕانکارییـە دیــار وشــاراوەکانی لــەش دەگرێتــەخۆ، ئــەویش لەبــەر بــەکارهێنانی زاراوەی گشتگیری (الخلق) کە هـەموو پێکهاتـە وچـالاکیی وفرمانـەکانی لـەش دەگرێتـەوە، لەکاتی هاتنە خوارەوەی قورئان لە سـەدەی حەوتـەم تـا چـەند سـەدەیەکی کـەم پـێش ئێسـتا تـەنها گۆڕانکارییـە روخسـارییەکانی دەرەوەی پیریـی دەزانـرا، کـە لەگەڵ بەدەستهاتنی تەکنەلۆجیاکان وپێشکەوتنی توێژینەوەکان ئەو گۆڕانکارییـە نهێنییانــەی لــەمبوارەدا دۆزرانــەوە لــەم وەســفە وورد وگشــتگیرەی قورئــان دەرنەچوون وبەتەواوەتی یەکیانگرتەوە.

## راستییە زانستییەکان:

یەکـەم کەسـێك درکـی بـەوەکرد کـە پیریـی بریتییـە لـە حاڵـەتێکی داڕمـانی فرمانەکان وکورتهێنانی جەستەیی وەك سـەرەنجامێکی سـەربەخۆ لەشـتی تـر کـە پەیوەندی بەتەمەنەوە هەیـە پزیشـکی فەرەنسـی شـارکۆت (Charcot) بـوو لـە سـاڵی (١٨٨١)دا، کــە تــەنها لــە ســەدەی بیســتەمدا زۆربــەی توێـژەرەوەکان قەناعەتیان بەمە کرد، بەڕاستی مایـەی سەرسـامییە کـە قورئـان پـێش ١٤ سـەدە گرنگی بەبابەتی پیریی داوە کە هاوشێوەی ئەمە لە ئاینەکانی تردا نابینیت غەیری

قورئان نەبێت، کە لەمڕۆدا زانینی نهێنییەکانی پیریی بەهۆی بەردەست بوونی هۆکارە زانستییەکان بریتییە لە شایەتیدانێك بۆ قورئان کە نیگای خوداییە.

پیریی (Senescence) بریتییە لە بارێکی پلە بەپلەی بەرەودوا چوونی پێکهاتەیی وفرمانیی جەستە کە حەتمییە ودەبێت رووبدات وتووشی هەمووئەندام وسیستم وشانە وخانەکانی لەش دەبێت، لێرەوە خانەکان توانایان بۆ خۆگونجاندن وپاراستنی هاوسەنگی بەرامبەر فشارەکان کەمدەبێتەوە.




هەمووزیندەوەرێك تووشی ئەمە دەبێت لەکاتی چوونە تەمەنەوە (Aging) بەپێی ماوەی تەمەنی تایبەت بەخۆی، هەربۆیە بۆچوونی نوێ ئەوەیە کە ئەمە حاڵەتێکی رووخاندنی خۆیی بەرنامە بۆدانراوە (Phenoptosis) کە رێگا خۆش دەکات بۆ نەوە نوێکان، وئەمە دەبێتەهۆی بەردەوام بوون ورەنگاو رەنگیی ژیان، کەواتە پیریی حاڵەتێکی نەخۆشی نییە بەڵکو بارێکە کە نەخۆشی تێیدا زۆر دەبێت ولەم بارەشدا دەبێتە پیرییەکی نەخۆشیدار (Senelity).

ووردەکارییەکانی ئەم بارە زانستێکی نوێ گرنگی پێدەدات کە پێیدەوترێت پیریناسی (Gerontology)، زۆرێك لە پسپۆران وایدەبینن کە پیری دیاردەیەکی زۆر ڕێکخراوە ولە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ بەرنامەیەکی بۆماوەیی گشتگیر بۆ هەموو زیندەوەرەکان کە جینەکان دەیهێننە بەرهەم، دەگونجێت هەندێك فاکتەری ناوخۆیی ودەرەکیی هەبێت پاڵ بە جینەکانەوە بنێت بۆ دروستکردنی ناوەختەی ئەوگۆڕانکارییانە، هەندێك فاکتەریش لەوانەیە ببنە خێراکردنی دەرکەوتنی نیشانەکانی پیری وەك نەخۆشییە درێژخایەنەکانی وەك:شەکرە وبەرز بوونەوەی فشاری خوێن.

هەندێك وای دەبینن کە پیری سەرەنجامی ئەوفاکتەرە رووخێنەرانەن کە تووشی لەش دەبن وەك: تیشکدانە گەردیلەییەکان (Radiation)، ورووداني بازدانەکان (Mutation) وکەڵەکە بوونی ماددە ئۆکسێنەرەکان ( Oxidizing Agents)ی ناو خواردەمەنییەکان وغەیری ئەمانیش، هەندێکی تر وایدەبینن کە سەرەنجامی زۆر بەکارهێنان وشرکردنی ئەندامەکان دەبێت وەك شڕکردن ودڕاندنی جل وبەرگ (Wear & Tear).

لەم پرۆسەیەدا ژێرمێشکە ڕژێن لەناوچەی ژێرسالامەس (Hypothalamus) بەشداری دەکات بە کەمکردنەوەی ڕژاندنی هۆرمۆنی گەشە کردن وهۆرمۆن جنسییەکان، گۆڕانکارییە ئەنزیمیی وبەرگرییەکان ونیشتن لەناوخانەکاندا سەرەنجامی پیرین نەك هۆکاری بن، توێژینەوە نوێکان زۆرتر بۆلای ئەوە دەچن کە لایەنی بۆماوەیی هۆکاریی سەرەکی ڕوودانی پیرییە، چونکە بینراوە لە دووانە لەیەکچووەکاندا کە یەك پێکهاتەی بۆماوەییان هەیە بەهەمان شێوە یەك درێژیی تەمەنیان هەیە، هەروەها نەوەکانی ئەو دایك وباوکانەی کە تەمەنیان درێژە بەهەمان شێوە ئەمانیش تەمەن درێژ دەردەچن لەچاو نەوەی ئەو دایك وباوکانەی تەمەنیان کورت بووە، هەروەها هەموو زیندەوەرێکیش تایبەتمەندە بە ژمارەیەکی دیاریکراوی جێگیر بۆ درێژیی تەمەنی.

ئەم وەسفە یەكانگیرە لەگەڵ واقیع ویەكدەگرێتەوە لەگەڵ چەندین هاوشێوەی وەسفكردنی قۆناغەكانی تەمەن وپیریی بەتایبەتی، لێرەدا تێبینی ووتەی (ابن منظور) دەكەین كە دەربارەی (ننكسه) دەڵێت: بریتییە لە سەرەوژێر كردنی شتێك، كە لێرەدا لە مەقامی وەسفی حاڵەتی مرۆڤ وتواناكانیدا هاتووە لە كۆتایی تەمەنیدا دوای ئەوەی لە قۆناغی گەنجیدا گەشتبووە ئەوپەڕی تواناكانی، هەربۆیە ئەم تەعبیرە بە فرمانی (نكس) لە ئایەتە پیرۆزەكەدا مانای هەڵگەڕانەوەی حاڵ لە پێكهاتەدا دەگەیەنێت، (أبوالسعود) دەڵێت: بەردەوام لاوازیی وكەمهێزیی وهاتنە دواوەی پێكهاتەی وگۆڕانی شكڵ ووێنەی زیاد دەكات، تا دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتێكی لێكچووبە حاڵەتی منداڵ لە لاوازیی جەستە وكەمیی عەقڵ وخاڵیبوون لە تێگەیشتن ولێكدانەوە، زاراوەی (الخلق) لێرەدا تەعبیرە لە پێكهاتە وئەندامەكانی، (ابن كثیر) دەڵێت: بریتییە لە لاوازیی لە پێكهاتەی لەشدا.

## لایەنی ئیعجازیی:

پیریی حاڵەتێكە كە تێیدا هەمووسیفاتەكان دەگۆڕێن ودێنەدواوە، كە دەتوانین وەسفی (التنكیس)ی بۆ بەكار بهێنین، هەواڵدانی قورئان دەربارەی حاڵەتی پیریی ولاوازیی كە هەموومرۆڤێك دەگرێتەوە بە شێوەیەكە هەموونیشانە دەرەكی وناوخۆییەكان دەگرێتەخۆ، بەفیعلیش لەمرۆدا دەركەوتووە كە پیریی تووشی هەموو ئەندامەكانی لەش دەبێت وتەگەرە دەخاتە بەردەم فرمانەكانی، وریێ خۆشدەكات بۆ تووشبوون بە چەندین نەخۆشی كە هاوەڵە لەگەڵ چوونە تەمەنەوە، لێرەدا قورئان نهێنییەكانی پێكهاتنی مرۆڤمان بۆ دەردەخات لە دەربڕینێكی دەرئاسادا كە دژایەتی راستییە شاراوەكان ناكات، ونەبووە هۆی بەریەككەوتنیش لەگەڵ زانیارییە باوەكانی سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئان.

# مردنی بەرنامە بۆدارێژراو

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ (٦٠) عَلَى أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ (٦١) ﴾ (الواقعة) واتە: (ئێمە لەناوتاندا مردنمان ئەندازە بۆداناوە، وکەس پێش دەسەڵاتی ئێمە ناکەوێت، ئێمە بەتواناین کە لەجیاتی ئێوە نەوەی تر بهێنین، ودروستتان بکەینەوە بەشێوەیەك کە هیچی لێنازانن)، هەروەها دەفەرموێت: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَالْعَزِيزُ الْغَفُور﴾ (الملك:٢) واتە: ئەوزاتەی کە مردن وژیانی دروستکردووە تا تاقیتان بکاتەوە کە کردەوەی کامتان چاکترە، وهەر ئەوە باڵادەست ولێخۆش بووە.

لە ووتەی پەروەردگاردا ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ﴾ ئاشکراکراوە کە مردن یاسا وئەندازەی بۆ دانراوە هەر لە سەرەتای دروستبوونی تاکەکاندا، بەپێی کاتێکی بەرنامە بۆدانراو کە تایبەتە بە مرۆڤایەتی، جا ئەگەر وویستی پەروەردگار نەبێت کە هەندێك جار کتوپڕ ژیانی مرۆڤەکە کۆتایی دێنێت بەهۆی ڕووداوێکی دیاریکراوەوە، ئەوا هەمووکەسێك بەرنامەیەك لە پێکهاتەیدایە کە سەرەنجام کۆتایی بەژیانی دەهێنێت.

هەرلێرەوە دەتوانین مانای دەربڕینی قورئانی:﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ﴾ بەوە لێکبدەینەوە کە مردن هەروەکوژیان دروستکراووبەرنامە بۆدانراوە، وهۆکارەکانی ژیان ومردن لەگەڵ دروستبوونی هەموزیندەوەرێکدا دروستدەبن، پێشخستنی (الموت–مردن) لە ئایەتەکەدا زۆر ڕێکوڕەوانە چونکە مردن ڕوودانی حەتمییە بەڵام ژیان گریمانەیە کە لەوانەیە ڕووبدات ولەوانەیە ڕوونەدات.

(محمد سيد طنطاوي) دەڵێت: مردن پێش ژیان خراوە چونکە مردن حەتمییە وبەزۆرە، بەهەمان شێوە لە ووتەی پەروەردگاردا هاتووە: ﴿وَأَنَّهُ هُوأَمَاتَ وَأَحْيَا﴾

(النجم:٤٤) واته: (وه بێگومان هەر ئەوه كه دەیانمرێنێ وزینووشیان دەكاتەوه)، كه (محمد الطاهر بن عاشور) دەربارەی دەڵێت: (لێرەدا مەبەست پێی عیبرەت هێنانەوەیه به مراندن چونكه عیبرەتی زیاتره)، هەروەها ووتەی پەروەردگار: ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ﴾ (البقرة:٢٨) واته: (لەكاتێكدا ئێوه بێگیانبوون وگیانی بەبەردا كردن) ئەوا ئایەتی: ﴿أَوَلَا يَذْكُرُ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْئًا﴾ (مریم:٦٧) واته: (ئەوه ئادەمیزاد بۆ بیرناكاتەوه كه بێگومان ئێمه لەسەرەتاوه ئەومان دروستكردووه كه ئەوشتێك نەبووه) تەفسیری دەكات، بەو ئیعتیبارەی كه زاراوەی مردن بەمانای نەبوونی ژیان دێت هەروەك چۆن نەبوونی ژیان لەخاكدا بە مردن ناوبراوه لەقورئاندا.

## راستییه زانستییەكان:

لەمرۆدا دەتوانین بەڵگه بهێنینەوه لەسەر ئەوەی هۆكارەكانی مردن لەسەر ئاستی خانەكان لەگەڵ هۆكارەكانی ژیاندا هاتوونەتەبوون لەگەڵ دروستبوونی یەكەم خانەی هەموزیندەوەرێكدا، هەروەك چۆن لە هەموخانەیەكدا چەندین پێكهاتە هەن كە هۆكارەكانی ژیان بۆ خانەكە دەستەبەر دەكەن وەك دەنكۆڵەكانی سەوزه پلاستید لە رووەكدا كە خۆراك دروست دەكەن وئەوئامێرانەی لە خانەكانی ئاژەڵاندا پرۆتین دروست دەكەن، بەهەمان شێوه چەند پێكهاتەیەك هەن كە ئەنزیمی لایزۆزۆم (Lysosome) لەخۆدەگرن كە دەبێتەهۆی شیكردنەوه وهەرسكردنی خانەكان لەكاتی بریندار بوون وپەككەوتنیدا.

لەسەر ئاستی جۆر دەتوانین بیسەلمێنین كە پیریی حاڵەتێكی بەرنامە بۆدانراوه (Predetermined) بەپێی بەرنامەیەكی بۆماوەیی دیاریكراوكە زانایی ودانایی لە دروستكراوەكاندا دەردەخات، لەوبەڵگانەش دۆزینەوەی حەددێك وئاستێك بۆ ژمارەی دابەشبوونەكانی خانەكانە، كە ناسراوه بە حەددی هەیفلیك (Hayflick limit). **بڕوانه وێنەكانی لاپەڕە (٣٨٧)**

هەروەها توێژینەوە زانستییە نوێکان پشتگیری ئەوە دەکەن کە پیریی تەنها روویەکی مردنی بەرنامە بۆدارێژراوە لە زیندەوەراندا، هەروەها دۆزینەوەی مردنی بەرنامە بۆدارێژراوی تەنۆلکەکانی ناوخانە ومایتۆکۆندریا چەند بەڵگەیەکی تری زیادکرد لەسەر ئەوەی کردارە زیندەگییەکان بە ئەندازەیکی حەکیمانە وبێوێنە بەرنامەیان بۆدانراوە، چونکە تەنۆلکەکانی ناوخانە ومایتۆکۆندریاکانی ناوخانە کاتێك سوودیان نامێنێت یان زیان دروستدەکەن مردنیان بەسەردا دێت لەناوخانەدا، هەروەها دۆزینەوەی مردنی بەرنامە بۆ دارێژراوی هەندێك خانە لەلەشدا ئەوەندەی تر بابەتەکەی سەلماند [١٦].

---

١٦ دەربارەی مردنی بەرنامەرێژکراو لەسەرەتای دروستبوونی مرۆڤ لەسکی دایکدا چەندین دۆزینەوەی نوێ ئەم بابەتەیان سەلماندووە وهاوئاهەنگییەکی بێوێنەیان لەنێوان ئایەتەکانی قورئان ودۆزینەوە نوێکاندا بۆ دەرخستووین:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَفَرَأَيْتُم مَّا تُمْنُونَ (٥٨) أَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ (٥٩) نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ (٦٠) عَلَى أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ (٦١) وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الْأُولَى فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ (٦٢)﴾ (الواقعە) واتە: ئایا نەتاندیوە ئەو مەنییەی کە دەیرێژن وئەندازەی دەکەن؟ ئایا ئێوە بەدی دێنن یان ئێمە بەدیهێنەرین؟! ئێمە مردنمان لە نێوانتاندا بەئەندازە داناوە، کەسیش پێشمان ناکەوێت، کە شێوەتان بگۆڕین و، بە شێوازێکی تر دروستتان بکەینەوە کە نایزانن، بێگومان گەشەکردنی سەرەتا ویەکەم جارتان زانیوە، دەی بۆ هیچ بیر ناکەنەوە؟!

ئایەتەکان سەرەتا بە مەنی دەستپێدەکات کە مردن لەو سەرەتایەی کۆرپەلەدا ئەندازەی بۆ دانراوە لە جینەکاندا کە لە زانستی ئەمڕۆدا پێیدەووترێت: مردنی ئەندازەکراو وبەرنامەرێژکراو (Programmed cell death or Apoptosis)، بەرنامەرێژ کردنی مردنی خانەکان لەکاتی پێویست ودیاریکراوی داهاتوودا روودەدات، ئەویش لەکاتی گەشەکردنی یەکەمی کۆرپەلەی مرۆڤ (النشأة الأولى)، لە ئایەتێکی تردا ئەندازەکردنی نوتفە لە کاتی دروستبونیدا باسدەکات ودەفەرموێت: ﴿مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ﴾ (عبس:١٩) واتە: (لە دڵۆپێك ئاو دروستی کردووە وئەندازەی بۆداناوە)، کە ئەندازەکردنی مردنیش تێیدا دەگرێتەوە، هەروەها لە ئایەتێکی تردا ئاماژەکردنێك هەیە بە بەرنامەرێژیی مردن لەسەرەتای دروستبوونی نوتفە کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَىٰ ۖ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ الْمَيِّتِ مِنَ الْحَيِّ ۚ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ (الأنعام:٩٥) واتە: بەڕاستی خودا لەتکەری دەنکەکان وناوکەکانە، کە زیندوو دەردێنێ لە مردوو ودەرهێنەری مردووانە لە

زیندوو، ئەوەیە خودای ئێوە دەی کەواتە ئێوە چۆن لەپەرستنی لادەدرێن، لەم ئایەتەدا لەتکردنی دانەوێڵە وناوك بە دەرهێنانی ژیان لە مردوو دەبەستێتەوە هەروەها بەدەرهێنانی مردوو لە زیندوو دەبەستێتەوە، واتە لەکاتی دابەشبوونی خانەکاندا دروستبوونی زیندوویەك بڕیار دەدرێت وهەر لەو کاتەش بڕیار وبەرنامەی مردن دادەنرێت.

بینراوە مردنی بەرنامەرێژکراوی هەندێك لەخانەکان لەکاتی گەشە کردنی کۆرپەلەدا گرنگییەکی گەورەی هەیە بۆ رێکبوونی جەستەیی و وەرگرتنی شێوەی مرۆڤ؛ بۆ نموونە: پەلەکانی کۆرپەلە (دەستەکان وپێکان) سەرەتا لەشێوەی سەوڵدان، دواتر بە بەرنامە خانەکانی نێوان پەنجەکان دەمرن وئەمەیە دەبێتە هۆی دروستبوونی پەنجەکان و وەرگرتنی شێوەی مرۆیی دەستەکان وپێکانی کۆرپەلە، بەهەمان شێوە لە زوربەی قۆناغەکانی گەشە کردنی کۆرپەلە ودروستبوونی ئەندامەکانیدا مردنی بەرنامەرێژ کراوی هەندێك لە خانەکان بوونی هەیە، کە ئەمەیە دەبێتە هۆی کامڵ بوونی گەشە کردنی و وەرگرتنی شێوەی کۆتایی کۆرپەلەکە.



**وێنەیەکی راستەقینەی دروستبوونی دەستی کۆرپەلە کە سەرەتا وەك سەوڵێك پە نجەکانی پێکەوەبوون، دواتر بەهۆی مردنی بەرنامەرێژراوی خانەکانی نێوان پە نجەکان دەستی ئاسایی بۆ کۆرپەلەکە دروستدەبێت**

لەزانستی ئەمڕۆدا ئەندازەکردنی مردنی خانەکان ڕۆڵێکی بنەڕەتییان لە گەشەکردن وهاوسەنگی بایۆلۆجی گیاندارە فرەخانەکاندا هەیە، لێکۆڵەرەوان چەند نیشانەیەکی شانەییان دیاریکردووە بۆ جیاکردنەوەی مردنی بەرنامەرێژکراوی خانەکان لە مردنەکانی تری خانە بەهۆکارە دەرەکییەکان، بۆ نموونە ئەوخانانەی بەرنامەرێژکراون بۆ مردن پێش مردنیان دەچنەوەیەك ولە دراوسێکەیان دەکشێنەوە، وبە خێرایی وەك ئەوەی بکوڵێت بڵقیان لەسەر دەردەکەوێت، بەڵام خانەیەك بە هۆکاری بەرکەوتن وهۆکاری دەرەکی وەك نەمانی ئۆکسجین یان کەمی خۆراکەوە بمرێت خانەکە هەڵدەئاوسێت وپارچەپارچە دەبێت. هەروەها ناوکی ئەوخانانەی بە بەرنامە دەمرن گۆڕانکاری جێگیر ودرامابیان تێدا

ڕوودەدات، لەوانە کرۆماتینی ناوك (DNA)یان چڕدەبێتەوە وبارستەیەك یان زیاتر لە نزیك پەردەی خانەکە دروست دەکات.

لەمەوە بە ڕوونی دەردەکەوێت کە مردنێکی تر هەیە وجیایە لە مردنی گشتی زیندەوەرەکە، دەگونجێت ئەم ئایەتە قورئانیە بیگرێتەوە کە دەفەرموێت: ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ، عَلَى أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ (الواقعة) واتە: ئێمە مردنمان لە نێوانتاندا بەئەندازە داناوە، کەسیش پێشمان ناکەوێت، کە شێوەتان بگۆڕین و، بە شێوازێکی تر کە دروستتان بکەینەوە کە نایزانن.

بایۆلۆجیەکان دەڵێن ئەم جۆرە مردنە هەڵدەستێت بە ڕۆڵی سەرەکی لە گەشەکردنی جینیی گیاندارە فرەخانەکان ویارمەتی ڕێکخستن وگەشەکردنی گیاندارەکە دەدات، ئەم بەرنامەیەش کاتێك دادەنرێت کە گیاندارەکە کۆرپەلەیە ولە سەرەتای دروستبونیدایە.

٢ خێزانی جینەکان کۆنترۆڵی بەرنامەی مردنەکە دەکەن کە بریتین لە (ICE) و(BCL-٢)، کۆمەڵەی یەکەمیان کرداری مردنەکە بەپێی پێویستی ڕێك دەخەن، کۆمەڵەی دووەمیش هەڵدەستن بەسەرپەرشتیکردن ودروستکردنی پرۆتینی مردن کە بە (ICE) (ICE like proteases) ناودەبرێت، ڕێکخستنی ئەم جۆرە مردنە بە شێوەیەکی ئەندازە بۆکراو وڕێکخراو لە بەرزترین ئاستی خانە بەرگریکارەکان لە کاتی گەشەکردنی مرۆڤایەتی لە قۆناغە جیاوازەکاندا دەردەکەوێت.

بۆ نموونە خانە (T) یەکان بە مردنی خانە بەرنامەڕێژکراوەکان بۆ مردن ئەوانیش دەمرن، چونکە ئەگەر بمێننەوە ونەمرن بونیادی مرۆڤایەتی تێکدەدەن، هەروەها ئەو خانانەی کە ناتوانن لەگەڵ تەنە دەرەکیەکاندا کارلێك بکەن وسوودیان بۆ جەستە نەماوە، بە ڕێکخراوی وبە بەرنامە دەمرن، تازەکردنەوەی بەردەوامی خانەکانی لەش بە ڕێکوپێکی وڕێکخراوەیی بە پێی چەند یاسایەك کە پەروەردگار لەهەموو کۆئەندامەکان وشانەکانی مرۆڤدا دایناوە دەریدەخات کە جۆرێکی تری مردنی ئەندازەکراو هەیە.

لە ساتەکانی یەکەمی پێکهاتنی هێلکەی پیتێنراو بەتایبەتیش لە قۆناغی (تەقدیر)دا سیفاتە بۆماوەییەکان ڕێکدەخرێن وخەلق دەکرێن، وەك ووتمان ئەوجینانەش کە هەڵدەستن بەم جۆرە مردنە ناسراون بە (ICE) و(BCL-٢).

لەبەرئەوەی ئەم جۆرە مردنە تەقدیرکراوە دیاردەیەکی پێویستیی مرۆڤایەتیە وبەتایبەتی لە قۆناغەکانی گەشەکردنی یەکەمیدا، سەرسوڕهێن ئەوەیە کاتێك ئەو ئایەتە قورئانیانەی سورەتی (الواقعة) دەخوێنینەوە کە باس لە مردنی ئەندازەکراو دەکات، یەکسەر ئایەتی دوای ئەوە باس لە گەشەکردنی یەکەمیی (النشأة الاولى)ی کۆرپەلە دەکات ودەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الْأُولَى فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ﴾ (الواقعة)، بۆیە دەکرێت لەمەوە تێبگەین کە ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئاماژەن بۆ ئەم جۆرە مردنە کە پەیوەستن بە گەشەکردنی یەکەمیی مرۆڤ، کە ئەم جۆرەش یارمەتی پێکهێنان وڕێکخستنی کۆرپەلەکە دەدات.

پێشتر وادەزانرا ئەوخانانەی لەتاقیگەکاندا لە دەرەوەی لەش گەشەیان پێدەکرێت توانای دابەشبوونی بێسنووریان هەیە، بەلام لەم دواییانەدا دەرکەوت کە ئەمانیش توانای دابەشبوونیان سنووردارە، چونکە دوای چەند ژمارەیەکی دیاریکراوله دابەشبوون کێلگەخانەکە پیردەبن ودەمرن.

لێرەوە ئەو بیردۆزە دروستبوو کە میکانیزمێکی دیاریکراو لەناو خانەدا بوونی هەیە کە کۆنترۆڵی تەمەنی خانەکە دەکات لەرێی وەستاندنی دابەشبوون وکردنەوەی بوار بۆ کردارەکانی تێکدان بۆ مراندنی خانەکە، توێژەران بەچڕیی هەستان بەتوێژینەوە بەمەبەستی دۆزینەوەی ئەم میکانیزمە، لەم چەند ساڵەی دواییدا دۆزرایەوە کە بەشی کۆتایی کرۆمۆسۆمەکان کە بە تیلۆمیر (Telomere) ناسراوە دوای هەموودابەشبوونێك درێژییەکەی کەمدەکات کە دەبێتە هۆی لاوازبوونی دروستبوونی پرۆتینەکان لەناوخانەدا.

ئیتر دەرکەوت کە ئەم بەشە وەك کاتژمێرێك یان حاسیبە کاردەکات کە ژمارەی دابەش بوونەکان حیساب دەکات، هەروەها لەکاتی دابەشبووندا ماددەی

---

ئایا مردن دروستکراوە؟

لەو بڕوایەداین کە لە ئێستادا لای بایۆلۆجیەکان ڕوونبۆتەوە کە مردن دروستکراوە، ئەم ڕاستیەش بە تەواوی نەزانرا هەتا دوای ناوەڕاستی سەدەی بیستەم وبە تایبەتیش دوای حەفتاکانی زایینی، بەلام قورئانی پیرۆز چواردە سەدەیە ئاماژەی داوە کە مردن دروستکراوە لە ئایەتی: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَالْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾ (الملك:٢)، جێگای سەرسامییە کە هۆکارەکانی مردن لەڕووی بایۆلۆجیەوە بەهێزترن لەکاتی قۆناغەکانی گەشەکردنی یەکەمیی گیاندارانىدا، چونکە ٩٠٪ی خانەکانی کۆئەندامی بەرگری لەکاتی دروستبوونیاندا بە مردنێکی بەرنامەداڕێژراو دەمرن، وبۆ سووڕی خوێن دەرناچن تەنیا ١٠ ٪ یان نەبێت، هەروەها ژمارەیەکی بێشومار لە دەمارۆچکەکان لەکاتی پێکهاتنی دەمارەکاندا دەمرن، لەمەشەوە ئیعجازێکی تری قورئانی پیرۆز ڕووندەبێتەوە بەوەی کە مردنی پێش ژیان باسکردووە ودەفەرموێت: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ﴾.

{ بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە بابەتی: مردنی بەرنامە ڕێژکراو، لە ئامادەکردنی: ئەندازیار خالد حسن – ژمارە (٤٢)ی گۆڤاری (هەیڤ)}.

بۆماوەیی دەپارێزێت لە فەوتان وبڵاوبوونەوە ویەکگرتنی هەڵە،هەروەها بەکڵاوەی قەراغەکان (End Cap) یان ژمێریاری دابەشبوونەکان (Replico-meter) ناسراوە، دەتوانرێت بە ژمێریاری تەمەن یان ئەجەل (Longevity-meter) ناوببرێت، چونکە کاتێك درێژییەکەی ئەوەندە کورت دەبێت ودەگاتە ئاستێکی شلۆق لێرەدا دابەشبوون دەوەستێت وخانەکە دەمرێت، هیچ کاتێك درێژیی ئەم کۆتاییانەی کرۆمۆسۆمەکان لە خانە بنەڕەتییە کۆرپەلەییەکان (ستێم سێڵ) وخانە شێرپەنجەییەکاندا کەمناکات لەبەئەوەی ئەنزیمی بنیاتنەری کرۆمۆسۆمەکان هەڵدەستێت بە قەرەبووکردنەوەی ئەوبەشەی کە کەمدەکات، کاتێکیش مرۆڤ دەچێتە تەمەنەوە درێژییەکەی تیلۆمیر بەردەوام کەمدەکات لە خانە جەستەییەکاندا لەبەر نەبوونی ئەو ئەنزیمە بنیاتنەرە، لەپیریدا ئەم کۆتاییانەی کرۆمۆسۆمەکان لەوپەڕی کورتیدا دەبن.



پیریی لەکاتێکی دیریکراودا دەردەکەوێت بەهۆی چەند میکانیزمێکی خانەیی ئالۆز ودیاریکراوەوە کە بە هاوئاهەنگییەکی بێوێنە کاردەکەن.

خانەی زیندوو تەمەنی دیاریکراوە بەتایبەتی لەو خانانەی بەخێرایی نوێ دەبنەوە زۆر کورتە، کە ئیتر کارەکانی لێرەدا دەوەستن وخانەکە سیس دەبێت ودەمرێت، لەسەدەی رابوردوودا هەردووزانا:وایزمان (Weismann) وکاریل (Carrel) ناوی پیریی خانە (Cell Senescence)یان لەومیکانیزم ووەستانی فرمانانەی ناوخانە نا.

پەیوەندی نێوان پیریی خانە وکورتبوونی تیلۆمیر تەنها لەم دواییانەدا دۆزرایەوە، بەتایبەتی دوای دۆزینەوەی ئەنزیمی دروستکەری تیلۆمیر بەناوی تیلۆمیرەیز (Telomerase) لەلایەن گریدەر (Greider) وبلاکبێرن (Blackburn) لەسالی (١٩٨٥)دا، یەکەم کەسیش کە پیریی خانەی بەستەوە بە لەدەستدانی بەشێکی درێژیی تیلۆمیر هاوارد کوک (Howard Cooke) بوولەسالی (١٩٨٦)دا، کاتێك بینی خانە گەشە پێکراوەکانی وەرگیراولە کەسانی مندال تیلۆمیرەکانیان درێژترە وژمارەی دابەشبوونەکانیان زیاترە بەبەراورد بەوخانانەی لە کەسانی بەتەمەنەوە وەرگیراون.

لەسالی (١٩٨٩)دا مۆرین (Morin) ئەوەی دۆزییەوە کە چالاکیی ئەنزیمی دروستکەری تیلۆمیر زیاترە لە خانە شێرپەنجەییەکاندا، ئەمەش پشتگیریی بیردۆزەکەی ئۆلۆڤنیکۆڤ (Olovnikov)ی کرد کە پێشتر لەسالی (١٩٧١)دا وتبووی: دەبێت میکانیزمێك هەبێت کە ببێتەهۆی دەرچوونی دابەشبوونی خانە شێرپەنجەییەکان لە کۆنترۆل، زیادبونی چالاکیی ئەنزیمی تیلۆمیرەیز لە خانە شێرپەنجەییەکاندا (کە لە خانە ئاسییەکاندا بوونی نییە) دەبێتەهۆی قەرەبووکردنەوەی درێژیی تیلۆمیرەکان کە کەمدەکات بەهۆی دابەشبوونەوە، بەمشێوەیە خانە شێرپەنجەییەکان بەبێوەستان لەدابەشبوون بەردەوام دەبن.

زیادبوونی ئەنزیمی تیلۆمیرەیز لە خانە شێرپەنجەییەکاندا پشتگیریی کراوە بە هەمووئەوتوێژینەوە زانستییانەی لە ساڵی (١٩٩٤)ەوە لەمبوارەدا ئەنجامدراون تا ئەمڕۆ، ئەمەش مانای ئەوەیە دەتوانرێت شێرپەنجە لەناوببرێت بە بەکارهێنانی دەرمانێك کە چالاکیی ئەنزیمی تیلۆمیرەیز بوەستێنێت یان وەستاندنی کاری ئەوجینەی ئەم ئەنزیمە بەرهەم دێنێت، هەروەها دەتوانرێت پیریی دوابخرێت بە بەکارهێنانی ئەنزیمەکە یان ئەوجینەی کە دروستی دەکات وەك دەرمانێك، ئەوەی مایەی سەرنجە ئەوەیە بینراوە کە تیلۆمیرەکان هەر لە سەرەتاوە کورتبوون لە حاڵەتی تووشبوون بە نەخۆشی پیریی زوویان ناوەخت (پرۆجیریا Progeria)، هەروەها بینراوە کە هەر لەسەرەتاوە درێژبوون لە خانە بنەڕەتییە کۆرپەلەییەکان (ستێم سێل Stem cells) کە دواتر لەمانەوە هەمووخانەکانی تری لەشی کۆرپەلەکە دروست دەبن.

ئەمەش هیوایەك دەدات بەتوێژەران کە بتوانن وەك جێگرەوەیەك بەکاریان بێنن لە کردارەکانی گۆڕینی شانە فەوتاوەکان وەك لە حاڵەتی فەوتانی خانەکانی پەنکریاس کە بەرپرسن لە دەردانی هۆرمۆنی ئینسۆلین لە نەخۆشی شەکرەدا، وفەوتانی خانەکانی مێشك لە نەخۆشی خەڵەفاوی (زهایمەر Alzheimer)دا، نوێترین دۆزینەوەش لەمبوارەدا ناسینی جووتێك جینی مرۆییە کە کاریان کپکردنی دروستکردنی ئەنزیمی تیلۆمیرەیزە کە ئامادەکاری دەکات بۆ هاتنی پیریی، هەروەها بەکارهێنانی ڕێژەی ئەم ئەنزیمە وەك نیشانەیەك (Marker)ی سەرەتایی بۆ دروستبوونی شێرپەنجە، لەساڵی (١٩٩٨)دا بودنار (Bodnar) ئاشکرای کرد کە سەرکەوتوو بووە لە دواخستنی پیریی کێلگەیەك لە خانەی مرۆیی بە بەکارهێنانی ئەنزیمی تیلۆمیرەیز، لەساڵی (٢٠٠١)یشدا (شایShay) هەوڵیدا دەرگای بەکارهێنانی خاوکەرەوەکانی ئەنزیمی تیلۆمیرەیز بکاتەوە بە مەبەستی وەستاندنی چالاکیی شێرپەنجەیی.

## لایەنی ئیعجازیی

هەمووئەوتوێژینەوانەی باسمان کردن دووپاتی دەکەنەوە کە مردنی خانە بەرنامە بۆداڕێژراوە، کەواتە مردن بۆ هەموو زیندەوەرەکان وخانەکانیان شتێکی حەتمی وئەندازە بۆدانراوە لەلایەن دروستکەری بەتواناوە ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ﴾، ئەم دۆزینەوە زانستییانە یەکانگیرە لەگەڵ مانای ئایەتە قورئانییەکاندا وبۆمان دەسەلمێنن کە سەرچاوەکەی پەروەردگاری تاك وتەنها وزانا ودانایە، وگەیەنەرەکەشی پێغەمبەرێکی راستگۆ وئەمینە.

❁❁❁



# سەرچاوەكان بەگشتيى


- پوختەی تەفسيری قورئان- م.محمد ملا صالح بامۆكی.

- إعجاز القران في ما تخفية الارحام- كريم نجيب الأغر- چاپی يەكەم: ٢٠٠٥ - چاپخانەی (دار المعرفة - بيروت).

- ئامارژەكانی كۆرپەلەزانی لە قورئان وسوننەتدا - د.كاوە فەرەج سەعدون- چاپی يەكەم-٢٠٠٨.

- علم الأجنة في ضوء القرآن والسنة - الشيخ عبدالمجيد الزنداني ود.مصطفى أحمد، بمشاركة مجموعة من علماء الأجنة الغربيين: Marshal E. Johnson, Gerald C. Goeringer, Joe Leigh Simpson, Keith L. Moore, T. V. N. Persaud- من اصدارات هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة برابطة العالم الإسلامي- مكة المكرمة.

- The Developing Human (Clinically Oriented Embryology) - Keit.L.Moor, T.V.N. Persaud - 9th edition- 2013.

-Yap-Seng Chong, National University of Singapore, Mahesh Choolani, National University Health System, Mark D Cregan, University of Western Australia, Jerry Chan, Duke-NUS Medical School, Unravelling the Mystery of Stem/Progenitor Cells in Human Breast Milk, PLoS ONE · December 2010 DOI:10.1371/journal.pone.0014421 · Source: PubMed.

- بابەتی: الإعجاز العلمي في قوله تعالى: إن الله لا يستحي أن يضرب مثلا ما بعوضة فما فوقها، للأستاذ الدكتور مصطفى إبراهيم حسن- من أبحاث المؤتمر العالمي العاشر للإعجاز العلمي بإستانبول- تركيا - الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة.

– الموت المقدر: الموت الخلوى المبرمج–د. مجاهد محمد أبوالمجد– به ناونيشانى:
https://www.eajaz.org/index.php/component/content/article/69-Tenth-Issue/579-The-estimated-death-(-apoptosis)-

– كتێبى: { **هـذا محمـد رسـول الله** (ﷺ) **وهـذه بـراهين رسـالته** } – نووسـينى: (د.عبـدالله بـن عبـدالعزيز المصـلح) – لـه بڵاوكراوەكـانى: (الهيئـة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة) – چاپى سێيەم: ٢٠١٥، ئـەم كتێبـە سەرچاوەى سـەرەكى بابەتـەكان بـوو كـە ئـەميش سـوودى لـە زيـاد لـە ٢٠٠ سەرچاوە بەزمانى عەرەبى وزياد لە ٣٠٠ سەرچاوەى تر وەرگرتووە لە كتێب وتوێژينەوەى زانستى وسايتەكانى ئينتەرنێت. ❁❁❁



# نوێترین دۆزینەوەی گەردوونی
# ئیعجازی زانستی قورئان پرشنگدار دەکات

لە نوێترین هەواڵدا لـە بـەرواری (٢٠١٤/١/١٩) سایتی هـەواڵی زانسـتی جیهـانی ناشنال جیوگرافیـک (National Geographic) توێژینەوەیـەکی بڵاوکـردەوە کـە لـە گۆڤـاری (سروشــت Nature)دا بڵاوکرابـوەوە بەناونیشـانی: (زانایـان یەکەمین وێنەی تۆڕی گەردوون دەبینن).

تێیـدا هـاتووە: گـەردوونزانان بـۆ یەکـەم جـار دیمـەنێکی ئـەوتۆڕە زەبەلاحـە فراوانـەی گازیـان لـە گەردوونـدا بینـی کـە هــەموو گەلەسـتێرەکانی گـەردوونیان لەتۆڕێکی گەورەدا پێکەوە بەستۆتەوە، بیردۆزە گەردوونیە وەرگیراوەکـان پێشـتر پێشـبینی بـوونی ئـەم تـۆڕە چـنراوە گەردوونیـەیان کـردووە، کـە گەلەسـتێرەکان پێکـەوە چـنراون لەنێودەزوولـەی زەبـەلاحی گـازی گەردوونیـدا، ئـەم دۆزینەوەیـە لـەرێی تەلسـکۆبی (Keck 1) لـە دوورگـەی (هـاوای) ئەنجامـدرا کـە یەکێکـە لـە گەورەترین تـەلسکۆبەکانی دونیا وتیرەی هاوێنەکەی ٣٣ پێیە (زیاتر لە ١٠ مـەتر)، تیمی توێژەرەکان سەر بە زانکۆی کالیفۆرنیای ئەمریکی بوون.

ئەوتاڵە گەردوونیە لە گاز درێژییەکەی ٢ملیۆن ساڵی رووناکی دەبێت (١سـاڵی رووناکی= ٩.٤٦ ملیۆن ملیۆن کیلۆمەتر)، ودرێژ دەبێتەوە لـەو بۆشـاییە فراوانـەی لەنێوان گەلەستێرەکاندا هەیە، ئەمـەش بەتـەواوەتی ئـەوەی سـەلماند کـە پێشـتر پێشبینی کرابوو، دۆزینەوەی ئەم تاڵە گەردوونیە بەهۆی ئەوتیشکە زۆرەیە کە لـە کوازاری ژمارە (UM287) دەردەچێت (١٠ملیـار سـاڵی رووناکی لـە زەوییـەوە دووره) وبـووه هـۆی رووناک کردنـەوەی ئەوبەشـەی گـەردوون ودەرکـەوتنی ئـەو دەزوولـە گەردوونیــەی گــاز، کوازارەکــان کۆمــەڵێك تــەنی گــەردوونی نــاوازەی پرشنگدارن، رووناکی لەو کوازارانەوە وەکو لایتێکی گەردوونی وایە کە دەورووبەری

خۆیان رووناك دەكەنەوە، وخۆشبەختانە رووناكی كوازارەكە رووی كردۆتە تاڵە گەردوونیەكە ورووناكی كردۆتەوە.

ئەم دۆزینەوە نوێیە وەك روونكردنەوەیەكی زیاترە بۆ بابەتی (تۆڕی چنراوی گەردوونی لەنێوان زانست وقورئاندا) كە لە بەرگی یەكەمی ئەم كتێبەماندا بڵاومانكردبووەوە، دەركەوتنی ئەم راستییانە وبینینی لەلایەن گەردوون ناسەكانەوە ئەوەندەی تر ئیعجازی ئاماژە قورئانییەكان پرشنگدارتر دەكات، چونكە زانایان لەمڕۆدا هەمان زاراوە قورئانییەكان بەكاردێنن، بۆ نموونە كە وەسفی كوازارەكان دەكەن كە تەنە هەرە پرشنگدارەكانی گەردوونن دەڵێن:

The light from the quasar is like a flash light beam and is )
:(pointing toward the nebula and making the gas glow)، واتە:

رووناكی لە كوازەرەكەوە هەروەكو رووناكی لایتێكی دەستی وایە، ورووی كردۆتە هەورە گازییەكە وگازەكەی رووناك كردۆتەوە، كەواتە لێرەوە بۆمان دەردەكەوێت كە گەردوونزانی ئەمڕۆ سەلماندوویەتی كە لەگەردووندا لایتی رووناككەرەوە هەیە، ئەمەش هەمان دەربڕینی قورئانە پێش ١٤٠٠ساڵ كە لەم ئایەتە پیرۆزانەدا دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ﴾ (الملك:٥)، هەروەها ئایەتی: ﴿وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ﴾ (فصلت:١٢) واتە: ئێمە ئاسمانی دونیامان بە لایت وگڵۆپ رازاندۆتەوە (كە ئەستێرەكانن).

هەروەها گرنترین ئاماژەی ئەم دۆزینەوە نوێیە بریتییە لەوەی بابەتی تۆڕی چنراوی گەردوون (Cosmic Web) لە بیردۆزەوە چۆتە بواری راستیی گەردوونییەوە چونكە توێژەرەكان دەڵێن ئێستا دەتوانین یەكەم تاڵە دەزووی تۆڕی گەردوون ببینین كە پێشتر تەنها پێشبینی بوونی كرابوو، ئەمەش دەرخەری موعجیزەی زانستییە لە ئایەتی:

﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ﴾ (الذاريات:٧) واتە:سوێند بەو ئاسمانەی خاوەنی چنراوێكی تۆكمەیە، لێرەوە ناوازەیی موعجیزەی قورئان لە سەردەمی دۆزینەوە گەردوونیەكاندا زیاتر دەدرەوشێتەوە. **بڕوانە وێنە روونكەرەوەكانی لاپەڕە (٣٨٨-٣٩٢)**

NATIONAL GEOGRAPHIC

# ASTRONOMERS GET FIRST GLIMPSE OF COSMIC WEB

ANDREW FAZEKAS
JANUARY 19, 2014

**Astronomers have for the first time captured a glimpse of the vast, web-like network of diffuse gas that links all of the galaxies in the cosmos.**

Leading cosmological theories suggest that **galaxies** are cocooned within gigantic, wispy **filaments of gas. This "cosmic web" of gas-filled nebulas stretches between large, spacious voids that are tens of millions of light years wide. Like spiders, galaxies mostly appear to lie within the intersections of the long-sought webs.**

**In observations spied through one of the most powerful** telescopes **in the world, the** 33-foot (10-meter) Keck I Telescope in Hawaii, astronomers led by Sebastiano Cantalupo of the University of California, Santa Cruz, now report that they have detected a very large, luminous filament of gas extending about 2 million light-years across intergalactic space, exactly as predicted by theory.

Essentially, the filament reported in the January 19 *Nature* represents one of the strands of the cosmic web that holds together the galaxy-rich universe. Astronomers hope to understand both the structure of the universe and the development of galaxies such as our own Milky Way by unraveling the secrets of the cosmic web.

The discovery came thanks to intense radiation bellowing out of a quasar (a hyperactive galaxy) dubbed UM287, 10 billion light years from Earth. The quasar illuminated the neighboring gas filament, revealing its presence with a glow that resembled a cosmic florescent sign.

"This is a very exceptional object: it's huge, at least twice as large as any nebula detected before, and it extends well beyond the galactic environment of the quasar," said Cantalupo, in a statement.

"The light from the quasar is like a flashlight beam, and in this case we were lucky that the flashlight is pointing toward the nebula and making the gas glow. We think this is part of a filament that may be even more extended than this, but we only see the part of the filament that is illuminated by the beamed emission from the quasar."

*Follow Andrew Fazekas, the Night Sky Guy, on Twitter and Facebook.*





Computer simulations suggest that matter in the universe is distributed in a "cosmic web" of filaments, as seen in the image above from a large-scale dark-matter simulation. The inset is a zoomed-in, high-resolution image of a smaller part of the cosmic web, 10 million light-years across, from a simulation that includes gas as well as dark matter. The intense radiation from a quasar can, like a flashlight, illuminate part of the surrounding cosmic web (highlighted in the image) and make a filament of gas glow, as was observed in the case of quasar UM287. Credit: Anatoly Klypin and Joel Primack, S. Cantalupo

وێنەیەکی لێکچووی کۆمپیوتەری کە پێشنیاری ئەوە دەکات کە ماددە لە گەردووندا بەشێوەی ( تۆڕێکی گەردوونی ) لە دەزوو بڵاوبووەتەوە، هەروەک لەو وێنەیەی سەرەوەدا دەبینرێت کە مۆدێلێکی شوبهاندنی قەبارە گەورەی ماددەی تاریکە. ئەو بەشەی لە بۆکسەکەدایە وێنەیەکی دیقەتە بەرزی گەورەکردنی بەشێکی بچووکترە لە تۆڕی گەردوونی کە تیرەکەی ١٠ ملیۆن ساڵی ڕووناکییە، ئەم وێنە لێکچووەش گازو تۆزی گەردوونی و تاریکە ماددەش لەخۆدەگرێت. تیشکدانەوەی بەهێزی ڕووناکی کوازارێك دەتوانێت ( بەهەمانشێوەی لایتی دەستی ) بەشێکی ئەو تۆڕە گەردوونیەی دەوری خۆی ڕووناکبکاتەوە ( وەك لە وێنەکەدا دەرکەوتووە ) کە دەزوویەکی لەگاز پرشنگدار کردووە، هەروەك ئەوەی بینرا لە وێنەی ڕووناکی کوازاری ژمارە ( UM287 ).



This deep image shows the Nebula (cyan) with a size of 2 million light-years discovered around the quasar UM287 (at center). The energetic radiation of the quasar makes the surrounding intergalactic gas glow revealing the morphology and physical properties of a "Cosmic Web" filament. Credit: S. Cantalupo

ئەم وێنەیەی قووڵایی گەردوون، هەوری گەردوونی ( سیان ماگ نیشان دەدات بە قەبارەی ٢ ملیۆن ساڵی ڕووناکی کە دۆزراوەتەوە لە دەوروبەری کوازار ( UM287 ) کە لە ناوەڕاستدایە. ووزەی تیشکدانەوەی ئەم کوازارە کارێکی وایکردووە کە گازی گەردوونی دەوروبەری پشرەوشێنێتەوە، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی شێوە و سیفاتی فیزیایی دەزوویەکی ( تۆڕی گەردوونی ) نزیکی دەربخات.

## سەرچاوەکان:


- http://www.nature.com/news/light-from-ancient-quasar-reveals-intergalactic-web-1.14550

- https://www.nature.com/articles/nature12898 :
  A cosmic web filament revealed in Lyman-α emission around a luminous high-redshift quasar

- https://news.ucsc.edu/2014/01/cosmic-web.html:Distant quasar illuminates a filament of the cosmic web
  Astronomers capture first image of diffuse gas within the network of filaments connecting galaxies in a cosmic web

- http://www.kaheel7.com/ar/index.php/2010-02-02-20-06-04/1628-2014-01-27-15-34-34

# کوێریی مێشك

## ئیعجازی زانستی لە ئایەتی:

﴿لَهُمْ أَعْيُنٌ لَا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَا يَسْمَعُونَ بِهَا﴾

ئایەتی:﴿وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَا يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ (الأعراف:١٧٩) واتە: (ئەو بێباوەڕانە چاویان هەیە بەڵام پێی نابینن، وگوێیان هەیە بەڵام پێی نابیستن)، بەڕاستی ئەم ئایەتە باسی شتێکی سەرسوڕهێنەر دەکات، چۆن دەبێت مرۆڤێکی تەندروست نەبینێت یان کوێربێت لەکاتێکدا چاوی کاردەکات وسەلامەتە یان نەبیستێت کە گوێیشی سەلامەت بێت؟ دەبا تێبڕوانین لەم دۆزینەوە نوێ وسەرسوڕهێنەرە کە ئەم بابەتە ڕووندەکاتەوە.

لە چەند توێژینەوەیەکی نوێدا بۆ توێژەران ڕوونبوویەوە کە خەڵکانی تاوانکار چەند ناوچەیەکی تاریك یان کوێر لە مێشکیاندا بوونی هەیە.

مێشکی مرۆڤی ئاسایی هەموو کاتێك کاریگەر دەبێت بەڕووداوەکانی دەوروبەری وچەند ناوچەیەکی مێشکی چالاکي تێدا دروست دەبێت.

بەڵام کاتێك وێنەی تیشکیی مێشکی کەسانێکی پیاوکوژ یان تاوانبار گیرا بینییان کە چەند ناوچەیەکی تاریك هەیە لە مێشکیاندا کە یان وەڵام وچالاکی تێدانییە یان وەڵامەکەی زۆر کز ولاوازە لەکاتی ئەو ڕووداوە جۆراوجۆرانەی کە بەسەریاندا دێت.

کاتێك مرۆڤێکی ئاسایی دیمەنێکی تاوانکاریی دەبینێت وەك کوشتن ئەوا مێشکی کاریگەر دەبێت وبەخێرایی وەڵامی دەبێت وەك ترسان یان دڵەڕاوکێیی ودەربڕینی هاوسۆزی لەگەڵ تاوانلێکراوەکەدا، بەڵام لەحاڵەتی کەسانی موجریم وتاوانکاردا زانایان بینییان کە ئەوشوێنانەی مێشکیان کە تایبەتە بەم وەڵامانە

چالاكییەك یان كارتێكرانێكی دیار تێیاندا ڕوونادات وبەبێ چالاكی دەمێنێتەوە لەكاتی تاقیكردنەوەكاندا.

پاك وبێگەردی بۆ ئەوپەروەردگارەی وەسفی خراپەكاران وتاوانكاران لە قورئاندا بەوە دەكات كە چاوەكانیان كوێربووە لەبینینی حەق وراستی، كە ئەم لێكچوواندنە راستییەكی تەواوە لەرۆژگاری ئەمڕۆدا دركی پێكراوە، پەروەردگار دەفەرموێت:﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ، أُولَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ﴾ (محمد:٢٢-٢٣) واتە: ئایا ئێوە بەتەمان ئەگەر پشتهەڵكەن لە ئیسلام ولە زەویدا ئاژاوە وخراپە بەرپابكەن وهەرچی پەیوەندی خزمایەتیتان هەیە بیپچڕێنن؟ ئائەوانە ئەوكەسانەن كە خوا نەفرینی لێكردوون وكەڕی كردوون وچاویانی كوێركردووە.



**بڕوانە ئەم وێنەیە كە بە ئامێری وێنەگرتنی تیشكیی ( PET Scan ) گیراوە كە لای ڕاست مێشكی كەسێكە كە وەك تاوانكارەكان چەندین ناوچەی ڕەشی تێدا دەبینرێت لەچاو مێشكی كەسێكی ئاسایی ( لای چەپ ) كە مێشكی چالاكی بەرچاو نیشان دەدات.**

**( وەرگیراوە لە توێژینەوەكەی جە یمس فالۆن )**

یەکێك لەوزانایانەی کە بۆ ماوەی زیاتر لە ٢٠ ساڵ توێژینەوەی لەمبارەوە کردووە وگەیشتووەتە ئەم راستییە زانای دەمارزانی ئەمریکی (جەیمس فالۆن)ە، ئەویش بە مەبەستی وەڵامدانەوەی ئەوپرسیارەی کە: ئایا مێشکی کەسانی پیاوکوژ وتاوانکار جیاوازی چیە لە مێشکی کەسانی ئاسایی؟

لەلایەکی تریشەوە لە هەواڵێکی سایتی زانستی (discovery.com) لە ساڵی (٢٠١٣)دا هاتووە کە پزیشکی دەمارزانی ئەڵمانیش (گێرهارد رۆس) کە پرۆفیسۆرە لە زانکۆی (بریمن) هەستا بە چەندین توێژینەوە لەسەر مێشکی کەسانی تاوانکار وپیاوکوژ لەبەرژەوەندی حکومەتی ئەڵمانیا وبۆی دەرکەوت کە بەتایبەتی ناوچەیەك هەیە لە پلی پێشەوەی مێشکدا کە دەکەوێتە پشتی چاوەکانەوە لەکاتی وێنەگرتنی تیشکیی مێشکی ئەوکەسە تاوانکارانەدا بە تاریکی دەمێنێتەوە وچالاکی نابێت پاش نیشاندانی چەندین دیمەنی ڤیدیۆیی کاریگەر، کاتێك ئەم بەشە تاریکەی مێشك لابرێت ودەربهێنرێت ئەو هەڵسوکەوتە تاوانکارانەیان نامێنێت.



ئەم وێنە تیشکییەی مێشکیش کە بەئامێری وێنەگرتنی تیشکیی ( CT Scan ) گیراوە ئەو ناوچە تاریك وناچالاکانە دەردەخات لە مێشکی کەسانی تاوانکاردا کە دەکەوێتە پشتی چاوەکان وبە پرسە لەدەربڕینی هاوخەمیی وهاوسۆزی.

( وەرگیراوە لە توێژینەوەکەی گێرهارد رۆس )

کەواتە ئەم شوێنانەی مێشکی موجریم وتاوانکاران تووشی کوێریی دەبێت لەگەڵ ئەوەشدا کە دەتوانێت شتەکان ببینێت بەڵام هیچ کارێکی تێناکەن ومێشکی نایخوێنێتەوە وهەستی پێناکات، بە تەواوەتی وەك ئەوەی کە کوێربێت، پەروەردگار دەربارەی گەلی نوح دەفەرموێت: ﴿وَأَغْرَقْنَا الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا عَمِينَ﴾ (الأعراف:٦٤)، واتە:ئێمەش ئەوانەمان ژێرئاوخست کە ئایەتەکانی پەروەردگاریان بەدرۆدەخستەوە، بەڕاستی ئەوان گەلێکی کوێر بوون.

– سایتی ڕۆژنامەی (گاردیان)ی بەریتانی لە بابەتێکدا کە جیاوازی وێنەی مێشکی مرۆڤی ئاسایی لەگەڵ وێنەی مێشکی کەسێکی تاوانکاردا ڕووندەکاتەوە ئەم وێنەیەی بڵاوکردۆتەوە کە بە تەواوەتی جیاوازییەکە دەبینرێت:



**ئەم وێنەیە بەڕوونی جیاوازییەکە دەردەخات: لەلای چەپ وێنەی تیشکی مێشکی کەسێکی ئاساییە، لای ڕاستیش وێنەی مێشکی کەسێکی تاوانکارە کە بە ڕوونی چەندین ناوچەی تاریك وکارتێنەکراو دەبینرێت لەکاتی پیشاندانی چەندین وێنە ودیمەنی کارتێکەردا، کە بەتەواوەتی دەتوانین بڵێین ئەم ناوچانە کوێرن لەمێشکدا، بڕوانە بابەتەکە لەم لینکەدا:**

– https://www.theguardian.com/science/2013/may/12/how-to-spot-a-murderers-brain.

لێرەوە دەتوانین بەشێوەیەکی زانستی وتەواو تێبگەین لە ووتەی پەروەردگار: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لَا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾ (الأعرف:١٧٩) واتە:دروستمان کردووە بۆ دۆزەخ زۆرێك لە جنۆکە وئادەمی، دڵیان هەیە بەڵام تێناگەن لەراستی، وچاویان هەیە بەڵام پێی نابینن، وگوێیان هەیە بەڵام پێی نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵ وان بگرە گومڕاتریش هەرئەوانەن کە بێئاگان.

ووتەی پەروەردگار کە ئەوکەسانە چاویان هەیە بەڵام پێی نابینن بەتەواوەتی لەگەڵ ئەم توێژینەوە نوێیانەدا یەکدەگرێتەوە، کە دووپاتی دەکاتەوە مێشك هەندێك جار وەڵامی نابێت بۆ ئەودیمەنانەی بەچاودەیانبینێت یان ئەودەنگانەی بەگوێ دەیانبیستێت.

ئەوکەسەی باوەڕ بە وتەکانی پەروەردگار ناهێنێت وبەدرۆی دەخاتەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە چاوی هەیە پێی ببینێت وگوێشی هەیە پێی ببیستێت، بەڵام مێشکی کوێرە ووەڵامی نابێت وکاریگەرنابێت بە وتەکانی پەروەردگار، بۆیە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوأَعْمَى إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُوالْأَلْبَابِ﴾ (الرعد:١٩) واتە: جا ئایا کەسێك کە بزانێ بەڕاستی ئەوەی نێردراوەتەخوار بۆتۆ لەلایەن پەروەردگارتەوە حەق وراستە وەك ئەوکەسەیە کە کوێربێت، بێگومان هەرئەوانە بیردەکەنەوە کە خاوەنی ژیرین.

ئەوکەسەی کە لە حاڵەتی کوێریی مێشکدا دەژی لە بەرامبەر حەق وراستیدا لە ڕۆژی دواییدا دەکەوێتە حاڵەتێکی کوێریی راستەقینەوە، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ كَانَ فِي هَذِهِ أَعْمَى فَهُوفِي الْآخِرَةِ أَعْمَى وَأَضَلُّ سَبِيلًا﴾ (الإسراء:٧٢) واتە:بەڵام هەرکەسێك لەم کوێربووبێت ورێگەی راستی نەبینیبێت، ئەوە ئەوکەسە لە ڕۆژی دواییشدا کوێرە وبگرە لە کوێریش گومڕاترە.

﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾ (طه:١٢٤) واته: (وه هەرکەسێ روووەربگێرێ لە رێباز ویادی مـن ئـەوە بێگومـان ئـەو کەسـە گـوزەرانێکی سـەخت وتـەنگی دەبێـت ولـەرۆژی دواییشـدا بـەکوێری حەشری دەکەین).

دەبینین پەروەردگار دووپاتی ئەو راستییە دەکاتـەوە کـە کـوێریی راسـتەقینە کوێریی دڵ ومێشکە نەك کوێریی چاوەکان، چونکە مێشك ودڵی کەسی مولحیـد لـە حاڵەتێکی تاریکیدایە وکاریگەر نابێت بـەدەنگی حـەق وراسـتی: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِنْ تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾ (الحـج:٤٦) واتـە: لەراسـتیدا چاوەکان کوێرنابن بەڵکو ئەو دڵانە کوێردەبن کە لە سینەکاندان.

کەواتـە راسـتییە زانسـتییەکان دەڵێن کـە ئـەو تاوانکارانـەی راهـاتوون لەگـەڵ کوشـتن ودزیـن وئابڕوتکانـدن مێشـکێکیان چـەندین ناوچـەی تـاریکی تێدایـە کـە کاریگەر نابێت بەهەندێك دیمەن و ووتە، ئـەم مێشـکە بەشـێکی بـەکوێر دادەنرێـت لەرووی پزیشکی وزانستییەوە. **بڕوانە وێنە روونکەرەوەکانی لاپەڕە ( ٣٩٣ )**

پـەروەردگاریش نموونـەی ئەوکەسـانەی بەچـەند ووشـەیەکی زۆر جـوان بـۆ روونکردووینەتـەوە کـە دەفـەرموێت: ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ﴾ (محمد:٢٢) واتـە: ئائەوانـە ئەوکەسـانەن کـە خـوا نـەفرینی لێکـردوون وکەڕی کردوون وچاویانی کوێرکردووە.

لـە کۆتاییـدا دەگەینـە ئـەو دەرەنجامـەی کـە ووردەکارییـەکی زۆر هەیـە لـە هەڵبـژاردنی دەق وزاراوە قورئانییەکانـدا وئـەو نموونانـەی کـە قورئـان بـۆ ئاگـادار کردنەوەی مرۆڤـەکان هێنـاویێتی، ئـەم ووردەکارییـە لـە چـەندین شـوێن ونموونـەی قورئانی تردا دەبینین کە لە رۆژگاری ئـەمڕودا بەتـەواوەتی راسـتیی وووردەکاریی دەق وزاراوە قورئانیەکان لە رووی زانستی وعەقڵیەوە بۆمان سەلماوە.

کەواتە بەهیچ شێوەیەك قورئان ووتەی مرۆڤێکی پـێش ١٤٠٠ سـاڵ نییـە بـەڵکو ووتەی پەروەردگاری دروستکەری مرۆڤەکان وئاگـادار بەهـەموو نهێنییەکانـە: ﴿قُلْ

أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ (الفرقان:٦)
واته: پێیان بڵێ ئەم قورئانە زاتێك ناردوویەتیە خوارەوە كە هەموونهێنیەكانی ئاسمانەكان وزەوی دەزانێت، بەڕاستی ئەو خودایە لێبوردەی میهرەبانە.

## چەند تیشكێكی تر:

- لە لێكۆڵینەوەیەكی تردا پرۆفیسۆر (كێنت كیهل) لە زانكۆی (نیومەكسیكۆ) توێژینەوەی لەسەر سەدان كەسی تاوانكار و(سایكۆپاس) ئەنجامدا وگەیشتە هەمان ئەنجام كە پاش وێنەگرتنی مێشكی ئەوكەسانە بە ئامێری (MRI) بۆی دەركەوت كە مێشكیان جیاوازی هەیە لە كەسانی ئاسایی تر وكاریگەریی ئەوتۆی لەسەر دروست نابێت كاتێك وێنە ودیمەنی تاوانكاریی وكارەساتەكان دەبینن ودەبیستن، بڕوانە ئەم لینكە بۆ زانیاریی زیاتر:

http://www.npr.org/templates/story/story.php?storyId=128116806



**وێنەی پرۆفیسۆر (كێنت كیهل) لەكاتی ئەنجامدانی توێژینەوەكانیدا**



**بەهۆی بەكارهێنانی ئامێری وێنەگرتنی تیشكی (MRI) وێنەی مێشكی زیاتر لە ١١٠٠ كەسی تاوانكاری گرتووە**

- له توێژینەوەکەی (جەیمس فالۆن)دا باسی نموونەیەکی تری سەیر دەکات، کاتێك کە خەریکی ئەم توێژینەوانە دەبێت لەسەر مێشکی کەسانی تاوانکار، دایکی پێیدەڵێت: لەناوپێشینانی خانەوادەکەی خۆماندا چەندین کەسی تاوانکار هەبووە، ئەویش ئەمەی پێ سەیر دەبێت، وکاتێك توێژینەوە دەکات دەبینێت ئەمە زۆر راستە وچەندین پیاوکوژ وتاوانکاری دڵڕەق لەناو خانەوادەکەیدا بوونی هەبووە لە سەدەکانی پێشتردا، بۆیە بڕیاردەدات کە وێنەی تیشکیی مێشکی خۆیشی بگرێت.

ئەوەی مایەی سەرسوڕمان دەبێت ئەوەیە کە دەبینێت مێشکی خۆی هەمان ئەو ناوچە تاریکانەی تێدایە کە لە وێنەی مێشکی کەسانی تاوانکاری تردا بینیوێتی وکاتێك بەراوردی دەکات بەوێنەی تیشکیی مێشکی کوڕەکەکەی خۆی دەبینێت هی ئەو زۆر ئاساییە وچالاکە.

(بڕوانە وێنەی یەکەمی ئەم بابەتەکە کە ئەو بەراوردکارییەیە).

لەلایەکی ترەوە کاتێك پشکنینی جینیش بۆ خۆی دەکات دەبینێت کە جینی (MAO-A Gene) کەپێی دەووترێت (جینی جەنگاوەرەکان) کە بەرپرسە لە دڵڕەقی وبێبەزەیی وتاوانکاریی، لەودا بە بەهێزیی بوونی هەیە، کە لێرەوە دەڵێت: من ١٠٠٪ قابیلیەتی بوون بە تاوانکار وپیاوکوژیم تێدایە.

بەڵام لەراستیدا کەسێکی بە بەزەیی وپزیشکێکی کارامە وزانایەکی دەمارزانی لێدەرچووە کە خاوەنی چەندین منداڵ وژیانێکی خێزانیی ئارام بووە، بڕوانە بابەتەکە لەم لینکەدا:

http://www.npr.org/templates/story/story.php?storyId=127888976

کەواتە بوونی قابیلیەتی کەسێتی وجێماوەی بۆماوەیی بۆ تاوانکاریی لە هەر کەسێکدا مانای ئەوە نییە کە ئەو کەسە لە داهاتوودا تاوانکار دەردەچێت،

بەڵكوئەمە دەمێنێتەوە بۆ هەڵبژاردنی کەسەکە خۆی لەداهاتوودا کە ئایا چاکەکار دەبێت یان تاوانکار.

لە دەقەکانی قورئان وسوننەتدا ئەوەمان بۆ دەسەلمێت کە خوای پەروەردگار هیچ کاتێك زۆر لە مرۆڤ ناکات لە هەڵبژاردنەکانیدا ومرۆڤ سەربەستیی تەواوی هەیە بۆ هەڵبژاردنی چاکە یان خراپە: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ (الكهف :٢٩) واتە: بڵێ ئەم حەقە کە قورئانە لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتووە، جا هەرکەسێك دەیەوێ باباوەڕ بهێنێ وهەرکەسێکیش دەیەوێ باکافربێت، ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ (الإنسان:٣)، واتە:بێگومان ئێمە مرۆڤمان ڕێنومایی کردووە بۆ ڕاستەڕێ، سا یان خۆی سوپاسگوزار دەبێت یان ناسوپاس وسپڵە دەبێت.

## سەرچاوە:

- بە پلەی یەکەم سوود وەرگیراوە لە بابەتی:(عمى الدماغ) لە سایتی (عبدالدائم الكحيل) بەم ژێدەرە:

http://www.kaheel7.com/ar/index.php/2010-02-02-22-17-58/1290-2013-05-22-02-06-11

هەروەها سوود لەم سەرچاوانەی تریش وەرگیراون:

- پوختەی تەفسیری قورئان:ملا محمد ملا صالح بامۆکی.

-http://news.discovery.com/human/psychology/does-the-brain-have-an-evil-dark-patch-130207.html
-http://www.npr.org/templates/story/story.php?storyId= 127888976
-http://www.npr.org/templates/story/story.php?storyId=128116806

-http://hms.harvard.edu/sites/default/files/HMS_OTB_Fall11_Vol17_No3.pdf

-https://news.upenn.edu/news/penn-professor-adrian-raine-unlocks-criminal-mind-using-biological-keys

-http://www.tjsl.edu/the-jeffersonian/news/2011/04/does-brains-geography-reveal-criminal-predispositions

-https://www.jstor.org/stable/29762423?seq=1#page_scan_tab_contents

-http://www.livescience.com/13083-criminals-brain-neuroscience-ethics.html

-http://www.dailymail.co.uk/sciencetech/article-/٢٠٢٠٩٨٩How-killers-Brain-scans-reveal-way-people-justify-murder.html

-http://www.smh.com.au/nsw/criminal-minds-how-neuroscience-is-changing-the-law-20151124-gl6cmf.html

-http://www.wsj.com/articles/SB10001424127887323 ٢٣٥٤٠٤٥٧٨٤٤٤٦٨٢٨٩٢٥٢٠٥٣٠

-http://www.apa.org/monitor/2014/02/criminal-mind.aspx

-http://www.alarabiya.net/articles/2013/02/08/265107.html

# ڕۆچوون و ونبوون لە مناڵدانەکاندا
## (غيض الأرحام)

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ﴾ (الرعد:٨) واتە: تەنیا پەروەردگار خۆی دەزانێت کە ئافرەت لەکاتی سکپڕیدا چی هەڵگرتووە، وئەوانەش کە لە منالّدانەکاندا ڕۆدەچن، وون دەبن وتیا دەچن چین، یان زیاد بوونی منالّدانەکان چییە؟ وهەمووشتێك لای ئەوبە ئەندازەیە وقەدەری ووردی خۆی بۆ دانراوە.

هەروەها لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کە فەرموویەتی: ﴿وَلا يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الأَرْحَام إِلاّ الله ...﴾ (رواه البخاري) واتە:تەنها خودا خۆی دەزانێت ئەوانەی لە منالّدانەکاندا ڕۆدەچن، وون دەبن وتیا دەچن چین؟!

تۆ بلّێی ئەوانەی لەناو منالّدانەکاندا ڕۆدەچن و وون دەبن یان زیاد دەکەن چی بن؟!

ئایەتە پیرۆزەکە باسی ٢ کردار دەکات کە لە منالّداندا ڕوودەدەن وبریتین لە:

١- غیض الأرحام (کە بەم مانایانە دێت:چوونە ناوەوە یان ڕۆچوون یان ونبوون یان تیاچوون).

٢- إزدیاد الأرحام (واتە: زیاد بوون لە قەبارە یان بارستەدا).

لێرەدا باسی کرداری یەکەم دەکەین کە بریتییە لە: (غیض الأرحام).

با بزانین لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا (غیض) بەمانای چی هاتووە؟

بەگشتی ئەم مانایانەی هەیە: ١- الغور خلال شيء أونفوذ السائل الى الأعماق وذهابە وغيابە، كغوران الماء في الأراضي وابتلاعها. ٢- النقصان [17].

---

[17] بڕوانە فەرهەنگەکانی (لسان العرب) و(المعجم الوسيط) لەژێر ماددەی (غیض)، هەروەها (معجم البلدان)/ باب الغين والياء وما يليهما.

واتە: ١- چوونە ناوەوە یان ڕۆچوون بەناو شتێکدا، یان ڕۆچوونی شلەمەنی بەناو قوولاییەکاندا ودیار نەمانی، ئەمەش وەکوڕۆچوونی ئاوبەناوزەویدا وقووتدانی[18]. ٢- کەم بوون.

سەبارەت بە تەفسیری ئایەتەکە (القرطبي) دەڵێت: (الغَيض: ما تُنقصه الأرحام من الدم والزيادة ما تزداد منه، وقيل: الغيض والزيادة يرجعان الى الولد).

واتە:(غيض) بریتییە لە کەمکردنی خوێن لە مناڵدانەکانەوە وزیادبوونیش لە قەبارەکەیدایە، ووتراوە (کەمبوون وزیادبوون) دەگەڕێتەوە بۆ بوونی مناڵەکە، لەگەڵ ئەوەشدا کە تەفسیرێکی زۆر جوانە ویەکدەگرێتەوە لەگەڵ زانیارییە نوێکانی کۆرپەلەزانیدا، بەلام با ئاگاداربین کە کەم بوون وزیاد بوون تەنها بۆ خوێن ناگەڕێتەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی کە دەستەواژەی ئایەتەکە ڕەهایە، هەربۆیە شتی تریش دەگرێتەوە.

ئەم دەقە پیرۆزانە قۆناغێکی پێشکەوتووی دروستبوونی کۆرپەلە لەناو مناڵداندا باس دەکات، هەر لەکاتی چوونە ژوورەوەی تۆوبۆ ناومناڵدان تاوەکو ڕۆچوون وچوونە ناوەوەی (نطفة)ی تێکەڵاو (النطفة الأمشاج).

ئایەتەکە باسی ڕۆچوون وکەمبوونەوە یان زیادبوونی شتێك یان هەردووکیان دەکات لەناومناڵدانەکاندا کە زانیاریی ئەم شتانە تەنها تایبەتە بە پەروەردگارەوە.

کاتێك هەردوومانای (غيض) ببەستین بەیەکەوە بە ڕوونی مەبەستی فەرموودە پیرۆزەکان دەردەکەون، هەر لە سەرەتای دروست بوونی تۆو وهێلکەوە تاوەکو چاندنی نوتفەکە لەناو مناڵداندا.

با بزانین زانستی نوێی کۆرپەلەزانی لەمڕۆدا چی دەڵێت لە بارەی ئەم ڕووداوانەوە:

---

[18] نموونەی ئەم مانایە لەو ئایەتە پیرۆزەدا دەبینین کە دەفەرموێت: ﴿وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ﴾ (هود:٤٤)، واتە: پاشان فەرماندرا بە زەوی: ئاوەکەت با ڕۆبچێت بە ناختدا، ئەی ئاسمان:تۆش با بەس بێت وباران مەبارێنە، ئیتر ئاوەکە ڕۆچوو بەناو زەویدا.

سەلمێنراوە کە لە هەر کارێکی جنسیدا پیاو زیاد لە ٥٠٠ ملیۆن تۆوی دەبێت کە تەنها یەك دانەیان هەلی ئەوەی هەیە کە ڕۆبچێت بەناو منالّداندا وسەربکەوێت وسەفەرەکە تەواو بکات تا دەگاتە هێلکەکە، وئەو تۆوانەی تر کە دەمێننەوە




تیادەچن و ووندەبن لەناو منالّدان وبۆرییەکەیدا.

مەگەر تەنها خودای ڕاگری ئەم ووردەکارییە نەبێت ئەگینا کەسی تر نازانێت کە کام دانە لەم ٥٠٠ ملیۆن تۆوە ئەو هەلەی دەبێت، تا ئێستا ولەداهاتووشدا وهیچ کاتێکیش پێشکەوتنی زانستی ناگاتە ئەوەی ئەو دانەیە دیاری بکات کە لەناو منالّداندا تیاناچێت، ودەگاتە هێلکەکە، مەگەر تەنها ئەم کردارە دەستی تێوەربدرێت ولە دەرەوەی منالّدان بەیەك تۆو وهێلکەیەکی دیاریکراو ئەنجام بدرێت، بەلاّم زانینی ئەو تۆوە دیاریکراوە لەو ژمارە بێشومارە بە ڕێگەی ئاسایی هیچ کەسێك هەرگیز ناتوانێت بیزانێت، کەواتە لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە هەردوو مانای (غیض الأرحام) لە تۆوی پیاودا چییە.

لە ئافرەتیشدا ئەو هێلکەیەی کە هەلی ئەم پیتاندنەی هەیە یەکێکە لە سەدان هەزار هێلکۆکە کە مانگانە لە هێلکەدانەکانەوە چالاك دەبن، وتەنها یەکێك لە توورەکەکانی گراف (Graafian Follicles) لەوانی تر زیاتر گەشە دەکات

وسەرەنجام دەتەقێتـە سـەرەتای بـۆری منالّدان، وسـەردەكەوێت، وهـەلی ئـەوەی دەبێت كە لەگەلّ تۆوێكدا یەكبگرێت وهێلكەكانی تر دەپووكێنەوە وتیادەچن لەناو هێلكەدانەكاندا.



دەبێت ئەم هێلكۆكەیە كامە بێت لەو هەزاران هێلكەیەی لە هێلكەدانەكاندا چالاك دەبن؟!

هیچ كەسێك وهیچ تەكنۆلۆژیایـەك ناتوانێت ئـەو هێلكەیـە دیـاری بكـات كــە دەردەدەپــــەڕێت وتـــــەنها پـەروەردگار دەزانێـت كـە كامەیانـە كاندیـدی ئـەم كردارەیـە، ئەگـەر لـە سەرەتای بـۆری منالّدانـدا تۆونـەبێت یـان تۆوەكـان چـالاك وزیندوونــەبن ونـەتوانن بگەنـە شـوێنی هێلكەكـە، ئـەوا ئــەو هێلكەیــەش وون دەبێــت وتیادەچـــێت وبـــەناو منالّدانـــــدا ڕۆدەچێتە خوارەوە بـۆ دەرەوە، كـە لێرەشدا تـەنها خـوای گـەورە نـەبێت كەسـی تـر پێـی نازانێـت، ئەمـەش بریتییە لە(غیض) لە هێلكەی ئافرەتدا. **بڕوانە وێنەكانی لاپەڕە ( ٣٩٤ )**

لە لایەكی تـرەوە لەوانەیـە پیتانـدن ڕووبـدات وهێلكـەی پیتێنـراو (Zygote) دروست ببێت، بەلاّم ئەم كۆرپەلەیە شكست بێنێت لـەوەی كـە خـۆی هەلّبواسێت بــەدیواری منالّدانـــەوە ودواتـــر خـــۆی بچـــێنێتە نـــاو دیـــواری منالّدانـــەوە (Implantation)، كە ئەم حالّەتە هۆكاری زۆری هەیە وكەمێكی زانستی ئەمڕۆ زانیویـەتی وزۆری تـەنها پـەروەردگار دەیزانێـت، سـەرەنجام ئـەو كۆرپەلەیـە وون دەبێت وتیادەچێت وبەمنالّداندا ڕۆدەچێتە خوارەوە.

**بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگە ڕوونكەرەوەكانی لاپەڕە ( ٣٩٧- ٣٦٥ )**

هەروەها لەوانەیە ئەوکۆرپەلەیە خۆی بچێنێتە ناو دیواری منداڵدانەوە، ولە قەبارەشدا گەورە ببێت بەڵام لە قۆناغێکی داهاتوودا تووشی لەبارچوون (Abortion) ببێت، وبەناو منداڵداندا رۆبچێتە دەرەوە.




تتجه الحويصلة التي تحمل البويضة من أعماق المبيض نحو السطح في مراحل متتالية حتى تنفجر على سطح المبيض طائرة إلى قناة فالوب التي تلتقطها بالأهداب الاصبعية التي بها وتحتضنها متوجهة بها بسرعة في اتجاه الرحم حيث يتم تخصيبها وما هي إلا أيام قلائل حتى تنغرس في جدار الرحم، وإذا هي علقة فمضغة فسلسلة معجزة من التطورات إلى أن تصير بشرا سويا.

سەبارەت بە لێکدانەوەی (غیض) بە لەبارچوون زۆرێك لە موفەسیران ئەم رایەیان هەیە، ئەوەتا لە کتێبی (المفردات في غريب القرآن للأصفهاني)دا هاتووە: (وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ:أي ما تفسده الأرحام فتجعله كالماء الذي تبتلعه الأرض) واتە: بە مانای ئەوە دێت کە منداڵدانەکان لەناوی دەبەن وخراپی دەکەن هەروەك چۆن زەوی ئاوقووت دەدات ولەناوی دەبات، (ئیبن عەباس وقەتادە) دەڵێن: (وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ:السَّقْطُ) واتە: بریتییە لە لەبارچوون، هەروەها (الضحاك) دەڵێت: (أن تُسْقِط المَرأة الولَد)، یان (حەسەنی بەسری) دەڵێت: (الذي يَكون سقطا لغير تمام) یان دەڵێت: (السَّقَط الناقص).

کەواتە پوختەی رای ئەم موفەسیرانە دەڵێت:(غیض) بریتییە لەوکۆرپەلەیەی کە لە سکی دایکی دەکەوێتە خوارەوە پێش تەواوبوونی دروست بوونی، یان بریتییە لەوکۆرپەلەیەی کە لەناومنداڵداندا لەناودەچێت وشیدەبێتەوە ومناڵدان قووتی دەدات وشوێنەواری نامێنێت، بابزانین زانستی کۆرپەلەزانیش لەگەڵ ئەم رایەدایە؟

بێگومـان بـەڵێ، چـونكە كۆرپەلـە كـە لـە ٨ هەفتـەی یەكـەمی تەمەنیـدا لەناودەچێت: یان ئەوەیە فڕێ دەدرێتە دەرەوە، یان شیدەبێتەوە وبە تـەواوەتی لەناو مناڵداندا نامێنێت.

زانایـانی كۆرپەلـەزانی ئـەم ٢ لەناوچـوونەی كۆرپەلـە بـە لەبارچـوونی خـۆیی سەرەتایی (Early Spontaneous Abortion) ناودەبەن، كە بە تەواوەتی لەگـەڵ ووتـەكانی ئـەو زانایانـەی تەفسیر وزمانەوانیـدا یەكدەگرێتـەوە كـە پێشـتر باسمانكرد.

لەبارچوونی خۆیی بە هەموو ئەو حاڵەتانەی لەبارچوون دەووترێت كە پـێش ٢٠ هەفتەی تەمەنی كۆرپەلەكە روودەدەن، كە زوربەی ئـەم حاڵەتانـە لـە ٨ هەفتـەی یەكەمدا روودەدەن، ئەم حاڵەتە زۆر باوە وزۆر جار ئافرەتەكە هەست بـە روودانـی ناكات، بەزۆری ئەوژنانەی كە سووڕەكەیان هەفتەیەك یان دوو هەفتە دوادەكـەوێت ودوایی بە ڕێژەیەكی زۆر خوێنی دامێنیان دەبێت، ئەمانە بـە حاڵـەتی لەبارچـوونی خۆیی دادەنرێن.

ڕێژەی ئـەم لەبارچـوونە پـێش ٤ هەفتـە دەگاتـە ٤٠٪ی سـكپڕییەكان، دوای ٤ هەفتـەش دەگاتـە ١٥–٢٠٪، ئیدمۆنـدز (Edmonds) وهاوڕێكـانی لـە سـاڵی (١٩٨٢)دا هەستان بـە توێژینەوەیـەك، ئـەویش بـە پشـكنینی میـز بـۆ سـەلماندنی سكپڕی لە (١٩٨) ئافرەتی تەندروستی ئامادە بۆ سكپڕیدا، بینییان كە (١١٨)یان دووگیانن، ئەوەبوولەدواییدا (٦٧)یان لەباریانچوو بـەبێ ئـەوەی خۆیـان بـزانن كـە سكپڕییان هەیە (ئەم ڕێژەیە زۆرجار دەگاتە ٦٠٪).

لە زۆرێك لە توێژینـەوەی تـر لەسـەر لەبارچـوونی خـۆیی بینـرا كـە كۆرپەلەكـە لەناو كیسەكەیدا نەماوە وشیبۆتەوە، نەبوونی كۆرپەلەكـەش لـە كیسـەكەیدا پێـی دەووترێـت توورەكـەی بـەتاڵی سـكپڕی، ئەمـە بەتایبـەتی لـە حاڵـەتی نـەمانی دووانەكان (Vanishing Twin Syndrome)دا بینراوە.




وێنەی سکپڕییەك لە هەفتەی شەشەمدا کە بە ئامێری سۆنەر گیراوە، و کیسی سکپڕی دەردەخات بەبێ بوونی کۆرپەلەکە، ئەمە حاڵەتێکی نەمانی کۆرپەلەکەیە لەناوسکدا.




درێژە برگەیەکی منداڵدان کە بە سۆنەر گیراوە و سکپڕییەکی دووانە دەردەخات کە یەکێکیان کۆرپەلەی تێدایە و ئەوی تریان نەماوە و خاڵییە، پاش ماوەیەکی تر ئەم کیسە خاڵییەش نامێنێت.

لەوانەشە کۆرپەلە لەناوچووەکە نەکەوێتە خوارەوە وبۆ ماوەیەکی زۆر لە منداڵداندا بمێنێتەوە، ئەم حاڵەتە پێیدەووترێت لەبارچوونی لەبیرچوو یان هەست پێنەکراو (Missed Abortion) کە قەبارەی منداڵدان بچووك دەبێتەوە وشلەی ئەمینیۆنی دەمژرێتەوە ولە کۆتاییدا ئەمیش بە کەوتنە خوارەوە دوایی دێت، لە هەندێك حاڵەتی دەگمەندا کۆرپەلەکە بە تەواوەتی نامێنێت، سەرچاوە پزیشکییەکان دەڵێن:تا ئێستا وەڵامی تەواوی ئەوپرسیارە نەزانراوە:بۆ هەندێك کۆرپەلە دوای مردنیان دەکەونە خوارەوە وهەندێکی تریان ناکەونە خوارەوە؟!




وێنەیەکی سۆنەریی کیسێکی سکپڕی لە هەفتەی شەشەمیدا، کە کیسەکە بە بەتاڵی دەبینرێت بەبێ بوونی هیچ کۆرپەلەیەك یان هاوپێچەکانی، کە رۆچووە و لەناوچووە، ئەمەش حاڵەتێکی لەبارچوونی لەبیرچووە.

لـه توێژینەوەیـەكی ئافرەتناسـیی نوێـدا هـەردووزانای ئینگلیـزی هێـرتیج وشیلدۆن (Hertig & Sheldon) كە لە ساڵی (١٩٤٣)دا لەسەر ١٠٠٠ حاڵـەتی لەبارچوونی خۆیی ئەنجامیاندابوو، بینییان كە كۆرپەلەكـە لـە ٤٩٪ی حاڵەتەكانـدا شێبۆتەوە وبەتەواوەتی نەمابوو.

حاڵـەتێكی تـر كـە ئێسـتا بەربلاویەكـەی دەركـەوتووە بریتییـە لـە حاڵـەتی لەناوچوونی دووانە (Vanishing Twin Syndrome)، كـە بینـراوە یـەكێك لە ٢ كۆرپـەلە دووانەكـە نامێنێـت ولەناودەچێت لـە مناڵدانـدا وهـیچ شـوێنەوارێكی نامێنێـت لـــە ســـەرەتای دووگیانیـــدا، ئەمـــە بـــەیارمـــەتی ئـــامێری ســـۆنەر (Ultrasound) دۆزراوەتەوە.

هەردووزانا (رۆبنسۆن وجـانیس) لـە سـاڵی (١٩٧٧)دا بەدواداچـوونیان كـرد بـە ئامێری سـۆنەر بـۆ ٣٠ ئـافرەتی دووگیـان كـە سـكەكەیان دووانـە بوولـە ٣ مـانگی یەكـەمی سـكپڕیدا، ئەنجامـەكان بـەم شـێوەیە بـوون: (١٤)یـان دووانـەیان بـوو، (١١)یان تەنها یەكی یەك مناڵیان بوو، یەكێكیان توورەكەی مناڵدانی خـاڵی فڕێدا، وچوارەكەی تر هیچیان نەبوو (كە كۆرپەلەكان لەلایەن مناڵدانەوە شی بووبوونەوە وهەڵمژرا بوون).

زانایانی موسوڵمان لە چەندین سەدە پـێش زانسـتی نوێـوە ئاماژەیـان داوە بـە كۆرپەلە لەناوچـووەكانی ناومناڵدانـەكان، ئـەوەتا زانـا (إبـن عطیـة الأندلسـي)یـش دەڵێـت:(غـیض) بریتییـە لـە لەناوچـوون ونـەمانی شـتێك لـە مناڵدانەكانـدا، خـوا پاداشتی خێری (شێخ عبـدالرحمن بـن ناصـر السـعدي) بداتـەوە كـە لـە تەفسـیری (تیسیر الكریم الرحمن في تفسـیر كلام المنـان)دا وەك ئـەوەی بڵێیـت توێژینـەوەی لەسـەر كۆرپـەلـە لەناوچـووەكان كردبێـت یـان لـە نـوێترین سەرچـاوەی پزیشـكیدا خوێندبێتیەوە كە دەڵێت: (وَمَا تَغِيضُ الأرْحَامُ) واتە: كەم دەكات لەناویدا، بەوەی كە یان سكپڕیەكە لەناودەچێت (كە وەك ووتمان ئەمە ئەو كۆرپـەلانەیە كە مناڵدان

فرێ یان دەدەنە دەرەوە)، یان بچووك دەبێتەوە (کە وەك ووتمان ئەمە بریتییە لە لەبارچوونی لەبیرچوو کە کۆرپەلەکە دەچێتەوە یەك وبچووك دەبێتەوە)، یان بە تەواوەتی نامێنێت (کە بریتین لەوکۆرپەلانەی لەناومناڵدانەکاندا لەناودەچن وشی دەبنەوە وشوێنەواریان نامێنێت).

ئەم تەفسیرەی ئاماژەکەی قورئان ئیعجازێکی زانستی گەورەی تێدایە، چونکە عەرەب لەگەڵ ئەوەشدا کە مانای زاراوەی (غیض)یان دەزانی بەلاّم بە هیچ شێوەیەك بۆ مناڵدانەکان وبە زاراوەی (وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ) بەکاریان نەهێناوە، کە ئەمە پێشدەستییەکی گەورەی قورئانە، ولە رۆژگاری ئەمڕۆماندا لەگەڵ بەرەوپێش چوونی کۆرپەلەزانیدا مانا وورد وگشتگیرەکەی بە تەواوەتی دەرکەوتووە.

ووردەکاریی وداهاتووی کۆرپەلە تەنها خودا نەبێت کەس نایزانێت، دیارە زانستی پزیشکی هەندێك لە لەبارچوون وهۆکارەکانی زانیوە بەلاّم هەمووراستییەکانی تەنها لەلای پەروەردگارە کە تەنها ئەوپاشەرۆژ (بەتایبەتی پاشەرۆژی کۆرپەلە) دەزانێت.

کەواتە لەمانەی پێشەوە بۆمان دەرکەوت کە کرداری وونبوون، تیاچوون ورۆچوون بەناومناڵدانەکاندا لە هەمووقۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلەدا هەلی روودانی هەیە، وتەنها پەروەردگار زانیاریی تەواوی لەسەریان هەیە، کە ئەمانە هەمووی سەلمێنەری کرداری (غیض)ن وەکوچۆن لە دەقە پیرۆزەکاندا هاتووە وهەموومانا کانی بە روونی دەرکەوتن.

ئەگەر زۆر بە کورتی مانای تەواوی (غیض) وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە باس بکەین، دەبینین کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکات کە نوتفە وەك چۆن تۆوبەناوزەویدا رۆدەچێت وشوێنی خۆی دەکاتەوە، بە هەمان شێوەش ئەم نوتفەیە دیواری مناڵدان شەق دەکات وتێیدا دفن دەبێت ودیار نامێنێت.

هەربۆیە دەبینین هەمووکتێبەکانی توێکاری وکۆرپەلەزانی ئەم کردارە بە چاندن (الغرس Implantation) باس دەکەن.

منالّدان بە زەوی دەشوبهێنن کە کاتێك تۆوی تێدا دادەنرێت ودوایی دەروێت، زانایانی کۆرپەلەزانی بە خەیالّی خۆیان وادەزانن کە وەسفێکی وورد وبێوێنەیان کردووە بۆ ئەم کردارەی کۆرپەلەزانی کە لەگەلّ واقیعدا دەگونجێت، بەلاّم بێگومان بە تەواوەتی سەریان دەسورمێت کاتێك دەبینن قورئانی پیرۆز وەسفی ئافرەتی بەمە کردووە: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ...﴾ (البقرة:٢٢٢) واتە: خێزانەکانتان شوێنی چاندنی ئێوەن!!




کەواتە خوێنەری بەڕێز تێبینی ئەوە بکە کە نوتفەکە رۆدەچێتە ناو منالّدانەوە ولەلایەکی ترەوە کە دەچێتە ناودیوارەکەی رووپۆشەکەی لەدەست دەدات، وبەشێکیش لە کۆرپەلەکە جیادەبێتەوە بۆ دروست کردنی ووێلاّش، وبەشەکەی تری دەمێنێتەوە بۆ دروستکردنی منداڵەکە، کەواتە رۆدەچێت ولێی کەم دەبێتەوە بە تەواوەتی وەك ماناکانی زاراوەی (غیض) کە هیچ زاراوەیەکی تر نییە هەردوو ئەم مانایە لەخۆ بگرێت.

## تێبینیەکی پێویست:

لە ئایەتێکی قورئاندا باسی کلیلەکانی غەیب کراوە کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (لقمان:٣٤) واتە: عیلم وزانینی کاتی رۆژی دوایی تەنها لای خودایە، وهەرئەویشە کە باران دەبارێنێت، ودەزانێت چی لەناو منداڵدانەکاندایە، وهیچ کەسێك نازانێت کە سبەینێ کاری چی دەبێت وچی روودەدات، وکەسیش نازانێت کە کەی ولەکوێ دەمرێت، بەڕاستی خودایە کە زانا وشارەزایە بە هەموو شتێك.

هەروەها لە فەرموودەیەکی پێغەمبەریشدا (ﷺ) روونکردنەوەی ئەمانە هاتووە کە دەفەرموێت: ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: «مَفَاتِيحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ اللَّهُ: لاَ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَتَى يَأْتِي الْمَطَرُ أَحَدٌ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِلاَّ اللَّهُ ، وَلاَ يَعْلَمُ مَتَى تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ اللَّهُ»﴾ (رواه البخاري) واتە: کلیلەکانی غەیب وشتە شاراوەکان کە تەنها خودا دەیانزانێت پێنجن: تەنها خودا دەزانێت کە سبەینێ (واتە لە داهاتوودا) چی روودەدات، وتەنها خودا دەزانێت کە ئەوەی لەناو منداڵدانەکاندا رۆدەچێت چییە ....

دەربارەی ئەم کلیلانەی غەیب گفتوگۆی زۆر کراوە لە نێوان قوتابیانی قوتابخانە ئاینییەکان وقوتابیانی قوتابخانە زانستییەکانەوە، بە تایبەتی دەربارەی رەگەزی کۆرپەلەکە کە ئایا نێرە یان مێیە؟

ئەمان بەشێوەیەکی رووکەشیانە دەڵێن: کە کەس بۆی نییە بە رەهایی ئەمە بزانێت، وئەوانیش بە بێبڕوایی دەڵێن: زانست مادەم ئێستا ئەمە دەزانێت کەواتە دەقەکان هەڵدەوەشێنێتەوە؟!

زانایانی موسوڵمان لەم سەردەمەدا زۆر خەریکی ئەمە بوون، وپاش هەوڵێکی زۆر گەیشتنە مانا راستەقینەکەی ئایەتەکە لەژێر رۆشنایی زانستی نوێدا، بەڵام تێبینی ئەوەیان نەکردووە کە ئیمامی راڤەکاری قورئان (إبن کثیر) پێش چەندین سەدە هەمان بۆچوونی هەبووە دەربارەی ئایەت وفەرموودەکە، خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی ئەم ئایەتەیان لێك دەدایەوە ودەیانووت ئەوەی بڵێت من دەزانم چی لەسکی دایکدایە ئەوا بێباوەڕ بووە ! !

بەڵام زانای موسوڵمان (إبن کثیر) هەموودەقەکانی لەم بابەتەدا کۆکردووەتەوە وپاشان گەیشتە راڤەی دروستی ئەم بابەتە، باشە چۆن دەبێت بەڕەهایی بڵێین زانینی ئەوەی لە سکی دایکدایە بریتییە لە کلیلێکی غەیب؟!




رۆچوونی کۆرپەلە لە منداڵداندا و زیادبوونی منداڵدانەکان بە پێی ئایەتی:

[... وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ ....]

ئەی ئەوە نییە لە فەرموودەی تردا هاتووە کە دوای ٤٢ رۆژ فریشتەکان دەزانن کە ئەوکۆرپەلەیە نێرە یان مێیە؟ رزق وڕۆزی چییە؟ ئایا خۆشبەخت یان بەدبەخت دەبێت؟

لێرەدا ئیمامی (إبن کثیر) زۆر بەجوانی مانای هەموو

فەرموودەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە ودەڵێت:هیچ کەسێك دەربارەی ئەوەی لەسکی دایکدایە (کۆرپەلە) هیچ زانیارییەکی نییە پێش زانینی فریشتەکان بەوزانیاریانە، هەر کاتێکیش فریشتەکە زانی ئیتر ئێمەش توانای زانینیمان دەبێت، لەبەر ئەوەی غەیری پەروەردگار پێی زانیوە، کە بریتییە لە فریشتەکە وئەوانەی کە پەروەردگار وویستی هەبێت بزانن لە بەندەکانی.

کەواتە ئەوفەرموودانەی پێغەمبەر (ﷺ): لەوانە فەرموودەی: ﴿عَنْ أَبِى الزُّبَيْرِ الْمَكِّيِّ أَنَّ عَامِرَ بْنَ وَاثِلَةَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ:الشَّقِيُّ مَنْ شَقِيَ فِي بَطْنِ أُمِّهِ وَالسَّعِيدُ مَنْ وُعِظَ بِغَيْرِهِ . فَأَتَى رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يُقَالُ لَهُ حُذَيْفَةُ بْنُ أَسِيدٍ الْغِفَارِيُّ فَحَدَّثَهُ بِذَلِكَ مِنْ قَوْلِ ابْنِ مَسْعُودٍ، فَقَالَ: وَكَيْفَ يَشْقَى رَجُلٌ بِغَيْرِ عَمَلٍ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: أَتَعْجَبُ مِنْ ذَلِكَ فَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: {**إِذَا مَرَّ بِالنُّطْفَةِ ثِنْتَانِ وَأَرْبَعُونَ لَيْلَةً بَعَثَ اللَّهُ إِلَيْهَا مَلَكاً فَصَوَّرَهَا وَخَلَقَ سَمْعَهَا وَبَصَرَهَا وَجِلْدَهَا وَلَحْمَهَا وَعِظَامَهَا، ثُمَّ قَالَ:يَا رَبِّ أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى؟ فَيَقْضِى رَبُّكَ مَا شَاءَ وَيَكْتُبُ الْمَلَكُ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ أَجَلُهُ . فَيَقُولُ رَبُّكَ مَا شَاءَ وَيَكْتُبُ الْمَلَكُ، ثُمَّ يَقُولُ يَا رَبِّ رِزْقُهُ . فَيَقْضِى رَبُّكَ مَا شَاءَ وَيَكْتُبُ الْمَلَكُ، ثُمَّ يَخْرُجُ الْمَلَكُ بِالصَّحِيفَةِ فِى يَدِهِ فَلاَ يَزِيدُ عَلَى مَا أُمِرَ وَلاَ يَنْقُصُ**}﴾ {رواه مسلم}، ئەم فەرموودانە تایبەتین ورافەی دەقە گشتییەکەی قورئانیان کردووە: ﴿**إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ** ....﴾، ولێرەوە بۆمان روون بووەوە کە ئەوەی شاراوەتەوە لە کاتێك وقۆناغێکی دیاری کراوی گەشەی کۆرپەلەکەدایە نەك بەگشتی.

ئەگەر بڕوانینە فەرموودەکەی پێغەمبەریش (ﷺ) کە دەفەرموێت: ﴿**مَفَاتِيحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ اللَّهُ: لاَ يَعْلَمُ مَا فِى غَدٍ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ إِلاَّ اللَّهُ** ....﴾ (رواه البخاري) واتە: کلیلەکانی غەیب وشتە شاراوەکان کە تەنها خودا دەیانزانێت پێنجن: تەنها خودا دەزانێت کە سبەینێ (واتە لە داهاتوودا) چی

روودەدات، وتــەنها خــودا دەزانێــت كــە ئــەوەی بــەناو مناڵدانەكانــدا ڕۆدەچــێت چییە....

دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەكەدا تەنها باسی (مَا تَغِيضُ الأرْحَامُ)ی كـردووە واتــە ئــەوەی لــە مناڵدانــدا ڕۆدەچــێت، وباســی زاراوەی (وَمَــا تَــزْدَادُ)ی ئایەتەكەی نــەكردووە (بــە مانــای ئــەوەی لــە مناڵدانەكانــدا زیــاد دەبــن)، ئەمــەش بەڵگەیەكی ترە كە ئەوەی كـەس نایزانێت تــەنها پــەروەردگار نــەبێت وئــەوەی لــە عیلمی غەیری خودا شارراوەتەوە تەنها لە قۆناغی ڕۆچوون و(غَیض)دایە، نــەك لــە قۆناغی زیـادبوونی مناڵدانەكانـدا، چـونكە لــەو قۆنـاغی ڕۆچـوونەدا مەحاڵـە كــەس بزانێت كە ئەو كۆرپەلەیە چییە وچی دەردەچێت؟ ئەمــەش وەك ئــەوە وایــە كــە وەستایەك ٢ ڕیز بەرد هەڵچنێت وبڵێت من لەم بەردانــە بینایــەك دروســت دەكــەم؟ ئایا لەو قۆناغەدا كەس دەزانێت بەهۆی ئەو ٢ ڕیزە بەردانەوە كە ئایا لە داهاتوودا ئەوبینایــە چــی دەبێــت؟! ئایــا نەخۆشــخانە دەردەچــێت؟ یــان قوتابخانــە؟ یــان خانوویەكی نیشتەجێ بوون؟! بێگومان نەخێر...

مرۆڤیش لەوقۆناغەدا تەنها لە دووریز خانــە پێــك هــاتووە، ئەگــەر زۆر هــەوڵیش بدەین وبمانەوێت بزانین ئەوكۆرپەلەیە چییە سەركەوتوو نابین، چونكە بــۆ نموونــە ئەگەر تەنانەت خانەیەكیش وەرگرین لە كۆرپەلــە لەوكاتــەدا لەوانەیــە ببینــە هــۆی لەبارچوون ولەناوبردنی كۆرپەلەكە، چونكە ئەو خانەیە لەوانەیە ئەوە بێـت كــە لــە داهــاتوودا كۆئەنــدامی هەناســە دروســت دەكــات (بــابزانین كــە هەموونەندامــەكانی كۆرپەلە لەوكاتە سەرەتایەدا لە یەك خانە یان زیاتر پێكهاتووە).

دەربــارەی ئــەم بابەتــە پرۆفیســۆر (عبدالمجیــد الزنــداني) ســەرۆكی زانكــۆی (الإیمــان) لــە (یەمــەن) پرســیاری كــرد لــە توێكارینــاس وكۆرپەلەناســی ئــەمریكی (مارشاڵ جۆنسۆن) كە یەكێكە لە زانا پسپۆڕەكانی جیهان بــە تایبــەتی لــە بــواری زانستی بۆماوەیی وویژینەوە لە كرۆمۆسـۆمەكان لــە ئــەمریكادا، لێــی پرســی: ئایــا

ئێـوه هەوڵتانـداوه بـزانن سـيفاتی کۆرپەلـه چـييه لـه قۆناغـه سـەرەتاييەکانيدا بەتايبەتی لە کاتی ڕۆچوونی لەناومناڵداندا؟ ئەويش ووتی:بەڵێ، من خـۆم چـەندين تـاقی کردنـەوەم لەسـەر هەنـدێك لـه کرۆمۆسـۆمەکان کـرد (کـه هـەڵگری سـيفاتی بۆماوەيين)، وئەم توێژينەوەيەم زياتر له ١٠ساڵی خاياند، که من هـەوڵم دەدا بـزانم چۆن ئەم زينـدەوەره گەشـه دەکات لەمانـەوه؟ وچـی شـتێك لەمـەوه بەتايبـەتی گەشه دەکات؟

(زيندانی) دەڵێت لێم پرسی: ئـەنجامی ئـەم تاقيکردنـەوه وتوێژينەوەيـەت چـی بـوو؟ ئـەويش ووتـی: مـن گريـام پـاش ئـەو ماوەيـه، لەبەرئـەوەی شکسـتم هێنـا ونەمتوانی هيچ شتێك لەوبارەيەوه بدۆزمەوه وبـزانم، زينـدانيش دەڵێـت پـێم ووت: دەستت خۆش بێت، بەڵام بزانه که ئەم شـته لـەلای ئێمـه ئامـاژەی پێـدراوه، کـه کەس ناتوانێت لەو قۆناغـەدا هـيچ دەربـارەی کۆرپەلەکـه بزانێـت وتێبگـات ئەگـەر زۆريش هەوڵ بدات.

کەواتـــه وەك زانـــا (إبـــن کـــثير) زۆر بـــەجوانی لێکـــی داوەتـــەوه: شـــاررراوەيی سـيفاتەکانی کۆرپەلەکـه ونـەزانين دەربـارەی تـەنها لـه ماوەيـەکی دياريکراودايـه، وهەر کاتێك که فريشتەکه زانـی ئـيتر ئـەم شـارراوەييه نامێنێـت، وفەرموودەکـەی پێغەمبـەريش (ﷺ) ئـەوەی بـۆ روون کردووينەتـەوه کـه لـه قۆنـاغی ڕۆچـوون (غَيض)دا به تەنها نازانرێت، وئەمەيه که يەکێکه له کليلەکانی غەيب وشـارراوەيه، پاشـان کاتێـك کۆرپەلەکـه يەکسـەر دەچـێته قۆنـاغی زيادبوونـەوه، ئـەوا ئـەم زانياريیانـــه دەکرێنـــەوه بـــۆ مرۆڤـــەکان، ودەتـــوانين ئێمـــەش وەك فريشـــتەکان زانياريمان لەم بارەوه دەست بکەوێت.

ئەوەشمان لەبير نەچـێت کـه ديـاريکردنی سـيفاتی بۆمـاوەيی ئـەم زينـدەوەره نوێيه کـه لەسـەر کرمۆسـۆمەکان نووسـراوه، وتێکـەڵاويی ئـەم سـيفاتانه لـه دايـك وباوکەوه، وکام سيفەت زاڵ وکـام سـيفەت بـەزيودەبێت دووپـاتی دەکەينـەوه کـه

ئەمانە هەمووی تەنها لە زانیاری خودادایە، وهیچ مرۆڤێك وهیچ تەكنۆلۆژیایەك لەم سەرەتایەی كۆرپەلەدا ناتوانێت بیزانێت، بۆ نموونە: ڕەنگی چاو، ڕەنگی پێست، ڕاددەی زیرەكی وژیریی، سیفاتی ماسولكەكان وتواناكانی، توانا دەمارییەكانی، وشتەكانی تری كۆرپەلەكە ئایا چۆن دەردەچێت؟ هەرچەندێك زانست بەرەوپێش بچێت ناتوانێت دیارییان بكات.

پاك وبێگەردی بۆ ئەوپەروەردگارەی كە كلیلی هەموونهێنییەكان لەلای ئەوە، وهەر ئەوە كە گەورەترین ووردەكارترین دروستكەرە.




كرۆمۆسۆمەكان كە هەلگری سیفاتی بۆماوەیی كۆرپەلەكەن

## زیادبوونی منالدانەكان (إزدياد الأرحام):

هەمان ئایەتی پیرۆزی سەرەوە: ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ﴾ باسی ڕوودانی كردارێكی تر دەكات لەناو منالدانەكاندا كە تەنها پەروەردگار زانیاری دەربارەی هەیە، كە ئەویش زیادبوونی منالدانەكانە.




**کۆرپەلە لە پیتاندنەوە تاوەکو چاندن لە دیواری منالّداندا:**

1: قۆناغەکانی دروست بوونی هێلکۆکە. 2 , 3: یەکگرتنی سپێرم و هێلکۆکەکە.

4: گەشتی هێلکەی پیتێنراو (زایگۆت) بۆ ناو منالّدان کە بە خۆچاندن لە دیوارەکەیدا کۆتایی دێت.

5: وێنەیەکی راستەقینەی ووردبینیی کۆرپەلەیەك کە خۆی چاندووەتە ناو دیواری منالّدان و لە دیوارەکەیدا وەك نوکتەیەك و بەرزاییەك دەرکەوتووە.

زانایانی کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکەن کە لە ڕۆژی دوانزەیەمینی گەشەی کۆرپەلەکەدا بەرزاییەکی بچووك بەقەدەر نوکتەیەك لە دیواری منالّدانەوە دەردەکەوێت، کە بریتییە لەوکۆرپەلەیەی خۆی چاندووە، وئەمەیان وەك سەرەتای زیادبوونی منالّدان بەهۆی کۆرپەلەکەوە دیاریکردووە، کە پاشان ئەم نوکتەیە وورده وورده زیاد دەکات لەگەڵ بەرەوپێش چوونی گەشەی کۆرپەلەکەدا وسەرەنجام هەموو ناومنالّدان پڕدەکاتەوە.




## چوونە ناوەوەی کۆرپەلەکە بۆ ناو منالّدان وجێگیر بوونی:

وەك پێشتر باسمان کرد یەکێك لە ماناکانی (غیض) بریتییە لە چوونە ناوەوە، کەواتە مانای ئایەتی (اللّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ ...) دەبێت

بەوەی: (کە تەنها خوای گەورە دەزانێت کە ئەوەی هەر مێینەیەك هەڵیگرتووە، وئەوەی کە دەچێتە ناومناڵدانەوە وقووتی دەدات)، کە وەك ووتمان ئەمە وەسفێکی ووردی ئەوکردارەیە کە روودەدات لە چوونە ناوەوەی کۆرپەلە بۆ دیواری مناڵدان، ئەویش پاش هەڵکۆڵینی دیوارەکەی وچوونە ناوەوەی بۆ ناوئەستووریی دیوارەکە وپاشان داخرانی شوێنی چوونە ناوەوەکە.

لێرەدا لەوانەیە خەڵکێك بپرسێتەوە: بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکدا پێمان رادەگەیەنێت: ﴿وَلا يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الأرْحام إلاّ الله ...﴾ (رواه البخاري) واتە: تەنها خودا خۆی دەزانێت ئەوانەی لە مناڵدانەکاندا دەچنە ناوەوە ورۆدەچن، وون دەبن وتیادەچن چین؟ لە کاتێکدا زانایان لەمرۆدا گەیشتوونەتە دەرخستنی ئەو کردارانەی کە لەناو مناڵدانەکاندا روودەدەن؟

لە وەڵامدا دووبارە دەڵێین: ئەوکەسانە بێئاگابوون لەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ووشەی (تغيض)ی بەکارهێناوە، کە ئەم ووشەیە مانای چوونە ناوەوە ورۆچوون بۆ ناو رووکاری مناڵدان دەگەیەنێت، کە لێرەوە دەتوانین بڵێین (وەك لە پێشتردا زیاتر روون کراوەتەوە) زانیاریی خەڵکی دەربارەی ووردەکارییەکانی قۆناغەکانی دروستبوونی کۆرپەلە تەنیا قۆناغەکانی دوای چاندن وچوونە ناوەوە (غيض) دەگرێتەوە، نەك قۆناغەکانی پێش ئەمە، ئەگینا خوای گەورە تەحەددای مرۆڤەکانی نەدەکرد بەوەی کە زانیارییان لە گەردوون ولەشی خۆیاندا بۆ دەردەکەوێت کە ڕاستی فەرموودەکانی قورئان دەردەخەن، هەروەك لە ئایەتی (٥٣)ی سوورەتی (فصلت)دا هاتووە:

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أنَّهُ الْحَقُّ أوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ واتە: ئێمە لە پاشەڕۆژدا نیشانی خەڵکی دەدەین بەڵگەکانمان لە ئاسۆکان ولە جەستەی خۆشیاندا بۆ ئەوەی کە بۆیان دەربکەوێت ئەم کتێبەی پەروەردگار (قورئانی پیرۆز) هەق وراستییە، کەواتە زانیاریی خەڵکی

تەنیا دیاریکراو دەبێت بەوەی کە فەرموودەکـە باسـی کـردووە وپێشـتر بـەووردیی ئاماژەمان پێدا.

قۆنـاغی رۆچـوون وچـوونە نـاوەوە (غـیض) دوای قۆنـاغی پیتانـدنی هێلکەکـە ودوای دابەشبوونی وکەوتنە ناو منالّدانەوە دێت، لەبەرئەوە کەس ناتوانێت بزانێـت وردەکارییەکانی ئەم پیتاندنـە لەناوسـکی دایکدا چیـن وئایا چی لێدەکەوێتـەوە؟ ورەگەز وسیفاتی کۆرپەلەکە چـی دەبێـت دوای پیتانـدن؟ هـیچ ئامێرێـك ناتوانێـت ئەمە بدۆزێتەوە وبگاتە ئەنجام بۆیە پەروەردگار عیلم وزانیـاریی ئـەم شـتانەی کـە لەناوسکی دایکدا روودەدات تەنیا تایبەت بەخۆیەوە کردووە.

هێلکەی پیتێنراو کە دابەش دەبێت بۆ چەند خانەیەك ولـەناو دیـواری منالّدانـدا نوقم دەبێت درێژییەکـەی (لـە رۆژی هەشـتەمدا) تـەنیا ۷،۰ میللیمـەترە، کـە ئـەم نوتفەیـە شـێوەی دەرەوەی وورده وورده لەدەسـت دەدات ولـە شـکڵی تنۆکێـك ئاو(نوتفـە) دەردەچێت کاتێـك کـە دەچـێتە ناوپۆشـی منالّدانـەوە، ئـەم کۆمەڵـە خانەیە جیادەبنەوە بۆ ۲بەش: بارستەخانەی دەرەوە وبارستەخانەی ناوەوە.




کۆرپەلە لە دوو بارستە خانە پێکدێت کە خۆی دەتووسێنێت بە دیواری منالّدانەوە، ئەویش بە هۆی گەلدە پێکانییەوە.

بارستەخانەی دەرەوە چواردەوری بارستەخانەی ناوەوە (کۆرپەلەکە) دەدات، ولە کۆتاییدا لەگەڵ ناوپۆشی منداڵدانـدا یەکدەگرێت وبەم شێوەیە (نوتفەکە) شێوەی دەرەوەی (کە لە تنۆکێك ئاودەچێت) بەتەواوەتی لەدەست دەدات، بەم شێوەیە تەنیا بارستەخانەی ناوەوە دەمێنێتەوە وەك بەشێکی سەرەکی بۆ دروستکردنی سیستم وئەندامەکانی کۆرپەلەکە.

ئەگەر بزانین ئەم بارستەیە کۆمەڵێکی ئێجگار زۆرە لە خانە (کە ژمارەیان بە ٢٠٠٠ خانە مەزەندە دەکرێت لە رۆژی دوانزەیەمدا) ولە قەبارەیەکی زۆر بچووکدان کە لە دوایەمین رۆژی رۆچوونەکەدا (کە دەکاتە رۆژی چواردەیەم و لە کۆرپەلەزانی نوێدا بە قۆناغی ژمارە ٧ ئاماژەی بۆ دەکرێت) قەبارەی کۆرپەلە تەنیا (٨،٠) میللیمەترە لەناو ناوپۆشی منداڵداندا، ئیتر چۆن تەصەور دەکرێت کە نهێنییەکانی ناوی ئاشکرا بکرێت؟! مەگەر تەنیا لە حاڵەتی دەرهێنانی لە منداڵدانەوە بۆ دەرەوە نەبێت!

یەکێك لەونموونانەی کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە رووداوەکانی پێش رۆچوونی نوتفەکە بەناودیواری منداڵداندا (غیض) بریتین لە نهێنی لای پەروەردگار ئەوەیە کە وەك پێشتر باسمان کرد کاتێك کە هێلکەکە لەلایەن سپێرمەوە دەپیتێنرێت دواتر دابەش دەبێت بۆ چەند خانەیەك، ئەم خانانە بەتەواوەتی لەیەك دەچن تا ژمارەیان دەبێت بە ٨ خانە (واتە لە قۆناغی لەتووچوو(Morula)دا دەبێت)، ئیتر دوای ئەمە تۆپەڵە خانەکە ووردە ووردە دەست دەکەن بە جیاواز بوون وبەردەوام دەبن لەسەر دابەشبوون، تا ژمارەیان دەگاتە ٥٠ خانە، ئیتر لەگەڵ بەردەوام بوونی دابەشبووندا ئەم تۆپەڵە خانەیە دەبن بە دووبارستەوە:

یەکێکیان کە لە داهاتوودا کۆرپەلەکە دروست دەکات پێیدەووترێت (بارستەخانەی ناوەوە)، ئەوی تریان کە ووێلاش دروست دەکات پێیدەووترێت

(بارستەخانەی دەرەوە)، پاشان خانەکانی بارستەی ناوەوە (کە کۆرپەلەکە دروست دەکەن) دەبن بە ٣ چین:

١- چینی دەرەوە (ئیکتۆدێرم Ectoderm)

٢- چینی ناوەڕاست یان میزۆدێرم (Mesoderm)

٣- چینی ناوەوە (ئیندۆدێرم Endoderm)

سەبارەت بەوەی کە ئایا هەر خانەیەك چۆن دەزانێت کە دەچێتە چ گرووپێکەوە؟ ئایا بۆ بارستەخانەی دەرەوە یان ناوەوە، یان چینی دەرەوە یان ناوەڕاست یان ناوەوە دەچێت؟ وئایا بەشداری لە دروست کردنی چ ئەندامێکدا دەکات؟ ئەمە بابەتێکی نادیارە تا ئێستا وتەنها لە زانیاریی پەروەردگاردایە، لەم بارەیەوە (د. لارس هامبیرگەر) شارەزای کۆرپەلەزانی وەك شایەتییەك دەڵێت: (ئەمە یەکێکە لە نهێنییەکانی ژیان کە تا ئێستا سەرسامی کردووین، وبابەتی چەندین لێکۆڵینەوەی زانستیی بەرفراوانە)[19].

لێرەشدا بابزانین کە مەبەستی پەروەردگار لە ئایەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (لقمان:٣٤) واتە: بەڕاستی هەر خودا خۆی زانیاری بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت دەزانێت، بارانیش هەر ئەودەیبارێنێت، دەزانێت چی لە سکی دایکاندا هەیە، هیچ کەس نازانێت سبەی چی بەسەردێت وچی دەست دەکەوێت (لە بەرهەمی ماددی ودنیایی یان لە زەخیرە وتوێشووی قیامەت)، هیچ کەسیش نازانێت لەسەر چ زەوییەك دەمرێت وکۆتایی بە ژیانی دێت (هەروەها کاتی مردن وچۆنێتییەکەیشی شاراوەیە)، بەڕاستی خودا بە هەموو شتێك زانا وئاگادارە.

---

[19] لە کتێبی: منداڵێك لەدایکبوو (A Child is Born).

جارێکی تر دەڵێین: مەبەستی پەروەردگار لەوەی کە تەنیا خودا دەیزانێت کە چی لەسکی دایکدایە ئەوەیە کە ئایەتی: ﴿اللّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ﴾ روونی کردۆتەوە، کە بریتییە لە کۆرپەلە لە قۆناغی پێش چوونە ناوەوە ورۆچوونی بەناو دیواری منداڵداندا.

تەنیا پەروەردگار ئاگاداری سیفاتەکانی و ووردەکاریەکانێتی، وهیچ مرۆڤێك ناتوانێت ئەو زانیارییانە لەوکاتە دیاریکراوەدا دەربارەی کۆرپەلە لەسکی دایکیدا دەست بخات.

رۆچوونی کۆرپەلە بە دیواری منداڵداندا هاوشانە لەگەڵ بڵاوبوونەوەیەکی چڕی خانە هەڵکۆڵەرەکان بەناو ناوپۆشی منداڵداندا کە ئەم پرۆسەیە یارمەتی جێگیر کردنی کۆرپەلەکە دەدات لەناو منداڵداندا، هەروەك لە فەرموودەی: ﴿يَدْخُلُ الْمَلَكُ عَلَى النُّطْفَةِ بَعْدَ مَا تَسْتَقِرُّ فِي الرَّحِمِ بِأَرْبَعِينَ أوخَمْسَةٍ وأَرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾دا روونکراوەتەوە [20]، ئەمەش ئیعجازێکە کە پێغەمبەر (ﷺ) بە ووردی کاتی جێگیر

---

[20] لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: ﴿روي عن النبيّ (ﷺ) أنه قال لأحد الصّحابة: ما وُلِدَ لَكَ؟ قالَ الرَّجُل: يا رسول الله:ما عَسَى أن يُولَد لِي إمّا غُلام وإمّا جارِيَة! قالَ: فمَن يَشْبه؟ قال: يَا رَسولَ الله: ما عَسَى أن يُشْبِه؟ إمّا أباهُ وإمّا أُمَّه! فقال الرَّسول -صلوات الله عليه وسلامه-: مَه! لا تَقُولَنَّ هذا، إنَّ النُّطْفة إذا استقرَّت في الرَّحِم أحْضَرَها اللهُ تعالى كلَّ نَسَبٍ بينها وبَين آدَم، أما قَرَأْتَ هذه الآية في كِتاب الله تعالَى: ﴿في أيِّ صُورَةٍ مَّا شَاء رَكَّبَكَ﴾ (الإنفطار:٨) قال: شَكَّلَك﴾ (رواه الطبراني بسند ضعيف جداً) واتە: دەگێڕنەوە کە رۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) لە یەکێك لە هاوەڵەکانی پرسی: چیتان بووە؟ ئەویش ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا لەوانەیە چیم ببێت! یان کورە یان کچە، پێغەمبەر پرسی: ئەی لەکێ دەچێت؟ ئەویش ووتی: لە کێ بچێت! یان لە باوکی یان لە دایکی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەسەرخۆ بە، وامەڵێ، هەر کاتێك کە نوتفە لە منداڵداندا جێگیر دەبێت، خوای گەورە هەموو نەوەکانی پشتی پێش خۆی بۆ دێنێت (کە لەوانەیە لە هەر یەکێکیان بچێت)، ئایا ئێوە ئەو ئایەتەی پەروەردگارتان نەخوێندۆتەوە (لەسەر هەر شێوە وشکڵێك ئارەزووی لێبێت دروستتان دەکات)، کە مەبەست لە (رَكَّبَكَ)

بوونی کۆرپەلەکەی دیاریکردووە لەچاو ماوەی زۆری دووگیانیدا (کە ٩ مانگە)، وهەروەها بە بوونی ئەو رووداوە جۆراوجۆرانەی کە لەم ماوەیەدا بەدوای یەکدا دێن، لێرەدا زۆر سەرسوڕهێنەرە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەیداوە بۆ ئەوەی کە لەم کاتەوە ٢ پرۆسە لە یەك کاتدا روودەدەن.

## سەرچاوە:

کتێبی (ئاماژەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان وسوننەتدا) – نووسینی: د.کاوە فەرەج سەعدون– چاپی یەکەم–٢٠٠٨.

---

بریتییە لە دیاری کردنی شکڵتان، ئەم فەرموودەیە لەگەڵ ئەوەشدا کە لاوازە بەڵام ئاماژەیەکی جوانی تێدایە لەسەر ئەوەی کە کۆرپەلەکە لەوانەیە لە یەکێك لە باو وباپیرانی بچێت، لەبەرئەوەی کە پیلانی بۆماوەیی کۆرپەلەکە لەوانەیە لەسەر هەر یەکێك لەو شێوازانەی پێش خۆی بێت، کە ئەمەش بوارێکی غەیبی ونادیارە ولەو سەردەمەدا زانیاریی لەسەر نەزانراوە (کە پیلانێکی جینی هەیە بۆ دروستبوونی کۆرپەلە)، ئەم لێتێگەیشتنە بۆ بەهێزکردنی مانای فەرموودەکەی سەرەوەش دەست دەدات چونکە ئاماژەی تێدایە کە دروستبوون وکامڵ بوونی کۆرپەلەکە دوای جێگیربوونی لەناومناڵداندا دەبێت.

# ئیعجازی زانستی له زاراوەی (زیادبوونی منالْدانەکان)دا

خوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿اللَّـهُ يَعْلَـمُ مَـا تَحْمِـلُ كُـلُّ أُنثَـى وَمَـا تَغِـيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَـيْءٍ عِنـدَهُ بِمِقْدَارٍ﴾ (الرعـد:٨) واتـە: تـەنیا پـەروەردگار خۆی دەزانێت کە ئافرەت لـەکاتی دووگیانیـدا چـی هـەلْگرتووە، هـەروەها ئـەویش ئاگادارە بە رۆچوونی منالْدانـەکان (واتـە ئەوانـەی لـە منالْدانەکانـدا ڕۆدەچـن وتیـا دەچـن)، وبـە زیـادبوونی منالْدانـەکانیش ئاگـادارە، وهـەموو شـتێك لای ئـەو بـە ئەندازەیە وقەدەری ووردی خۆی بۆ دانراوە.

تۆ بلێی ئەوانەی لەناومنالْدانەکاندا ڕۆدەچن یان زیاد دەکەن چی بن؟!

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە ئایەتە پیرۆزەکە باسـی ٢ کـردار دەکـات کـە لـە منالْداندا ڕوودەدەن لەکاتی دووگیانیدا وبریتین لە:

١- غـیض الأرحـام (کـە بـەم مانایانـە دێت:چـوونە نـاوەوە یـان ڕۆچـوون یـان وونبوون یان تیاچوون).

٢- إزدیاد الأرحام (واتە:زیاد بوون لە قەبارە یان بارستەدا).

لە بابەتی پێشتردا بابـەتی ڕۆچـوونی منالْدانـەکان (غـیض الأرحـام) بـەووردیی ڕوونکراوەتەوە، لەم بابەتەدا دەچینە سەر ڕوونکردنەوەی ئاماژەی دووەمی ئایەتە پیرۆزەکە کە دەربارەی زیادبوونی منالْدانەکانە (وَمَا تَزْدَادُ).

لێـرەدا بەپشتبەسـتن بـە سەرچـاوەکانی کۆرپـەلـەزانی وپزیشـکیی ئافرەتـان پێویست دەکات باسی ئەو گۆڕانکارییانە بکەین کە هەموو مانگێك بەسەر منالْدانـدا دێـت لـە ئافرەتانـدا بـۆ ئـەوەی گونجاوبێـت بـۆ پێشـوازی کـردن لـە کۆرپـەلەکـە وگۆشـگرتنی، لـەبری ئـەوەی کـە لـەناوی بـەرێت یـان دەرییکاتـە دەرەوە بـە

هاوشێوەی هەر تەنێکی بێگانەی تر کە بچێتە ناو لەشەوە، ئەمەش بریتییە لە شێوازێکی زیادبوونی منالدانەکان.

بینراوە کە منالدان مانگانە لە کاتی سووڕی بێنوێژیدا (الدورة الحيضية Menstrual Cycle) بە ٣ قۆناغی سەرەکیدا دەڕوات، کە بریتین لە:

١- قۆناغی گەشە کردن (Proliferative Phase): کە تێیدا هێلکۆکەکانی ناوهێلکەدانەکان هاندەدرێن بۆ گەشە کردن وەهەروەها ڕێژەیەکی زیاتریش لە هۆرمۆنی مێینە (ئیسترۆجین) لە هێلکەدانەوە دەرێژرێت کە لەگەڵ خوێندا دەچێت بۆ منالدان ودەبێتە هۆی زیاد بوونی قەبارەی ناوپۆشی منالدان، کە لە نیو میلليمەترەوە ئەستوور دەبێت بۆ (٥ملم) ولوولە خوێنەکان ئەوەندە گەورە دەبن تاوەکو پێچاوپێچ دەبن ورژێنەکانی منالدانیش وەك بۆری درێژیان لێدێت.



A: برگەیەکی منالدان کە ناوپۆشەکەی دەردەخات.
B: قۆناغەکانی زیادبوونی ناوپۆشەکە وەك ئایەتی: ﴿...وما تغيض الأرحام وما تزداد ....﴾ ئاماژەی پێدەدات.
C: زیادبوونی دیواری منالدان بە ڕژێنەکان ولوولەکانی خوێن.

٢- قۆناغی دەردان وڕژاندن (Secretory Phase): بەهۆی زیادبوونی ڕێژەی ئیسترۆجینەوە، ژێرمێشکە ڕژێن هاندەدرێت بۆ ڕژاندنی هۆرمۆنی (L.H: Luteinizing Hormone)، کە کارێکی وادەکات هێلکۆکەیەك لە یەکێك لە

هێلکەدانەکانەوە دەرپەڕێت، پاشماوەی هێلکەکە لە ناوهێلکەدانەکەدا تەنی زەرد (Corpus Luteum) دروستدەکات، کە هەڵدەستێت بە ڕژاندنی زیاتری هۆرمۆنی ئیسترۆجین وهەروەها هۆرمۆنی پرۆجیستیرۆن (Progesterone)یش، کە هەردوو ئەم هۆرمۆنە کاردەکەنە سەر ناوپۆشی مناڵدان بۆ ئەوەی ئامادە بێت بۆ پێشوازی کۆرپەلە، لێرەدا ناوپۆشەکە لە (٥ملم)ەوە بۆ (٨ملم) ئەستوور دەبێت، ورژێنەکانی مناڵدان ئێجگار زیاد وگەورە دەبن وناویان پڕدەبێت لە دەردراو وهەروەها خوێنبەرەکانی مناڵدان ودیوارەکەی گەورە وزیاد دەبن.

ئەم دووقۆناغە پێکەوە پێیان دەووترێت (قۆناغی زیاد بوونی گەشەی مناڵدان) کە تێیدا مناڵدان ئامادە دەکرێت بۆ وەرگرتنی هێلکە پیتێنراوەکە بۆ ئەوەی کۆرپەلەکەی لێوە دروست ببێت.




e 20.35 The cycle of ovulation and menstruation

**سووری مناڵدان (یان سووری مانگانەی ئافرەت) ڕووندەکاتەوە لەگەڵ کاریگەریی هۆرمۆنەکان تێیدا**

لێرەدا ئیعجازی گەورەی ئایەتە پیرۆزەکەمان بۆ دەردەکەوێت کە وەسفی زیاد بوون وگەشەی منداڵدان دەکات، کە وەك وتمان زیادبوون بریتییە لەم دووقۆناغەی مانگانەی منداڵدان کە تێیدا لە قەبارەدا گەورە دەبێت وژمارە وقەبارەی لوولەکانی خوێن ورژێنەکان زیاد دەکات، خۆئامادە کردن بۆ وەرگرتنی هێلکە پیتێنراوەکە بە ئەستوور بوونی دیواری منداڵدان وزیاد بوونی گلایکۆجین ورژێنی هەڵگیراو لە دیوارەکەیدا دەبێت کە خۆراکی پێویستی بۆ دەستەبەر دەکات، ئەمانە هەمووی پێش دووگیانی دەبێت، کە ئەگەر ئافرەتەکە دووگیان ببێت ئەوا منداڵدان بەردەوام لە زیادبووندا دەبێت بەهۆی کۆرپەلەکەوە.

٣- قۆناغی حەیز یان رۆچوون وهاتنە خوارەوە ( Menstrual Phase or Endometrial Break down): ئەگەر پیتاندن ودووگیانیی روونەدات، ئەوا تەنی زەرد دەپووکێتەوە ودەوەستێت لە رژاندنی هۆرمۆنی ئیسترۆجین وپرۆجیستیرۆن، کاتێکیش کە ئاستی ئەم هۆرمۆنانە تەواوکەم دەبێتەوە بۆ ئاستێك کە نەتوانێت ناوپۆشی منداڵدان رابگرێت، ئەوا عادەی مانگانە (حەیز( روودەدات بە داماڵین ورۆچوونی ناوپۆشی منداڵدان، ودەبێتەهۆی پووکانەوە وبچووکبوونەوەی قەبارەی منداڵدان بۆ قەبارەی پێش زیادبوونەکە وهەموومانگێك ئەم سوورە دووبارە دەبێتەوە تا دروستبوونی هێلکەیەکی پیتێنراو وزیادبوونی تەواوی قەبارەی منداڵدان بەهۆی کۆرپەلەکەوە.

دەربارەی ئەم کرداری رۆچوونە یان (حەیز)ە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) هەیە کە ئافرەتێك پرسیاری لەمبارەوە لێدەکات، ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێت: ﴿... فَتَحَيَّضي سِتَّة أيّام أوسَبْعة أيّام فِي علم الله، ثُمّ اغْتَسلي، فَإذا رَأيت أنّك قَدْ طَهُرْتِ وَاسْتَنْقَأْت، فَصلّي أرْبَعاً وَعشرين لَيْلَة أوثَلاثاً وَعشْرينَ لَيْلة وَأيّامها وَصُومي وَصلّي، فَإن ذَلك يُجْزيك، وَكَذلك فَافْعَلي كُلَّ شَهْر كَما تَحيضُ النِّساءُ وَكَما يَطْهُرْنَ لِميقاتِ حَيْضهِنَّ وَطُهْرهِن﴾ (حديث حسن أخرجه أحمد وأبوداود والترمذي وابن ماجة)،

واتە: تۆ بۆ ماوەی شەش رۆژ یان حەوت رۆژ لە زانیاری خوادا حەیز حیساب بکە، پاشان خۆت بشۆ، ئەگەر بینیت پاك بوویتەتەوە وخوێن بڕاوە ماوەی ٢٤ یان ٢٣ رۆژ بە شەوەکانیەوە رۆژووبگرە ونوێژ بکە، ئەوا لەبرت دەکەوێت، تۆش هەموومانگێك ئاوا بکە وەك چۆن بەم شێوەیە هەمووئافرەتان حەیز دەبن وپاکدەبنەوە بۆ ئەم ماوە دیاریکراوانەیان.




**Figure 2-13.** Schematic drawing of changes taking place in the uterine mucosa (endometrium) during a regular menstrual cycle in which fertilization fails to occur. Note the corresponding changes in the ovary.

ئەم هێلکاریەیە ئەو گۆڕانکاریانە دەخاتەروو کە لە دیواری منالداندا بەهۆی هۆرمۆنەکانەوە روودەدات لە کاتی سووڕی مانگانەی ئاسایی ئافرەتدا, کاتێك کە پیتاندن شکست بێنێت.

دیاری کردنی ماوەی ئەم رووداوە لە ژیانی ئافرەتدا، وەك لە فەرموودەکەدا ماوەی بێنوێژی (کە ماوەی کەم بوونەکەیە وبە ٦-٧رۆژ) وپاکبوونەوە (کە ماوەی زیاد بوونەکەیە وبە ٢٣-٢٤ رۆژ) دیاریکراون، خۆی ئاماژەیەکی زانستیە.

چونکە ئەم ماوەیە ناوەندی کاتی ڕوودانی ئەم دیاردانەیە لە ئافرەتانی ئاساییدا وەك لە کتێبەکانی نەخۆشیەکانی ژنان ومنداڵبووندا ( Obstetrics & Gynecology) دیاریکراوە، کە تێیدا هاتووە: ماوەی ناوەندی خوێن ڕۆشتن (حەیز) بریتییە لە: ٥ڕۆژ ± ٢ڕۆژ، ماوەی گشتی ئەم سووڕە مانگانەیەش بریتییە لە: ٦+٢٤= ٣٠ڕۆژ، یان ٧+٢٣= ٣٠ ڕۆژ، وەك لە فەرموودەکەدا دیاریکراوە.

زانستی نوێش هەمان ماوەی دیاریکردووە بۆ ئەم سووڕە کە ناوەندەکەی بریتییە لە: ٢٨ ± ٢ ڕۆژ، هەروەك فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ).




کاتی دەرپەڕانی هێلکۆکە لە سوورەکانی بینوێژی ئافرەتدا ( کە ڕۆژی چواردەیەمی سوورەکەیە ).

ئەگەر هێلکە پیتێنراوەکە دروستبوو ئەوا بەرەو منداڵدان بەڕێدەکەوێت وسەرەنجام خۆی دەنووسێنێت بە دیواری منداڵدانەوە وخۆی دەچێنێتە ناوی وبەناوپۆشی دیواری منداڵدان دادەپۆشرێتەوە وەك لە (وێنەی هاوپێچی )دا بەڕوونی دیارە.

لەلایەکی ترەوە زانستی کۆرپەلەزانی نوێ بۆمان باسدەکات کە لە ڕۆژی دوانزەیەمینی گەشەی کۆرپەلەکەدا بەرزاییەکی بچووك بەقەدەر نوکتەیەك لە دیواری منداڵدانەوە دەردەکەوێت، کە بریتییە لەو کۆرپەلەیەی خۆی چاندووە، وزانایانی کۆرپەلەزانی ئەمەیان وەك سەرەتای زیاد بوونی منداڵدان بەهۆی

کۆرپەلەکەوە دیاری کردووە، کە پاشـان ئـەم نوکتەیـە وورده وورده زیـاد دەکـات لەگەڵ بەرەوپێش چوونی گەشـەی کۆرپەلەکـەدا وسـەرەنجام هـەموو نـاو منالّـدان پڕدەکاتەوە. **بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی لاپەڕە (٣٩٨-٣٩٩)**

پـاك وبێگـەردیی بـۆ پـەروەردگاری ڕاگـری ئـەم وورده‌کارییـە گەورەیـە لـە دروسـتبوونی نـەوەکانی ئادەمـدا، ولـە قورئانـە پیرۆزەکەیـدا ئامـاژەی زۆر وورد وجوانیـداوە بـۆ دروسـتبوونی مـرۆڤ، کـە دەرکـەوتنی ڕاسـتییەکانیان لەمڕۆمانـدا دەرخەری گەورەترین موعجیزەی قورئـان وسـەلمێنەری ڕاسـتی نـاردنێتی لەلایـەن پەروەردگارەوە: ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَـزْدَادُ وَكُـلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ ، عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ﴾.

۞۞۞

## سەرچاوەکان:


- علم الأجنة في ضوء القرآن والسنة – الشيخ عبدالمجيد الزنداني ود.مصطفى أحمد، بمشاركة مجموعة من علماء الأجنة الغـربيين: ( Marshal E. Johnson, Gerald C. Goeringer, Joe Leigh Simpson, Keith L. Moore, T. V. N. Persaud) – هيئـة الإعجـاز العلمـي في القـرآن والسـنة برابطـة العـالم الإسـلامي– مكـة المكرمة.

- إعجاز القرآن فيما تخفيه الأرحام– كريم نجيب الأغرّ– دار المعرفة– بيروت/ الطبعة الأولى– ٢٠٠٥.

- ئامازەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان وسوننەتدا – د.کاوە فەرەج سەعدون– چاپی یەکەم/ ٢٠٠٨.

- The Developing Human (Clinically Oriented Embryology) - Keit.L.Moor, T.V.N. Persaud - 9th edition - 2013.
- Langman's Medical Embryology - T.W. Sadler \ 10th edition - 2006.
- Obstetrics by Ten Teachers\ T.L.T. Lewis & G.V.P. Chamberlain\ 18th Edition – 2006.

# موعجیزەی ئاماژەدان بەو شلەمەنیيانەی لە سکی هەنگەوە دەردەچێت

پەروەردگار لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێت: ﴿وأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ {٦٨} ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاء لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ {٦٩}﴾.

واتە: پەروەردگار هەنگی فێر کردووە کە شاخەکان ودرەختەکان وشانەکان بکاتە خانووولانکە، پاشان فەرمانمان پێکرد کە لە هەموومیوە بخوات وسوود وەرگرێت، وئەورێگا ئاسانکراوانەی کە لەلایەن خوداوە بۆی دانراوە بگرێت، لە سکی هەنگەوە شلەیەك دێتەدەرێ کە چەند جۆر وچەند رەنگێکە، وئەم شلەیە شیفا وچارەسەری بۆ خەڵکی تێدایە، بەڕاستی ئەمە بەڵگەیەکە بۆ کەسانێك کە بیردەکەنەوە.

مێشهەنگ مێروویەکی بەسوود وگورج وگۆڵ وبێزیان، وپاك خۆر وخۆپارێزە لە پیسی، هەر بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی هەنگ دەفەرموێت: ﴿مثل المؤمن مثل النَّحلة، لا تأكل إلا طيبا ولا تضع إلا طيبا﴾ [٢١].

واتە: نموونەی ئیماندار وەك هەنگ وایە، خواردنی پاك نەبێت نایخوات، وئەوەشی کە دای دەنێت هەر پاکە.

زانای بەناوبانگ (کریس موریسۆن) کە سەرۆکی ئەکادیمیای زانستی نیویۆرك بووە، لە کتێبی {(الإنسان لا يقوم وحده) یان (العلم يدعوللأيمان)} دا دەڵێت:

---

[٢١] بڕوانە: (صحيح ابن حبان) ١/ ٢٧٤ – برقم: ٢٤٦، والجامع الصغير وزيادته (١/١٠٧٩ – برقم: ١٠٧٨٦)، وصحّحه الشيخ الألباني، ينظر: صحيح الجامع برقم: ٥٨٤٧.

(کارکـەرەکانی هـەنگ هەڵدەسـتن بـە دروسـتکردنی خانـەی شـەش پـاڵوویی جۆراوجـۆر لـە قـەبارەدا بـۆ پێگەیانـدنی کرمۆکـەکان، خانـە بچـووکەکان بـۆ کارکەرەکان دادەنێت، لـەو گـەورەتر بـۆ نێرینـەکان دادەنێت، ژووری تایبـەت بـۆ شاژنی سکپڕ دادەنێن، شـاژنە هـەنگیش هێلکۆکـەی نـەپیتێنراو لـەو خانانـەی بـۆ نێرینەکان دانراوە دادەنێت.

هێلکۆکەی پیتێنراویش دەخاتە ئەو خانانەوە کە بـۆ کارکـەرەکان وشـاژنەکانی دوارۆژ دیاریکراوە.

پاشان کارکەرەکانیش بەوپەڕی سۆزەوە هەنگوین وهەڵاڵەی جووراودەدەن بـە کرمۆکە سەرەتاییەکان، کە پـاش ماوەیـەك بۆیـان نـاجوون وهـەنگوین وهەڵاڵـەیان راستەوخۆ پێدەدرێت، ئەومێینانەی بـەم شـێوەیە خۆراکیـان دەدرێتـێ لـە دواییـدا کارکەری نوێی بەهێزی شانەی هەنگیان لێدەردەچێت.

لەلایـەکی تـرەوە ئـەو مێینانـەی کـە لـە خانـە شـاهانەکاندا دانـراون بـۆ ئـەمان خواردنی تایبەتی وجووراوبـە بـەردەوامی دەبێـت وئەمانـەی کـە ئـاوا بـە تایبـەتی مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت گەشە دەکەن بـۆ شـاژنی هـەنگ، ئـەمانن کـە بـە تـەنیا دەتوانن هێلکە دابنێن، ئەم کرداری بەردەوام بوونی بەرهـەم هێنانـە پێویسـتی بـە خـواردن وخانـەی تایبـەت هەیـە ولەهـەمان کاتـدا شـوێنەواری سەرسـوڕهێنەری گۆڕینی خۆراك دەردەخات، بەردەوام بوونی ئەم کـرداری بەرهەمهێنانـە پێویسـتی بە چاوەڕوانی وجیاکردنەوە وخۆراکی تایبەتی هەیە.

ئەم گۆڕانکاریانەش بەتایبـەتی بەسـەر ژیـان لـە کۆمـەڵگادا دەچەسپێت، وزۆر گرنگ وسەرەکییە بۆ بەردەوام بوونی، وشتێکی بەڵگە نەویستیشە کە ئەم زانیاری وشـارەزاییە پێویسـتانە دەبێـت دوای پەیـدابوونی کۆمەڵگاکـە بەدەسـت هاتبێـت، لێرەوە هەنگ پێش مرۆڤی داوەتەوە لە زانینـی کاریگـەریی خـۆراك لەسـەر گەشـە کردن لە بارودۆخێکی دیاری کراودا).

پاش ئـەوەی کـە (مۆریسـۆن) لـە کتێبەکەیـدا چـەند نموونەیـەکی تـری ژیـانی زیندەوەران باس دەکات، دەڵێت: (بێگومان دەبێت دروستکەرێك رێنموویی کـردبن بۆ هەموونەم کارە سەرسوڕهێنەرانە).



لێرەدا پرسیار دەکەین: ئایا بـۆ پـەروەردگار دەفـەرموێت:﴿يَخْـرُجُ مِـن بُطُونِهَـا شَرَابٌ﴾ واتە: لە سکیەوە شلەیەك دەردەچێت، وبە ئاشکرا نەیفـەرمووە هـەنگوین ئەوەیە کە لە سکی هەنگەوە دەردەچێت؟

لەبەرئەوەیە کە هەنگ بە تەنها هەنگوین دروست ناکات، بەڵکو لەهـەمان کاتـدا خواردنی شایانە دروست دەکات کە کرمۆکـەکانی هـەنگ وشـاژنی دوارۆژ لەسـەری دەژین، هەروەها ژەهری هەنگیش دروست دەکات کە لەگەڵ چـزووەکەیدا دەیـدات بە دوژمنەکانیەوە، مۆمیش لە سـکیەوە بـە شـلی دەردەچـێت، هـەروەها مـاددەی (پرۆپۆلیس) کە کەتیرەیەکە شانەکانی پێ جێگیر دەکات.

لێرەوە ئیعجازێکی گەورەی ئایەتەکە ئاشکرا دەبێت کە نەیفـەرمووە بـە تـەنها هەنگوین لـە سـکی هەنگـەوە دێتـە دەرەوە، چـونکە لـە سـکی هەنگـەوە چـەندین ماددەی جیاوازی چارەسەرکەر دێتە دەرەوە، کە لە سەردەمی هاتنـە خـوارەوەی

قورئان بۆ سەروەری پێغەمبەران نەزانراوە، تەنها لە سەدەی بیستەمدا بەهای گەورەی چارەسەرکەری هەموومادەکانی بەرهەمهاتووی سکی هەنگ زانراوە ودۆزراونەتەوە.

لەلایەکی ترەوە ئیعجازی ئایەتەکانی سوورەتی (النحل) تەنها لەوەدا نییە کە دەڵێت هەنگوین شیفای تێدایە، بەڵکوئیعجازەکە لەمانەدا خۆی دەبینێتەوە:

١- خوای گەورە بە ئاشکرا باسی هەنگوینی نەکردووە لە ئایەتەکەدا کە فەرموویەتی: ﴿يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ﴾، ونەیفەرمووە (يخرج عسل) واتە هەنگوین لە سکی دێتە دەرەوە، کەواتە جۆراوجۆرە ئەوەی لە سکی هەنگ دێتە دەرێ، وخوای گەورە بۆ مرۆڤی جێهێڵاوە کە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەوانە بکات کە دێنەدەرێ، وەك:هەنگوین وخواردنی شاہانە وکەتیرە ومۆم.

٢- لەمانەی لە سکی هەنگەوە دێنە دەرەوە بەگشتی شیفا وچارەسەر هەیە: لە هەنگویندا... لە خواردنی شاہانەدا... لە پرۆپۆلیسدا... ولە مۆمەکەشدا شیفا هەیە... تەنانەت لە ژەهری هەنگیشدا چارەسەر هەیە.

دوای چەندین لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر دەرکەوت کە ئەم مادانە سوودی جۆراوجۆریان هەیە:

ئەم مادانە میکرۆبە کوشندەکان لەناودەبەن، ماددەی بەهێزکەری بەرگری لەشی تێدایە، کێشەکانی چاوپێست وددانەکان چارەسەر دەکەن وچەندین سوودی تریش [٢٢].

❀❀❀

[٢٢] بڕوانە بابەتی: (موعجیزەی چارەسەرکردن بە هەنگوین) لە کتێبی (بەڵگە ئاشکراکان)، نووسینی: (د.کاوە فەرەج سەعدون)، چاپی دووەم - ٢٠٠٧.

## هێڵکاریی قۆناغەکانی گەشەکردنی هەنگ










## توێکاری هەنگێك، لەگەڵ جۆرەکانی هەنگ

# ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا
# (ئێستا وئومێدەکان)
# الإعجاز العلمي في السنة ( الواقع والمأمول )

ئەم توێژینەوەیە پێشکەشکرا بۆ لیژنەی زانستی کۆنگرەی:
دیدی دروست بۆ فەرموودە (پێگە وکارپێکردنی)، پاش
پەسەندکردنی لەلایەن لیژنەی زانستییەوە دواتر لە کۆنگرەکەدا
پێشکەشکرا، ئەم کۆنگرەیە لەلایەن رێکخراوی ژیار بەهاوبەشی
لەگەڵ زانکۆی هەڵەبجە لە رۆژانی (٢٠-٢١/١٢/٢٠١٧) لە هۆڵی
کۆلیژی پەروەردەی بنەڕەتی زانکۆی هەڵەبجە سازکرابوو

# پوختەی توێژینەوە

## ئامانجەکانی توێژینەوە:

١- خستنەرووی پێناسەیەکی نوێ وگشتگیر دەربارەی موعجیزە وبەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی بەگشتی.

٢- بەکارهێنانی دۆزینەوە زانستییەکان بۆ دەرخستنی راستییەکانی سوننەت وچەسپاندنی سەرچاوە خوداییەکەیان.

٣- سوود وەرگرتن لە سەلماندنە زانستییەکان بۆ راستاندنی هەندێك لەو فەرموودە لاوازانەی راستیی زانستییان لەخۆگرتووە.

٤- بەکارهێنانی راستییە زانستییەکان بۆ سەرخستن وتەرجیح کردن لەنێوان گێڕانەوەکانی هەندێك لەو فەرموودانەی گێڕانەوەی جیاوازیان هەیە.

٥- لەرێی دۆزینەوە زانستییەکان وتوێژینەوە زانستییەکانەوە هەوڵبدرێت گومان بڕەوێنرێتەوە لەسەر هەندێك لەو فەرموودە صەحیحانەی ئاماژەی زانستییان لەخۆگرتووە.

## میتۆد وکەرەستەی توێژینەوەکە:

ئەم توێژینەوەیە بریتییە لە پێداچوونەوە وبەدواداچوونێك دەربارەی ئەم بابەتە لەرووی زانستییەوە دوای گەڕانمان بەناو کتێب وتوێژینەوە زانستییەکان وبابەتە بڵاوکراوەکان لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانەوە بۆ بابەتی ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا.

## هەوڵەکانی پێشتر:

پاش گەڕانێکی زۆر هیچ توێژینەوەیەکم بەهەمان ناونیشان یان ناوەڕۆك بەزمانی کوردی نەدییەوە، بەزمانی عەرەبیش بەهەمان ناونیشان وناوەڕۆك نییە بەڵکو چەند هەوڵێکم بینیەوە کەناونیشان یان ناوەڕۆکیان چەند لێکچوونێك هەیە.

## پێشەکی:

موعجیزە لە پێناسەی زانایاندا بریتییە لەو دیاردە ورووداوە نائاساییانەی پەروەردگار بۆ پێغەمبەرەکانی ئەنجامدەدات وبەرامبەرکێی مرۆڤەکانی ئەوسەردەمەی پێکراوە کە لە توانایاندا نییە هاوشێوەی بهێنن، ئیمامی (ابن تیمیة) دەفەرموێت: هەموو لەئاسایی بەدەرێك دەگرێتەوە ولەلای زانایانی پێشینی وەك ئیمام (أحمد بن حنبل) وغەیری ئەمیش بە بەڵگەکان یان نیشانەکان (الآيات) ناوبراوە.

(بڕوانە: شرح العقيدة الطحاوية ٢/٧٤٦، هەروەها: مجموع الفتاوى لأبن تيمية ١١/٣٣١-٣٣٥).

لە قورئانی پیرۆزدا (الآية) لە زیاد لە ٨٠ شوێندا هاتووە بە مانای ئەونیشانە ئاشکرایەی راستی ووتەکانی پێغەمبەر دەردەخات وهاندەرە بۆ باوەڕهێنان بە پەروەردگار، هەروەها بەڵگە (البيّنة) ١٢جار وبەڵگەکان (بيّنات) ٤٠جار و(برهان- بەڵگە یان سەلمێنەر) لە ٢ شوێندا هاتووە.

بەکارهێنانی زاراوەی (موعجیزە یان ئیعجاز) بۆ قورئانی پیرۆز تەنها لە کۆتایی سەدەی دووەم وسەرەتای سێیەمدا لەلایەن زانایانەوە دەستپێکرد، بەڵام سەبارەت بە لەئاسایی بەدەرەکان لە سوننەتدا زانایانی سوننەت زاراوەی نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی (علامات النبوة)یان بۆ بەکارهێناوە، وەك لە بابەکانی (صحيح البخاري)دا هاتووە.

پاشان زاراوەی بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی (دلائل النبوة) بەکارهێنرا کە ٢کتێب بەم ناونیشانە لەلایەن (أبونعيم الأصفهاني والبيهقي) نوسران، ئەویش لەبەرئەوەیە کە ئەم لەئاسایی بەدەرانە بەڵگەیەکی ئاشکران لەسەر پێغەمبەرایەتی چونکە تەنها پەروەردگار دەتوانێت ئەوشتە ئاساییە جێگیرانەی رۆژانە بشکێنێت چونکە دروستکەریانە، ئەمانەش دەرخەری راستیی ناردنی پەیامبەرانن لەلایەن خوداوە.

زۆرێك له زانایان جیاوازییان نه‌كردووه له‌نێوان موعجیزه وبه‌ڵگه‌كان وه‌ك (إبن حجر العسقلاني لة فتح الباري شرح صحيح البخاري) له شه‌رحی (باب علامات النبوة)، له زانا نوێكانیش (د.ضیاءالدین عتر) له كتێبی (المعجزة الخالدة)دا هه‌مووكاره له‌ئاسایی به‌ده‌ره‌كانی پێغه‌مبه‌ری (ﷺ) به موعجیزه داناوه، به‌پێی پێناسه كۆنه‌كه‌ی موعجیزه زۆرێك له به‌ڵگه‌كانی پێغه‌مبه‌رایه‌تی نابن به موعجیزه چونكه مه‌رجی به‌رامبه‌ركێ له‌خۆناگرن.

بۆیه پێویستیمان به‌پێناسه‌یه‌كی نوێ وگشتگیر هه‌یه بۆ موعجیزه به‌تایبه‌تی له رۆژگاری ئه‌مرۆماندا، من ئه‌وپێناسه‌یه به‌گونجاوتر ده‌زانم كه (أ.د.صالح بن أحمد رضا) له كتێبی (الإعجاز العلمي في السنة النبوية)دا هێناویێتی ئه‌ویش ئه‌مه‌یه:

(موعجیزه رووداوێكه په‌روه‌ردگار له‌سه‌ر ده‌ستی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی، یا زانستێكه له ووته‌كانیدا ده‌ریده‌خات، هیچ كه‌سێك له سه‌رده‌می ئه‌ودا نه‌یتوانیوه هاوشێوه‌ی بهێنێت وده‌بێته به‌ڵگه له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌رایه‌تیه‌كه‌ی چونكه له‌سه‌روو توانای مرۆڤه‌كانه‌وه‌یه)، ئه‌م پێناسه‌یه‌ش ده‌بێته كۆكه‌ره‌وه‌ی هه‌موورووه‌كانی ئیعجاز له قورئان وسوننه‌تدا.

به‌م شێوه‌یه هه‌موو ئه‌وانه‌ی به به‌ڵگه‌ی پێغه‌مبه‌رایه‌تی ونیشانه‌كانی دانراون بێگومان بریتین له موعجیزه، چونكه ئه‌م له‌ئاسایی به‌ده‌رانه مه‌به‌ست پێی سه‌لماندنی پێغه‌مبه‌رایه‌تی محمد (ﷺ) بووه، په‌روه‌ردگار ئه‌نجامیداون بۆ دامه‌زراندنی ته‌واوه‌تی بیروباوه‌ری باوه‌ڕداران، كاتێك پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) چه‌ندین موعجیزه‌ی نیشانی هاوه‌ڵه‌كانیداوه وه‌ك زیادبوونی خۆراك وئاو، گریانی قه‌ده‌كه،ساڕێژكردنی برینی هاوه‌ڵه‌كان، دوعا گیراوه‌كانی، ته‌سبیحاتی به‌رد له‌به‌رده‌ستیدا وچه‌ندینی تر مه‌به‌ست پێی به‌رامبه‌ركێ نه‌بووه له‌گه‌ڵ هاوه‌ڵه‌كانیدا، چونكه ئه‌وان خۆیان ئیماندار بوون به‌ڵكوته‌نها ده‌رخستنی پێغه‌مبه‌رایه‌تی ودامه‌زراندنی باوه‌ڕیان بووه.

## گفتوگۆی توێژینەوە:

### یەکەم:

ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا کە خۆی لەوئاماژە زانستییانەدا دەبینێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی گەردوون ودروستکراوەکان ومرۆڤ داوێتی وتەنها دوای تێپەڕبوونی سەدان ساڵ راستییەکانیان بۆ مرۆڤەکان دەرکەوتووە بەهەمان شێوە موعجیزەن، چونکە ئەم هەواڵانە لەسەرووتوانا وزانیاریی مرۆڤەکانی سەردەمی پێغەمبەرەوە بووە.

لە سوننەتدا چەندین نموونەی ئاشکرا هەیە بۆ ئەم ئاماژە زانستییانە، وەك:

– کۆتایی پشتەسەر سەنتەری نوستن وبەخەبەر بوونە:

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە: « يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَنَامَ ثَلَاثَ عُقَدٍ، يَضْرِبُ كُلَّ عُقْدَةٍ عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلاَّ أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلاَنَ » (متفق عليه)، کە بەئاشکرا دەفەرموێت کە کۆتایی سەر وسەرەتای مل لەپشتەوە شوێنی کۆنترۆڵ کردنی نوستنە لە مرۆڤدا وئەم راستییەش زانستی توێکاری ئەم سەردەمە سەلماندویەتی.

– لە حەرامەکاندا چارەسەر نییە:

لە سوننەتدا هاتووە کاتێك هاوەڵێك داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد کە مەی دروستبکات بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشی ئەویش رێینەدا وفەرمووی: ﴿إنه ليس بدواء ولكنه داء﴾ (رواه مسلم)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿إن الله لم يجعل شفاء أمتي فيما حرم عليها﴾ (رواه أبوداود وصححه ابن حبان)، پێشتر دەووترا خواردنەوەی مەی بەبڕێکی کەم رۆژانە مرۆڤ لە هەندێك نەخۆشی دەپارێزێت

بەتایبەتی جەڵتەی دڵ، بەڵام ئێستا لە سەدەی ٢١دا نوێترین توێژینەوە زانستییەکان ئەمەیان پووچەڵ کردووەتەوە، ودەڵێن تەنانەت کەمترین ڕێژەی مەی ڕۆژانە مەترسی تووشبوون بەنەخۆشییە جۆراوجۆرەکان بەتایبەتی شێرپەنجە چەند قات زیاد دەکات.

– ئەوفەرموودانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە کلێنچکە (عجب الذنب)ی کردووە بە بنچینەی دروست بوونی مرۆڤ:

لە چەند فەرموودەیەکدا پێغەمبەر (ﷺ) باسی کلێنچکەی کردووە کە بەشێکی گرنگی لەشی مرۆڤە، وبە بەردی بناغەی دروستبوونی کۆرپەلەی مرۆڤی داناوە، بەڕوونی باسی ئەوەی کردووە کە مرۆڤ لەمەوە دروست دەبێت، وەك فەرموودەی: ﴿كُلُّ ابْنِ آدَم يَأْكُلُه التُّراب إلاّ عَجْبَ الذَّنَب، مِنْهُ خُلِقَ وَمِنْهُ يُركب﴾ (رواه مسلم)، ئەم فەرموودانە چەند ئاماژەیەکی زانستیی زۆر نوێی تێدایە: مرۆڤ کلکی هەبووە، کۆرپەلەی مرۆڤ لەم کلێنچکەوە دروست دەبێت، شوێنی دروستبوونی کۆرپەلە لە کۆتایی ئەم کلکەدایە، ئەم شوێنە بریتیە لە ئێسك، یەکەم شتێك کە لە کۆرپەلەکەدا دروستبوونی تەواودەبێت بریتیە لەم کلکە کە پاشان مرۆڤ وهەموئەندام وشانەکانی لێوە دروست دەبێت، کە ئەم ئاماژانە بەتەواوەتی لەگەڵ نوێترین دۆزینەوەکانی کۆرپەلەزانیدا یەکدەگرنەوە.

– دیاردەی هەورە بروسکە شایەتی لەسەر پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) دەدات:

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَوْا إِلَى الْبَرْقِ كَيْفَ يَمُرُّ وَيَرْجِعُ فِي طَرْفَةِ عَيْنٍ﴾ (رواه مسلم)، لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) دیاردەی هەورە بروسکە بۆ هاوەڵانی ڕووندەکاتەوە بەووردەکارییەکی زۆر وباسکردنی هەندێك نهێنی هەورە بروسکە کە مرۆڤ تاوەکو دوای سەدەی هەژدەیەم نەبێت پەی بەو نهێنیانە نەبردووە، دیاریکردنی خێرایی بۆ هەورە بروسکە دەستپێشخەرییەکی بێوێنەیە کە بە

چاوتروکاندنێك دیاریکردووه (زانایان لەمڕۆدا ماوەی ڕوودانی هەورە بروسکە بە چەند میللی چرکەیەك دەخەملێنن کە بە نزیکەیی هەمان ماوەی ڕوودانی چاوتروکاندنێکە لەمرۆڤدا)، پاشان دیاریکردنی ٢ قۆناغی ڕۆشتن وگەڕانەوە بۆ تەزووی کارەبایی هەورە بروسکەکە کە زانایان تەنها دوای سەدەی بیستەم وداهێنانی ئامێرە پێشکەوتووەکانی پێوانە ووێنەگرتن گەیشتنە ئەم ڕاستییە وزانیمان کە هەورە بروسکە ٢ قۆناغی ڕۆشتن وگەڕانەوەی هەیە.

– پێشبینییەك لە ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ):

لە فەرموودەیەکدا هاتووە: لە غەزای تەبوکدا پێغەمبەر (ﷺ) بەیەکێك لە هاوەڵەکانی فەرمووە: ﴿يُوشِكُ يَا مُعَاذُ إِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ أَنْ تَرَى مَا هَا هُنَا قَدْ مُلِئَ جِنَانًا﴾ (رواه مسلم)، کە لەو کاتەدا ناوچەی تەبوك زۆر ووشك وبێئاوبووە، بەڵام وەك فەرموودەکە پێشبینی کرد داوای سەدان ساڵ پاش گۆڕانی کەش وهەوای ئەوناوچەیە ئێستا یەکێکە لە سەوزترین ناوچەکانی نیوە دورگەی عەرەب وپڕە لە باخ وبێستان.

## دووەم:

لەمڕۆدا دەتوانرێت ئیعجازی ئاماژە زانستییەکان لەسوننەتدا بە چەند شێوەیەك سوودی لێوەربگیرێت بۆ خزمەتی سوننەت:

١– بەڵگەیەکی سەردەمیانەیە بۆ دەرخستنی ڕاستییەکانی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)، کاتێك بەراوردی ئامارە زانستییەکانی هەندێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەین لەگەڵ ڕاستییە زانستییەکان لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا کە تەنها چەند ساڵێك دەبێت ئەو ڕاستییانە بۆ مرۆڤەکان دەرکەوتووە، بۆمان دەسەلمێت ئەم ووتانە لە زانیاریی مرۆڤەکانی ئەو کاتەدا نەبووە ودەبێت تەنها لە سەرچاوەیەکی سەروو مرۆڤەکانەوە هاتبێت کە پەروەردگاری دروستکەری گەردوون ونێرەرەی پەیامبەرەکەیەتی.

هەروەها بوونی ئەم ئاماژە ناوازانە لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا لە کتێبەکانی فەرموودەدا هەن لەلایەکی ترەوە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کە ئەم ووتانە لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) ووتراون وموسوڵمانانی پێشین دەستپاك ودەمپاك ومتمانەپێکراوبوون لە گەیاندنی فەرموودەکانی پەیامبەرەکەیان.

٢- دەتوانرێت سوود لەم سەلماندنە زانستییە وەربگیرێت وەك بەڵگەیەك بۆ ڕاستکردنەوە وبەهێزکردنی هەندێك لەوفەرموودانەی لاوازییەکی کەمیان هەیە لەرووی سەنەدەوە، چونکە دەرکەوتنی ڕاستییەکی زانستیی وورد لە هەر فەرموودەیەکدا گومانی ڕێکەوت ناهێڵێت ودەیسەلمێنێت کە ئەم ووتەیە سەرچاوەیەکی خودایی هەیە.

٣- هەروەها دەتوانرێت ڕاستییە زانستییەکان بەکاربهێنرێن بۆ سەرخستن وتەرجیح کردن لەنێوان گێڕانەوەکانی هەندێك لەو فەرموودانەی گێڕانەوەی جیاوازیان هەیە (الترجیح بین الروایات)، کە لەوانەیە ئەگەر بەجیاوازی ودوور لەیەك لێکبدرێنەوە ببێتەهۆی تێگەیشتنێکی هەڵە ودژبەیەك بۆ هەندێك لە فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

وەك فەرموودەی: ﴿إذا مر بالنطفة ثنتان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكاً فصورها وخلق سمعها وبصرها وجلدها ولحمها وعظامها...﴾ (رواه مسلم:٢٦٤٥) کە بەئاشکرا دەفەرموێت دروستبوونی ئێسك لە کۆرپەلەدا (کە دوای قۆناغەکانی نطفة وعلقة ومضغة) لە هەفتەی شەشەمەوە (٤٢ ڕۆژ) دەستپێدەکات کە ئەم ڕاستییەش کۆرپەلەزانی نوێ سەلماندوویەتی، کەواتە بەپێی ئەم فەرموودە صەحیحە هەر ٣ قۆناغی (نطفة وعلقة ومضغة( تەنها ٤٠ ڕۆژ دەخایەنن!

بەڵام فەرموودەیەکی صەحیحی ترمان هەیە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذلك ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذلك ثُمَّ

يَبْعَثُ الله مَلَكًا ...﴾ (رواه البخاري:٣٢٠٨) كه لێرەدا هەر یەكێك لە ٣ قۆناغـەكانی (نطفة وعلقة ومضغة) ماوەی ٤٠ رۆژی بۆ دیاریكردووە كـە كۆیـان دەكاتـە ١٢٠رۆژ، كە ئەمەش پێچەوانەی فەرموودەكەی پێشتر وزانستی نوێیـە، وزۆرێـك لـە زانایـانی پێشین ئەم بۆچوونەیان لەم فەرموودەیەوە بۆ دروستبووە.

بـەڵام كاتێـك هـەموو ریوایەتـەكانی ئـەم فەرموودەیـە كۆدەكەینـەوە ئـەم دژبەیەكییە نامێنێت، چونكە لە ریوایەتی ئیمامی موسـلیم بـۆ هـەمان فـەرموودەدا هاتووە: عن عبد اللّه بن مسعود قال حدثنا رسول اللّـه صـلى الله عليـه وسـلم وهـو الصّادق المصدوق: ﴿إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّه أَرْبَعِـينَ يَوْمًـا، ثُـمَّ يَكُونُ في ذلك عَلَقَةً مِثْلَ ذلك، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذلك مُضْغَةً مِثْلَ ذلـك، ثُـمَّ يُرْسَـلُ الْمَلَـكُ فَيَـنْفُخُ فيـه الـرُّوحَ ...﴾ (رواه مسـلم:٢٦٤٣) كـە لێـرەدا ووشـەی (في ذلـك) هـاتووە لـەپێش زاراوەكـانی (علقـة ومضـغة) واتـە لەهـەمان ٤٠ رۆژەكـەدا سـەرەتا (نطفـة) دەبێـت ودوایی دەبێت بە (علقة) وپاشان بە (مضغة).

كە ئەمەش زانستی نـوێ ١٠٠٪ پشـتگیریی لێـدەكات، لێـرەوە بـە بـەكارهێنانی راستییە زانستییەكان ریوایەتی راستی فەرموودەكە دەركەوت.

٤- لـەرێی بـەكارهێنانی دۆزینـەوە زانسـتییەكان وتوێژینـەوە زانسـتییەكانەوە دەتوانرێت گومان برەوێنرێتەوە لەسەر هەندێك لەو فـەرموودە راسـتانەی ئامـاژەی زانستییان لەخۆگرتووە.

وەك فەرموودەی كـەوتنی مـێش بۆنـاودەفری خواردنـەوەكان، كـە بـە چـەندین ریوایەتی صەحیح هاتووە لەوانە: ﴿إذا وَقَعَ الـذُّبَابُ فِي شَـرَابِ أَحَـدِكُمْ فَلْيَغْمِسْـهُ ثُـمَّ لِيَنْزِعْهُ فإن فِي إِحْدَى جَنَاحَيْهِ دَاءً وَالْأُخْرَى شِفَاءً﴾ (رواه البخـاري:٣٠٧١) هـەروەها (أحمد وأبـوداود وابـن حبـان وابـن ماجـة)ش گێڕاویانەتـەوە، كـە گومـان لەراسـتی سەنەدی ئەم فەرموودەیەدا نییە، بەڵام هەندێك كەس دەیكەنە رەخنەیەك لەسـەر سوننەت كە مێش مێروویەكی پیسە وچۆن دەبێت دەردودەرمانی تێدا كۆببێتـەوە،

بەڵام لە چەندین توێژینەوەی زانستییدا بوونی چارەسەر لە لەشی مێشدا دەرکەوتووە.

## ئەنجامەکانی توێژینەوە:

١- ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە سوننەت وەحی خودایە، پەیامبەر (ﷺ) لە زانیاریی خوداییەوە قسەی کردووە ورێنمایی هاوەڵەکانی وهەموو موسوڵمانانی کردووە.

٢- ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا بابەتی گرنگی سوننەتمان بۆ دەردەخات وەك سەرچاوەی دووەمی ئیسلام، ووەلامێکی لۆژیکی وزانستییە بۆ ئەوانەی گومان لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) دروستدەکەن، چونکە مەحاڵە ئەم فەرموودانەی ئێستە لەبەردەستماندان ولە کتێبەکانی سوننەتدا تۆمار کراون ووتەی کەسێکی ئاسایی پێشتربێت یان بەدەم پێغەمبەرەوە هەڵبەسترابن چونکە مرۆڤی پێش سەدەی ٢١ هیچ ئاگاداری ئەمانە نەبووە.

٣- بوونی چەندین ئاماژەی زانستی لە کتێبەکانی سوننەتدا لەمڕۆدا دڵنیامان دەکات ئەوکەسانەی ئەم فەرموودانەیان کۆکردووەتەوە وبۆیان پاراستووین خەڵکانێکی ئەمین ومتمانەپێکراوبوون چونکە زانستی سەدەی ٢١ گەورەیی وئەمانەت لە کارەکانی ئەواندا دەردەخات.

٤- ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا دەتوانرێت وەك ئامرازێکی راستاندن وساخکردنەوەی ئەوفەرموودانە بەکاربهێندرێت کە لەرووی سەنەدەوە کێشەیان هەیە، چونکە دەرکەوتنی راستییەکی زانستیی وورد لە فەرموودەیەکدا کە تەنها لەمڕۆماندا مرۆڤەکان درکیان پێکردووە گومان لەراستیی ئەوفەرموودەیە ناهێڵێت.

٥- راستییە زانستییەکان بەسوودن بۆ تەرجیح کردن لەنێوان گێڕانەوەکانی هەندێك لە فەرمووداەکاندا.

٦- لەرێی توێژینەوە زانستییەکانەوە دەتوانرێت گومان برەوێنرێتەوە لەسەر هەندێك لەوفەرموودە صەحیحانەی ئاماژەی زانستییان لەخۆگرتووە.

# درێژەی توێژینەوەکە

پێشەکی

سوننەتی پیرۆز بریتییە لە سەرچاوەی دووەمی ئیسلام ، وبریتییە لەو پەیوەندییە بەهێزەی ئەوەکانی ئوممەتی ئیسلام دەبەستێتەوە بە پێغەمبەر ورابەرەکەیانەوە، سوننەتی پیرۆز پلەی دووەمی هەیە دوای قورئانی پیرۆز و وەك ئەویش جۆرێکە لە وەحی ( نیگای ) خودایی وئیلهامی نبووەت بۆ پێغەمبەرەکەی ورێنمویی پەروەردگارە بۆ مرۆڤەکان، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿...ألا إني أوتيت القرآن ومثله ...﴾ ( رواه أبوداود:٤٦٠٤، والترمذي:٢٦٦٦، وابن ماجة:١٢، وأحمد:١٦٧٢٢ وهوحديث صحيح ) واته : من قورئان وهاوشێوەی قورئانیشم پێدراوە ( کە سوننەتە پیرۆزەکەیەتی )، بۆیە پێویستە لەسەر موسوڵمانان هاوشێوەی قورئان دەستی پێوەبگرن وگوێڕایەڵی بن [٢٣].

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا لە چەندین ئایەتدا فەرمانی پێکردووین کە گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بکەین وسوننەتەکەی جێبەجێ بکەین :

- ﴿وأطيعوا الله وأطيعوا الرسول واحذروا ، فإن توليتم فاعلموا أنما على رسولنا البلاغ المبين﴾ ( المائدة:٩٢ ).

- ﴿( وأطيعوا الله والرسول لعلكم ترحمون﴾ ( آل عمران:١٣٢ ).

- ﴿يأيها الذين آمنوا استجيبوا لله وللرسول إذا دعاكم لما يحييكم﴾ ( الأنفال:٢٤ ).

- ( وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا ، واتقوا الله إن الله شديد العقاب﴾ ( الحشر:٧ ).

- ئەوانەی سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر دەکەن، واتە شوێن سوننەتەکەی ناکەون شوێنیان دۆزەخە بەدەقی ئەم ئایەتە وچەندین ئایەتی تریش: ﴿ومن يطع الله ورسوله يدخله جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها وذلك الفوز العظيم. ومن يعص الله

---

[٢٣] بروانە: الإعجاز العلمي في السنة النبوية – أ.د. زغلول النجار – دار نهضة مصر– الطبعة الخامسة – ٢٠١٢، هەروەها: الإعجاز العلمي في السنة النبوية – أ.د. أحمد شوقي إبراهيم – دار نهضة مصر– الطبعة الرابعة– ٢٠٠٦.

ورسوله ويتعد حدوده يدخله ناراً خالداً فيها وله عذاب مهين﴾ (النساء:١٣-١٤)، ئاشكرايه كه گوێڕایەڵی پەروەردگار بە گوێڕایەڵی قورئان وجێبەجێ کردنی دەبێت.

لێرەدا دەپرسین: ئەی گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بەچی دەبێت؟

بێگومان بەشوێنکەوتنی سوننەتەکەی دەبێت، ونابێت بڵێین گوێڕایەڵی پێغەمبەریش بەگوێڕایەڵی قورئان جێبەجێ دەبێت کە پەیامەکەیەتی، چونکە پەروەردگار لەونایەتانەدا گوێڕایەڵی بۆ خودای جیاکردۆتەوە لە گوێڕایەڵی بۆ پێغەمبەرەکەی، کەواتە دەبێت گوێڕایەڵی وشوێنکەوتنمان بۆ ٢ فەرمانی جیاوازبێت، کە فەرمانی خودا بریتییە لە قورئانە پیرۆزەکەی، وفەرمانی پێغەمبەریش لە فەرموودەکانی وسوننەتەکەیدا خۆی دەبینێتەوە.

سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) تەواوکەر و روونکەرەوەی قورئانیشە، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ونزلنا إليك الذكر لتبيّن للناس ما نُزّلَ إليهم ولعلهم يتفكرون﴾ (النحل:٤٤) واتە :ئێمە قورئا نمان بۆت دابەزاندووە بۆئەوەی تۆ ئەوەی بۆیان نێردراوە بۆیان روونبکەیتەوە .

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەریشدا هاتووە: ﴿...فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديّين، عضوا عليها بالنواجذ...﴾ (رواه أبوداود:٤٦٠٧، والترمذي:٢٦٧٦، وأحمد:١٦٦٩٢، وابن ماجة:٤٤٤٢ وهوحديث صحيح) واتە :ئێوە دەستبگرن بە سوننەتی منەوە وسوننەتی جێنشینە راشیدە رێنموییکراوەکانەوە، لە ئاماژەیەکی موعجیزە ئاسادا پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بەوەداوە کە لە داهاتوودا کەسانێك پەیدادەبن کە سوننەت فەرامۆش دەکەن ودەڵێن تەنها باوەڕ بەقورئان دێنین کە دەفەرموێت: ﴿يوشك الرجل متكئاً على أريكته يحدث بحديث من حديثي فيقول بيننا وبينكم كتاب الله عزوجل ما وجدنا فيه من حلال استحللناه وما وجدنا فيه من حرام حرمناه ألا وإن ماحرم رسول الله (ﷺ) مثل ما حرم الله﴾ (رواه الترمذي:٢٦٥٥، وأبوداود:٤٦٠٥، وابن ماجة:١٢-١٣، وأحمد:١٧١٩٨، والدارمي:٥٨٨ وهوحديث صحيح).

واتە: نزیکە لە داهاتوودا کەسانێك پەیدابن کە لەسەر شوێنەکانیان پاڵیانداوەتەوە وفەرموودەیەك لە فەرموودەکانی من باسدەکەن ودەڵێن: لەنێوان ئێمە وئێوەدا تەنها کتێبی پەروەردگار هەیە کە هەر حەڵاڵ وحەرامێکی تێدابێت پەیڕەوی

دەکـەین، بـەڵام بـزانن ئـەوەی کـە پێغەمبـەریش (ﷺ) حـەرامی کردبێـت (لـە فەرموودەکانیدا) وەك ئەوە وایە کە خودا حەرامی کردووە.

هەرکاتێکیش موسوڵمانان دەستبگرن بەقورئان وسوننەت پێکەوە بەهیچ شـێوەیەك گومڕانابن، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿ترکت فیکم أمرین لـن تضلوا ما تمسکتم بهمـا کتـاب الله وسـنة نبیـه﴾ (رواه مالـك في الموطـأ:١٦٧٤، والـدارقطني:٤٦٠٣، والحاکم:٣١٧-٣١٨ وصححه ووافقه الذهبي) واتـە: من دووشتم تێدا بەجێهێشتوون کـە ئەگـەر دەسـتیان پێـوەبگرن هـەرگیز گومڕانـابن کـە پـەرتووکی خـودا وسـوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی [٢٤].

لەلایەکی ترەوە پەروەردگار بەزانستی فراوانـی خـۆی کـە رابـوردوو وداهـاتووش دەگرێتەوە زانیویەتی کە لەداهاتوودا سـەردەمێك دێتـە پێش کـە مرۆڤـەکان لـەرووی زانسـتییەوە پێشـکەوتنی گـەورە بەدەسـت دێـنن ودەرگـای نهێنییـەکانی گـەردوون ودروستکراوەکان دەکەنەوە وووردەکـاریی یاسـا گەردوونییـەکان پـەی پێدەبـەن کـە رۆژگاری ئەمڕۆی ئێمەیە، هەربۆیە لە پەیامە پیرۆزەکەیـدا (کـە دوایـین پەیامـە بـۆ مرۆڤەکان تـا رۆژی دوایی) چەندین ئاماژەی زانستی ناوازەی هێناوە بۆ دروستکراوەکان ویاسا گەردوونییەکان بە ووردەکارییەکی ئەووتۆ کە مەحاڵە مرۆڤێك پـێش ١٤٠٠سـاڵ ئەم ووردەکارییانەی زانیبێت.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت:٥٣) واتـە:ئێمـە لـە ئاینـدەدا بەڵگە ونیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونـەوەر ولـە خـودی خۆیشیاندا، ئەمەیش بۆ ئەوەی تـا چاك بۆیان روون ببێتەوە ودڵنیا بن کە دەسـەڵاتی پەروەردگار وپەیامە نێردراوەکەی حەق وراست ورەوایە، ئایـا شـایەتی پـەروەردگارت بەس نییە کە بێگومان ئاگا وزانایە بە هەموو شتێك؟!

زانایان ناوی ئیعجازی زانستی لە قورئان وسوننەتدا بەکاردێنن بۆ ئەم بابەتە.

---

[٢٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا یەکێکە لە ئاشکراترین ئەوبەڵگانەی دەیسەلمێنن کە محمد (ﷺ) نێردراوی خودا وکۆتاییني پێغەمبەرانە، چونکە ئەو پێشدەستییە زانستییەی لە فەرموودەکاندا هەیە پێش ١٤٠٠ساڵ لە ژینگە وسەردەمێکدا کە کلیلی هیچ زانست ومەعریفەیەکیان نەبووە سەرەڕای نەخوێندەواریی خودی پێغەمبەر (ﷺ) هەموو ئەو گومانانە ڕەتدەکەنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم زانستەی لە خەڵکانی ترەوە وەرگرتبێت، وبەشێوەیەك کە هیچ گومانی تێدانەبێت دەیسەلمێنێت کە تاکە سەرچاوەیەك پێغەمبەر (ﷺ) ئەم زانستەی لێوە وەرگرتبێت پەروەردگاری دروستکەری جیهانیانە.

لەم توێژینەوەیەدا تیشك دەخەینە سەر چەمکی ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا ئەویش لەچەند تەوەرەیەکدا بەم شێوەیەی خوارەوە:

- بەشی یەکەم: دەربارەی زاراوەی ئیعجاز بەگشتی و پێناسەی زانایان بۆی و ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا و هەڵبژاردنی پێناسەیەکی گونجاو بۆیان دوای تاووتوێ کردنی بۆچوونی زانایانی کۆن و نوێ.
- بەشی دووەم: هێنانەوەی چەند نموونەیەکی نوێ دەربارەی ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا، یان هەندێك زیادکردنی زانستی نوێ بۆ چەند بابەتێکی ئیعجازی زانستی کە پێشتر باسکراون.
- بەشی سێیەم: سوود وەرگرتن لە ئیعجازی زانستی سونەت لەرۆژگاری ئەمڕۆدا بۆ خزمەتی دەرخستنی راستییەکانی فەرموودە صەحیحەکان و راستکردنەوەی فەرموودە لاوازەکان.
- بەشی چوارەم: ئەنجامگیریی و راسپاردەکان.
- لە کۆتاییشدا سەرچاوەکانی توێژینەوەکە لە کتێب و سایتە زانستییەکان دەخەینەروو.

# بەشی یەکەم
# دەربارەی زاراوەی ئیعجازی زانستی

## مانای زمانەوانی:

گەڕانەوە بۆ فەرهەنگە جۆراوجۆرەکانی زمانی عەرەبی باشترین چارەسەرە بۆ لێکدانەوەی مانای زاراوەکان بەگشتی وزاراوە ناکۆکی لەسەرەکان بەتایبەتی، لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا سەرچاوەی زاراوەی ئیعجاز لە ووشەی (عجز)ەوە هاتووە بەمانای لاوازیی وبێتوانایی [٢٥]، پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا لەدیمەنێکی ناوازەدا ووتەی (قابیلی کوڕی ئادەم)مان بۆ دەگێڕێتەوە دوای ئەنجامدانی تاوانەکەی کە دەفەرموێت: ﴿قَالَ يَا وَيْلَتَا أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَذَا الْغُرَابِ فَأُوَارِيَ سَوْءَةَ أَخِي ۖ فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ﴾ (المائدة:٣١) واتە: قابیل ووتی تیاچوون بۆ من بیروهۆشم ئەوەندە لاوازە کە نەمتوانی وەکوئەوقەلەرەشە بکەم ولاشەی براکەم داپۆشم لەژێر زەویدا.

## موعجیزە لە پێناسەی زانایاندا:

بەشێوەیەکی گشتی زانایانمان وتوویانە بریتییە لەو دیاردە و رووداوە نائاساییانەی پەروەردگار بۆ پێغەمبەرەکانی ئەنجامدەدات وبەرامبەرکێی مرۆڤەکانی ئەو سەردەمەی پێکراوە کە لە توانایاندا نییە هاوشێوەی بهێنن.

لە (شرح العقيدة الطحاوية)دا کە لە ئیمامی (ابن تيمية)ەوە وەریگرتووە هاتووە: هەمووڵەئاسایی بەدەرێك دەگرێتەوە، و لەلای زانایانی پێشینی وەك

---

[٢٥] بڕوانە: فەرهەنگەکانی (لسان العرب لإبن منظور، تاج العروس في شرح القاموس للزبيدي، الصحاح للجوهري، معجم مقاييس اللغة لإبن فارس، مفردات غريب القرآن للأصفهاني): ووشەی (عجن).

ئیمام (أحمد بن حنبل) وغەیری ئەمیش موعجیزە بە بەڵگەکان یان نیشانەکان (الآیات) ناوبراوە [26].

لەپێشتردا ووشەی (إعجاز ومعجزة) باونەبووە لە بەکارهێناندا، بەڵکو لە قورئانی پیرۆزدا ووشەی (الآیة) لە زیاد لە ٨٠ شوێندا هاتووە بە مانای ئەو نیشانە ئاشکرایەی راستی ووتەکانی پێغەمبەر دەردەخات وهاندەرە بۆ باوەڕهێنان بە پەروەردگار.

هەروەها (الآیات) بەم مانایە لەم زیاتر هاتوە وبەڵگە (البیّنة) بەم مانایە ١٢جار وبەڵگەکان (بیّنات) ٤٠جار و(برهان- بەڵگە یان سەلمێنەر) لە ٢ شوێندا هاتووە.

بەکارهێنانی زاراوەی (موعجیزە یان ئیعجاز) بۆ قورئانی پیرۆز تەنها لە کۆتایی سەدەی دووەم وسەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچیدا لەلایەن زانایانەوە دەستپێکرد ولە کتێبەکانیاندا هاتووە [27].

بەڵام سەبارەت بە لەئاسایی بەدەرەکان لە سوننەتدا زانایانی سوننەت زاراوەی نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی (علامات النبوة)یان بۆ بەکارهێناوە، وەك لە بابەکانی (صحیح البخاري)دا هاتووە [28]، پاشان زاراوەی بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی (دلائل النبوة) کە ٢ کتێب بەم ناونیشانە لەلایەن (أبونعیم الأصفهاني والبیهقي) نوسران، ئەویش لەبەرئەوەیە کە ئەم لەئاسایی بەدەرانە

---

[26] بروانە: شرح العقيدة الطحاوية – علي بن محمد بن أبي العز الدمشقي- تحقيق وتخريج: شعيب الأرناؤوط – مؤسسة الرسالة- الطبعة الثانية- ٢٠٠٥ – ٧٤٦/٢، هەروەها: مجموعة الفتاوى لشيخ الإسلام إبن تيمية- دار الوفاء- الطبعة الثالثة- ٢٠٠٥- ٣٣١/١١-٣٣٥.

[27] بروانە: الإعجاز العلمي في السنة النبوية – أ.د. صالح بن أحمد رضا – مكتبة العبيكان – الطبعة الأولى:٢٠٠١ – ص:١٨- ٣٧.

[28] بروانە: صحيح الإمام البخاري- مؤسسة الرسالة ناشرون- الطبعة الثالثة- ٢٠١٥.

بەڵگەیەکی ئاشکران لەسەر پێغەمبەرایەتی چونکە تەنها پەروەردگار دەتوانێت ئەوشتە ئاساییە جێگیرانەی رۆژانە بشکێنێت چونکە دروستکەریانە، ئەم بەڵگانەش دەرخەری راستی ناردنی پێغەمبەرن (ﷺ) لەلایەن خوداوە.

زۆرێك لە زانایان جیاوازییان نەکردووە لەنێوان موعجیزە وبەڵگەکان وەك ئیمامی (إبن حجر العسقلاني) دوای ئەوەی لە سەرەتای شەرحی (باب علامات النبوة في الإسلام)ی (صحيح البخاري)دا دەڵێت: موعجیزە تایبەترە لە بەڵگە، چونکە پێویستە موعجیزە مەرجی بەرامبەرکێی تێدابێت لە پێغەمبەرەکەوە بۆ ئەوانەی باوەڕی پێناهێنن یان بەدرۆی دەخەنەوە ومەرجیشە بەرامبەرکێکە بەشتێك بێت لەوانەی بەعادەت مرۆڤەکان ناتوانن هاوشێوەی بهێنن، بەڵام دواتر کە لە راڤەی ئەوبابەی بوخاری بەردەوام دەبێت زۆر فەرموودەی تری هێناوە کە لەئاسایی بەدەرە بەڵام مەرجی تەحەددای تێدانییە وبەهەمان شێوەش ناوینانون موعجیزات [٢٩].

لە زانا نوێکانیش (د.ضیاءالدين عتر) هەمان رێڕەوی گرتووە لە کتێبی (المعجزة الخالدة)دا کاتێك لەسەرەتادا جیاوازی کردووە لەنێوان موعجیزات وبەڵگەکان، موعجیزەی بەوە پێناسەکردووە کە:

(کارێکە پەروەردگار لەسەر دەستی پێغەمبەر دەیکات کە لەسەرووتوانای مرۆڤەکانەوەیە وياساکانی سروشت تێدەپەڕێنێت، وپێغەمبەر بەرامبەرکێی خەڵکی پێدەکات وکەس ناتوانێت بەرامبەری بوەستێتەوە).

دواتر هاتووە پۆلێنی موعجیزەکانی کردووە بۆ: هەستپێکراو وعەقڵی، ولەناو موعجیزە هەستییەکاندا (بەپێچەوانەی پێناسەکەی خۆیەوە) هەموو کارە

[٢٩] بڕوانە: فتح الباري شرح صحيح البخاري – أحمد بن علي ابن حجر العسقلاني– مكتبة دار السلام– الطبعة الثالثة– ٢٠٠٠– ٦٧٢/٦.

لەئاسایی بەدەرەکانی پێغەمبەری (ﷺ) بە موعجیزە داناوە وەك: زیادکردنی خۆراك وتەسبیحاتی بەرد و...تاد، کە ئەمانە بۆ بەرامبەرکێی هاوەڵەکان ئەنجامنەدراون بەڵکوبۆ دامەزراندنی باوەڕیان بووە [30].

بەپێی پێناسە کۆنەکەی موعجیزە زۆرێك لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی نابن بە موعجیزە چونکە مەرجی بەرامبەرکێ لەخۆناگرن، بۆیە پێویستیمان بەپێناسەیەکی نوێ وگشتگیر هەیە بۆ موعجیزە بەتایبەتی لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا.

من ئەوپێناسەیە بەگونجاو دەزانم کە (أ.د.صالح بن أحمد رضا) لە کتێبی (الإعجاز العلمي في السنة النبوية)دا هێناویێتی، ئەویش ئەوەیە:

(موعجیزە کارێکە یان ڕووداوێکە پەروەردگار لەسەر دەستی پێغەمبەرەکەی، یا زانستێکە لە ووتەکانیدا دەریدەخات، هیچ کەسێك لە سەردەمی ئەودا نەیتوانیوە هاوشێوەی بهێنێت ودەبێتە بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتیەکەی چونکە لەسەرووتوانای مرۆڤەکانەوەیە).

ئەم پێناسەیەش دەبێتە کۆکەرەوەی هەموورووەکانی ئیعجاز لە قورئان وسوننەتدا [31].

بەم شێوەیە هەمووئەوانەی بە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی ونیشانەکانی دانراون بێگومان بریتین لە موعجیزە، چونکە ئەم لەئاسایی بەدەرانە مەبەست پێی سەلماندنی پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) بووە، پەروەردگار ئەنجامیداون بۆ دامەزراندنی تەواوەتی بیروباوەڕی باوەڕداران.

---

[30] بروانە: المعجزة الخالدة– د.حسن ضياء الدين عتر– دار البشائر الإسلامية– الطبعة الثالثة–١٩٩٦– ص: ٥٠–٥٩.

[31] بروانە: الإعجاز العلمي في السنة النبوية – أ.د. صالح بن أحمد رضا – مكتبة العبيكان – الطبعة الأولى: ٢٠٠١ – ص:١٨– ٣٧.

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) چەندین موعجیزەی نیشانی هاوەڵەکانیداوە وەك زیادبوونی خۆراك وئاو، گریانی قەدەکە، سارێژکردنی برینی هاوەڵەکان، دوعا گیراوەکانی، تەسبیحاتی بەرد لەبەردەستیدا وچەندینی تر مەبەست پێی بەرامبەرکێ نەبووە لەگەڵ هاوەڵەکانیدا، چونکە ئەوان خۆیان ئیماندار بوون بەڵکوتەنها دەرخستنی پێغەمبەرایەتی ودامەزراندنی باوەڕیان بووە، چونکە لەمەوە دەردەکەوێت کە بکەری ئەم موعجیزانە تەنها پەروەردگارە وئەم کارانە لە سروشت وتوانای مرۆڤەکاندا نییە.

هەروەها زیادکردنی دەستەواژەی (لەسەردەمی پێغەمبەردا کەس نەیتوانیوە هاوشێوەی بهێنێت) ئیعجازی زانستیش لەخۆدەگرێت کە لە قورئان وسوننەتدا ئاماژەکانی هاتوون.

چونکە ئەو ئاماژە زانستییانە لەسەردەمی وەحی دا کەس نەیزانیون، و وردە وردە بەتێپەڕبوونی کات وزیادبوونی زانستی مرۆڤەکان ئەم راستییانە دۆزرانەوە وئاشکرابوون.

سەبارەت بە ئیعجازی زانستیش لە سوننەتدا کە بەشێکە لە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی، دەتوانین بەوە پێناسەی بکەین کە:

(بریتین لەوئاماژە زانستییانەی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی گەردوون ودروستکراوەکان ومرۆڤ داویێتی وتەنها دوای تێپەڕبوونی سەدان ساڵ راستییەکانیان بۆ مرۆڤەکان دەرکەوتووە).

کە دووپاتی دەکەینەوە ئەم ئاماژانەی سوونەتیش (هەروەك ئاماژە قورئانییەکان) بەهەمان شێوە موعجیزەن چونکە ئەم هەواڵانە لەسەروو توانا وزانیاریی مرۆڤەکانی سەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بووە وتەنها دوای تێپەڕبوونی سەدان ساڵ ئەم راستییانە بۆ مرۆڤەکان دەرکەوتن، کە هەندێك لەم

ئامازانـه زۆر نـویٚ وچـەند سـاڵێكی كـەم دەبێـت نهێنییـەكانیان بـۆ مرۆڤـەكان دەركەوتووە [32].

ئەی دەبێت سەرچاوەی ئەم زانیارییانە كێ بێت؟ كـە زانیـاریی مرۆڤـەكانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) نەبێت؟

بێگومـان سەرچـاوەكەی لەسـەروو مرۆڤەكانەوەیـە، كـە پـەروەردگاری دروستكەر وئاگاداری هەموو نهێنییەكانە.

---

[32] بڕوانە: مدخل الى دراسة الإعجاز العلمي في القرآن الكريم والسنة النبويـة المطهـرة – أ.د.زغلـول راغب محمد النجار– دار المعرفة– الطبعة الأولى– ٢٠٠٩.

# بەشی دووەم
# چەند نموونەیەکی ئیعجازی زانستی
# لە سوننەتدا

## کۆتایی پشتەسەر سەنتەری نوستن وبەخەبەر بوونە:

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە: ﴿يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَنَامَ ثَلاَثَ عُقَدٍ، يَضْرِبُ كُلَّ عُقْدَةٍ عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلاَّ أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلاَنَ﴾ (متفق عليه) واتە:کاتێك ئێوە دەخەون شەیتان ٣ گرێ دەدات لەناوچەی کۆتایی سەر لەپشتەوە، کە بەهەر یەکێکیاندا دەکێشێت ودەڵێت بنوو چونکە شەوگار درێژە وزۆری ماوە، کاتێك بەخەبەردێت ئەگەر یادی خودابکات گرێیەك دەکرێتەوە، وکاتێك دەستنوێژ دەگرێت گرێیەکی تر دەکرێتەوە وکاتێکیش نوێژدەکات گرێکەی تریش دەکرێتەوە وچالاکانە وبەدەروونێکی دروستەوە رۆژدەکاتەوە، ئەگەر وانەکات بە دەروونێکی تێکچوو وتەمەڵیەوە رۆژدەکاتەوە.

لێرەدا ئەم فەرموودە پیرۆزە ئاماژە بەوە دەدات کە شەیتان کار لە کۆتایی پشتەسەری مرۆڤ دەکات وبەمە دەبێتەهۆی سستکردنی وخەواڵوو کردنی بۆ رێگریکردن لە ئەنجامدانی شەونوێژ ونوێژی بەیانی.

ئەمەش ئیشارەتێکی ئاشکرایە بۆ ئەوەی کە کۆتایی سەر وسەرەتای مل لەپشتەوە شوێنی کۆنترۆڵ کردنی نوستنە لە مرۆڤدا چونکە شەیتان لەرێی کاریگەریی لەسەر ئەم ناوچەیە مرۆڤەکان خەواڵوو وناچالاك دەکات، ئەم راستییە زانستی توێکاری ئەم سەردەمە سەلماندویەتی، کە دەرکەوتنی ئەم راستییە

بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بەوەحی پشتگیریی کراوە ولەلایەن پەروەردگارەوە نێردراوە [٣٣].

سەبارەت بەمانای ئەم کارتێکردن وگرێدانە لەناوچەی کۆتایی پشتەسەر هەندێك لە زانایانی راڤەی فەرموودە وتوویانە کە ئەمە کارتێکردنێك وگرێدانێکی حەقیقییە کە لەلایەن شەیتانەوە ئەنجامدەدرێت ووەك کاری جادووگەرەکان وایە، لەوانە ئیمامی (نەوەوی) لە (شرح صحيح مسلم) وئیمامی (ابن حجر العسقلاني) لە (فتح الباري شرح صحيح البخاري) کە دەڵێت: بەدەستی خۆی دەکێشێت بەو گرێیانەی لەکۆتایی پشتەسەری داوە بەمەبەستی توندکردنی گرێکان وکاریگەریی تەواو لەو ناوچەیە [٣٤].

## ئاماژەی زانستیی فەرموودەکە:

لێرەدا ئەوەی مایەی سەرنجە ئاماژەی فەرموودەکەیە بۆ ئەوەی کاریگەریی شەیتان لەسەر ئەم ناوچەی کۆتایی پشتەسەرە دەبێت بە تایبەتی بۆ خەواڵووکردنی مرۆڤەکان وباسی هەموو سەری نەکردووە، بەڵکو تەنها ئەم ناوچەیەی تایبەتمەند کردووە بەم کاریگەرییە.

ئەگەر لەرووی زانستییەوە لێکۆڵینەوە بکەین بۆ کۆنترۆڵی نوستن وبەخەبەر هاتن لە مرۆڤدا دەبینین زانایانی توێکاریی وفیسیۆلۆجی دوای دۆزینەوەی زۆربەی فرمانەکانی سیستم وئەندامەکانی لەش بۆیان دەرکەوتووە کە سەرەکیترین ئەو سەنتەرانەی کۆنترۆڵی نوستن وبەخەبەرهاتن دەکەن دەکەونە بەشی ناوەڕاست

---

[33] http://m.quran-m.com/index.php/%D8%A7%D9%84%D8%B7%D8%A8-%D9%88-%D8%A7%D9%84%D8%AD%D9%8A%D8%A7%D8%A9/1624-2011-06-17-09-09-51.html قافية الرأس مركز النوم واليقضة

[٣٤] بڕوانە: فتح الباري شرح صحيح البخاري – أحمد بن علي ابن حجر العسقلاني– مكتبة دار السلام– الطبعة الثالثة – ٢٠٠٠، هەروەها: صحيح مسلم بشرح الإمام النووي – تحقيق:خليل مأمون شيحا – دار المعرفة – الطبعة الثانية عشرة – ٢٠٠٦.

ودواوەی قـەدی مێشـك (Brain Stem)، بەتایبـەتی لەناوچـەكانی ( Pons & Medulla)، شوێنی ئەم ناوچانە لە كۆتایی پشتەسەر دەكەوێتە دواوە، واتە لـە كۆتـایی سـەر لەپشـتەوە وسـەرەتای مـل لـەدواوە، وەك ئـەوەی پێغەمبـەر (ﷺ) ئاماژەی پێداوە.

چەند ناوچەیەكی تایبەتمەندی مێشك وەك: پێكهاتەی تۆڕیی (التشكيل الشبكي Reticular Formation)، وناوچـەی (Raphe Nuclei)، وناوچـەی (Nucleus solitaries) چالاكانە دەبنـە هـۆی دروسـتكردنی سـووڕی نوسـتن وبەخەبەر بوون لە مرۆڤدا [35]. **هەروەها بڕوانە وێنەكانی لاپەرە (٤٠٠)**

ئەوەی زیاتر كاری ئەم ناوچانەی سەلماند لەڕووی زانستییەوە ئەوەبوو لەكاتی ڕوودانـی زیـان وبرینـداریی لـەم ناوچـانەدا تێبینـی ئـەوەكرا كـە كەسـی برینـدار دووچاری نەمانی ئاگاهی وبێهۆشیی دەبێت [36].

---

[35] Guyton Textbook of Medical Physiology – Arthur C. Guytoln, John E. Hall – Elsenier Saunders – Eleventh Edition- 2006 – Pages: 739-741.
- Essentials of Medical Physiology - Prema& K Sembulingam – Jaypee – Fifth Edition – 2010 – Pages: 863-866, 891-894.
- Review of Medical Physiology – William F. Ganong – Lange – 22nd Edition – 2005 – Pages: 192-201.
- Davidson's principles & Practice of Medicine – Brian R. Walker - Churchill Livingstone - 22nd Edition – 2014 – Pages:1143-1148

[36] www.psych.fullerton.edu/mwhite/306pdf/306%20brain%20mechanisms%20and%20sleep.pdf
- http://thebrain.mcgill.ca/flash/a/a_11/a_11_cr/a_11_cr_cyc/a_11_cr_cyc.html:THE BRAIN STRUCTURESTHAT WAKE YOU UP AND PUT YOU TO SLEEP.
- https://www.ninds.nih.gov/Disorders/Patient-Caregiver-Education/Understanding-Sleep
- https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/19689306:Mechanisms of sleep-wake cycle modulation.
- https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pmc/articles/PMC3482689/Traumatic Brain Injury and Sleep Disorders؛

لێرەوە لەوە تێدەگەین کە بۆچی لەکاتی نوستندا شەیتان کاریگەریی فیعلی لەسەر ئەم ناوچەیە دروستدەکات، کە کۆتایی پشتەسەری مرۆڤە، چونکە ئەم جێگەیە وسەنتەرەکانی قەدی مێشکە لەناوسەرەتای برپڕەی پشتدا کە کۆنترۆڵی نوستن وئاگاهی لەمرۆڤدا دەکەن، ولەکاتی کارتێکردنیدا دەبێتەهۆی بەخەبەر نەهاتنەوەی مرۆڤەکە، چونکە لەرووی زانستییەوە ئەوە دەرکەوتووە کە هەتاوەکو ئەم ناوچانە چالاك بن مرۆڤ خەوی لێناکەوێت وبەئاگا دەبێت.

هەربۆیە شەیتان ٣ گرێ لەم ناوچەیە دەدات ونایەڵێت مرۆڤ چالاك ببێتەوە، وخەوی قورس دەبێت، وشەونوێژ ونوێژی بەیانی لەکیس دەدات ﴿يَضْرِبُ كُلَّ عُقْدَةٍ عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ﴾.



# لە حەرامكراوەكاندا چارەسەر نییە

لە سوننەتدا هـاتووە: ﴿إن الله لم يجعـل شـفاء أمـتي فيمـا حـرم عليهـا﴾ (رواه أبوداود وأبويعلي والبزار وصححه ابن حبان).

واتە: خودا شیفا وچارەسەری ئوممەتی منی لەو شتانەدا دانەناوە كـە حـەرامی كردووە لەسەریان، واتە بەشێوەیەكی گشتی ئەو شتانەی لە شـەریعەتی ئیسـلامدا حەرامكراون مایەی شیفا نین.

هەروەها دروست نییـە بەشـتی حـەرام چارەسـەری خۆمـان بكـەین، پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿إن الله خلق الداء والدواء، فتداووا، ولا تتـداووا بحـرام﴾ (رواه الطبراني: بإسناد رجاله ثقات كما في مجمع الزوائد) واتە: خـودا دەرد ودەرمانیشـی بـۆ دروسـتكردووە، ئێـوەش بـەدوای دەرمانـدا بگـەڕێن، بـەڵام چارەسـەر بەشـتی حەرام مەكەن، هەروەها دەفەرموێت: ﴿إن الله أنزل الداء والـدواء، وجعـل لكـل داء دواء،فتداووا ولا تداووا بحرام﴾ (رواه أبوداود:٣٣٥٨ وصـححه الألبـاني في السلسـلة الصـحيحة بـرقم:٦٠٣٣)، واتـە: خـودا دەرد ودەرمـانی دابەزانـدووە، وبـۆ هــەموو دەردێكـیش دەرمـانی دانـاوە، ئێـوەش چارەسـەری خۆتـان بكـەن، بـەڵام بەشـتی حەرام چارەسەر مەكەن).

خوای گەورە نەخۆشـی ودەرمانەكەشـی دروسـت كـردووە، ئێمـەش فـەرمانمان پێكراوە بە دوای ڕێگە چارەكاندا بگەڕێین، كە بێگومان بوونیان هەیە ولە خـواردن وخواردنەوەی حەڵاڵیشدا دەسـتدەكەون ئەگـەر بیدۆزینـەوە، بـەڵام پێدەچێت لـە كـاتی ونیـی ڕێگەچـارە حەڵاڵەكـەدا ناچـار بـبین هەنـدێك خـواردن وخواردنـەوە ومادەدەی حەرامكراو بەكار بێنین لە چارەسـەرەكانماندا، بـەڵام دەبێـت بـە ڕێـژەی پێویستی خۆی بێت وزیـادەڕەوی تێـدا نـەكرێت، لەگـەڵ ئـەوەی وا هەسـتدەكرێت دەستەوسـانی ئێمـەی مـرۆڤ بێـت كـە ڕێگەچـارە راسـتەقینە حەڵاڵەكـەمان درك پێنەكردبێت.

لەم بابەتەدا ئێمە تیشك دەخەینەسەر مەی ومادده كحولیەكان كە لە قورئان وفەرموودەدا بەتایبەتی حەرامكراوە ولەمبارەیەوە چەندین فەرموودە هەیە كە پێغەمبەر (ﷺ) رێگەینەداوە تەنانەت بۆ چارەسەریش بەكاربهێنرێت، كاتێك هاوەڵێك بەناوی (طارق بن سوید) داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) كرد كە رێگەی بدات مەی دروستبكات وئەویش رێگری لێكرد، هاوەڵەكەش ووتی: من بۆ چارەسەر كردنی نەخۆشی دروستی دەكەم، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ﴿إنه ليس بدواء ولكنه داء﴾ واتە: مەی چارەسەر نییە بەڵكو مایەی نەخۆشییە (رواه مسلم:٣٦٤٩، وابن ماجة:٣٤٨٢، واحمد:١٨٧٧٣-١٨٨٤٦-٢٢٥١٣).

چەند ساڵێك پێشتر دەووترا خواردنەوەی مەی بەبڕێكی كەم رۆژانە مرۆڤ لە هەندێك نەخۆشی دەپارێزێت بەتایبەتی جەڵتەی دڵ، بەڵام ئێستا لە سەدەی ٢١دا نوێترین توێژینەوە زانستییەكان ئەمەیان پووچەڵ كردووەتەوە، ودەڵێن تەنانەت كەمترین رێژەی مەی رۆژانە مەترسی تووشبوون بەنەخۆشییە جۆراوجۆرەكان بەتایبەتی شێرپەنجە چەند قات زیاد دەكات [٣٧].

بەكارهێنانی هەر رێگەیەك لە رێگەچارەكانی پزیشكی دەبێت دوای توێژینەوەی زانستی بێت، وچاكە وخراپەی ئەومادددانەی بۆ چارەسەر بەكاردەهێنرێن لێی بكۆڵرێتەوە، وكاتێكیش ماددەكە بەكاردێت دەبێت سوودەكانی راستەقینەبن وزیانەكانی زۆر كەم بن ئەگینا ئەوكاتە هیچمان بە هیچ نەكردووە، بەڵام كاتێك پێویست بوو بێگومان لەگەڵ زیانە زۆرەكانیشی ناچارین بەكاری بهێنین.

بۆ نموونە: دەرمانە ژەهراوییەكانی بەكاردەهێنرێن لە نەخۆشییە شێرپەنجەییەكاندا، كە پێشتر پێیان دەوترا: (Cytotoxic drugs) واتە: دەرمانی ژەهراویكەری خانە! بەڵام ئێستا ناویان گۆڕاوە وپێیان دەوترێت: (Chemo therapy) واتە: چارەسەری كیمیایی!

---

[٣٧] بابەتی: (ئایا مەی لە جەڵتەی دڵ دەمانپارێزێت) – نووسینی: د.دیاری أحمد إسماعیل – گۆڤاری (هەیف) – ژمارە ٣٥ – ٢٠١٤.

(هیچ برێك له كحول سەلامەت نییە) ئەمە ناونیشانی توێژینەویەكی پزیشكییە كە لە مانگی نیسانی ساڵی (٢٠١٤)دا بڵاوكراوەتەوە، كە لەلایەن توێژەران (Laura A. Stokowskin، RN، MS ) ئەنجامدراوە، تێیداهاتووە: [٣٨]

(خواردنەوەی بەرپرس – Responsible drinking) كە بریتییە لە خواردنەوەی برێكی كەم لە مەی لە چەند كاتێكی دیاریكراودا بووەتە ویردی سەر زمانی سەدەی ٢١، بەڵام كاتێك باس لە بوونی بە هۆكاری شێرپەنجە دەكرێت هیچ برێك لە كحول سەلامەت نییە [٣٩]، ئەمە دەرەنجامی راپۆرتی جیهانیی شێرپەنجە (World Cancer Report – WCR) بووكە لە لایەن رێكخراوی تەندرووستی جیهانی (WHO) – دەزگای نێودەوڵەتی بۆ توێژینەوە لەسەر شێرپەنجە (IARC) بڵاوكرایەوە، هەر لەلایەن دەزگای (IARC) لە ساڵی (١٩٨٨)دا راگەیەنراوە كە كحول ماددەیەكی تووشكەری شێرپەنجەیە (carcinogen)[٤٠]. **هەروەها بروانە وێنەكانی لاپەڕە (٤٠١)**

مەترسی مەی خواردنەوە پەیوەندی بە قەبارەی ژەمەكانەوە هەیە،تا كحول زیاتر بخورێتەوە مەترسییەكان زیاتردەبن.

---

38 https://www.medscape.com/viewarticle/824237_5: No Amount of Alcohol Is Safe - Laura A. Stokowski, RN, MS Disclosures April 30, 2014 --- PDF: www.archive.healthycaribbean.org/newsletters/may-2014/No-Alcohol-Is-Safe.pdf

39 Rehm J, Shield K. Alcohol consumption. In:Stewart BW, Wild CB, eds. World Cancer Report 2014 Lyon-France:International Agency forResearch on Cancer; 2014.

40 Alcohol drinking. IARC Working Group, Lyon, 13-20 October 1987. IARC Monogr Eval Carcinog Risks Hum. 1988;44:1-378.

پەیوەندی نێوان شێرپەنجە وکحول خواردنەوە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیە لە هەندێ جۆری شێرپەنجەدا، وەك شێرپەنجەی دەم وقورگ وقورقوڕاگە وسورێنچك وکۆڵۆن وڕێکە وجگەر ومەمك، هەروەها پەنکریاس ولیوکیمیا وشێرپەنجەی ملی منداڵدان ودەرچە وزێی کۆئەندامی زاووزێی مێینە وپێست، کە بە ڕێژەیەکی کەمتر پەیوەندی ژەمەکانی خواردنەوەی کحول لەگەڵ ئەم شێرپەنجانە وشێرپەنجەکانی میزەڵدان وگەدە وسییەکان دۆزراوەتەوە [41].

ئایا ڕاستە خواردنەوەی ڕێژەیەکی کەمی کحول نابێتە هۆی توشبوون بە شێرپەنجە؟

لە کۆ توێژینەوەیەك (Meta-analysis) کە ٢٢٢ توێژینەوەی لە خۆگرتووە: ١٥٢٠٠٠ بەشداربووی لەخۆ گرتبوو، ٩٢٠٠٠ کەسیان بەڕێژەیەکی کەم کحولیان خواردبۆوە وشێرپەنجەیان هەبوو، بەڵام ٦٠٠٠٠ کەسیان نەیانخواردبۆوە وشێرپەنجەیان هەبووە.

بینرا کە ئەوانەی بەکەمیش دەخۆنەوە مەترسی توشبوونیان هەیە بە شێرپەنجەی دەم وگەروو وسورێنچك ومەمك [42].

لەو کۆتوێژینەوەیەدا دەرکەوتووە: ساڵی ٢٠٠٤ لەسەر ئاستی جیهان٥٠٠٠ حاڵەتی مردن تۆمارکراوە بە هۆکاری شێرپەنجەی دەم وقورگ، ٢٤٠٠٠ حاڵەتیش بەهۆی شێرپەنجەی سوورێنچەکەوە، و٥٠٠٠ حاڵەتیش بەهۆی شێرپەنجەی مەمکەوە، کە هۆکانیان گەڕێندراوەتەوە بۆخواردنەوەی ڕێژەیەکی کەمی کحول ڕۆژانە لەوکەسانەدا.

---

[41] Rehm J, Shield K. Alcohol consumption. In:Stewart BW, Wild CB, eds. World Cancer Report 2014 Lyon-France:International Agency forResearch on Cancer; 2014.

[42] Bagnardi V, Rota M, Botteri E, et al. Light alcohol drinking and cancer:a meta-analysi. Ann Oncol. 2013; 24:301-308.

خواردنەوەی کحول بەلای کەمەوە ١٥ ماددەی شێرپەنجەکەر (کارسینۆجین Carcinogen)ی تێدایە لەوانە: ئەسیت ئەڵدیهاید Acetaldehyde، ئەکریلەماید Acrylamide، ئەفلادۆکسینەکان Afladoxins، زەرنیخ Arsenic، بەنزین Benzene، کادمیۆم Cadmium، ئیسانۆل Ethanol، کاربۆناتی ئەسیل Ethyl Carbonate، فۆرماڵدیهاید Formaldehyde، قورقوشم Lead [٤٣].

ترسناکترین وشێرپەنجەکەرترین ماددەش لە مەیدا ئەسیتئەڵدیهایدە، کاتێك ئەو ماددە زیانبەخشانە بەر ناوپۆشی گەروو وناودەم وقورقوراگە وسورێنچك دەکەون –بەتایبەتیش بەهۆی بەرزی چڕی ئەسیت ئەڵدیهایدەوە– دەبێتە هۆی ئەستوور بوونی ناوپۆشەکەیان (hyperproliferation)، تەنانەت ژەمێکی کەمی کحولیش کە ڕاستەوخۆ بەر ئەوناوپۆشە دەکەوێت مەترسی تووشبوونی شێرپەنجە زیاد دەکات تیایاندا [٤٤].

کەواتە بە بەڵگەی زانستیی دەرکەوت کە هیچ بڕێکی مەی یان کحول سەلامەت نییە بۆ بەکارهێنان، وخۆی لەخۆیدا نەخۆشییە ونەخۆشی دروستکەرە ئیتر چۆن شیفا وچارەسەری تێدا دەبێت؟!

---

[43] Lachenmeier DW, Przbylski MC, Rehm J. Comparative risk assessment of carcinogens in alcoholic beverages using the margin of exposure approach. Int J Cancer. 2012;131:E995-E1003.

- Seitz HK, Becker P. Alcohol metabolism and cancer risk. Alcohol Res Health. 2007;30:38-41, 44-47.

[44] Homann N, Kärkkäinen P, Koivisto T, Nosova T, Jokelainen K, Salaspuro; M. Effects of acetaldehyde on cell regeneration and differentiation of the upper gastrointestinal tractmucosa. J Natl Cancer Inst. 1997;89: 1692-1697.


﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلْآفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمْ
حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ
بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾
[فصلت: ٥٣]


رسول الله
صلى الله عليه وآله

## ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە کلێنچکە (عجب الذنب)ی کردووە بەبنچینەی دروستبوونی مرۆڤ

لە چەند فەرموودەیەکدا پێغەمبەر (ﷺ) باسی کلێنچکەی کردووە کە بەشێکی گرنگی لەشی مرۆڤە، وبە بەردی بناغەی دروستبوونی کۆرپەلەی مرۆڤی داناوە، بەڕوونی باسی ئەوەی کردووە کە مرۆڤ لەمەوە دروست دەبێت، وەك لە فەرموودەکانی:

- ﴿كُلُّ ابْنِ آدَم يَأْكُلُه التُّراب إلاّ عَجْبَ الذَّنب، مِنْهُ خُلِقَ وَمِنْهُ يُركب﴾ (رواه مسلم) واتە: هەمووبەشێکی مرۆڤ گڵ دەیخوات ودەیڕزێنێت تەنها بەشێکی ئێسکی کلێنچکە نەبێت کە هەرگیز زەوی ناتوانێت بیفەوتێنێت، لەم ئێسکەوە ئادەمیزاد دروستبووە وهەر لەمیشەوە زیندوو دەبێتەوە.

- ﴿كُلّ ابْن آدَم تأْكُلُ الأرضُ إلاّ عَجْب الذَّنَب مِنْه خُلِقَ وفيه يُركَّب﴾ (رواه أبوداود) واتە: هەموو مرۆڤێك زەوی دەیخوات ودەیڕزێنێت تەنها بەشێکی ئێسکی کلێنچکە نەبێت لەم ئێسکەوە دروست بووە وهەر لەمیشەوە زیندوو دەبێتەوە.

ئەم فەرموودانە چەند ئاماژەیەکی زانستیی زۆر نوێی تێدایە کە کۆرپەلەی مرۆڤ لەم کلێنچکەوە دروست دەبێت، ویەکەم شتێك کە لە کۆرپەلەکەدا دروستبوونی تەواو دەبێت بریتیە لەم کلکە کە پاشان مرۆڤ وهەموو ئەندام وشانەکانی لێوە دروست دەبێت.

زانایانی زمانی عەرەبی سەبارەت بە (عَجْب الذَّنَب) دەڵێن: (هوالعظم الذي في أسفل الصلب عند العجز) [45] واتە: بریتییە لەو ئێسکەی کە لە کۆتایی بڕبڕەی پشتدا هەیە (واتە ئێسکی کلێنچکە)، ئەم ئێسکە لە ئاژەڵانیشدا هەیە وکلك دروست دەکات، فەرموودەکە ووشەی (الذَّنَب)ی بەکارهێناوە بە مانای (کلك)، کە ئەوە دەگەیەنێت کۆرپەلەی مرۆڤ پێشتر کلکی هەبووە ولە دواییدا دەپووکێتەوە.

---

[45] بڕوانە: فەرهەنگی (لسان العرب)/ ماددەی (عجب).

لەم فەرموودانەدا چەند ئاماژەیەکی زانستیی نویّ تێدەگەین:

یەکەمیان: مرۆڤ کلکی هەبوە.

دووەمیان: کۆرپەلەی مرۆڤ لەم کلێنچکەوە دروست دەبێت.

سێیەمیان: شوێنی دروستبوونی کۆرپەلە لە کۆتایی ئەم کلکەدایە.

چوارەم: ئەم شوێنە بریتیە لە ئێسك.

پێنجەم: کۆتایی ئەم کلکە زۆر بچووکە (بڕوانە ووشەی (حَبَّة خَردَل) کە لە فەرموودەکاندا بەکارهاتووە).

شەشەم: یەکەم شتێك کە لە کۆرپەلەکەدا دروستبوونی تەواودەبێت بریتییە لەم کلکە کە پاشان مرۆڤ وهەمووئەندام وشانەکانی لێوە دروست دەبێت.

## کلێنچکە لە زانستی کۆرپەلەزانیدا ( شریتی سەرەتایی ):

تازەترین توێژینەوەی زانستی کۆرپەلەزانی روونی کردۆتەوە کە کلێنچکەی مرۆڤ لە سەرەتادا بریتییە لە ئەندامێکی بچووك پێیدەوترێت: هێڵی سەرەتایی یان شریتی سەرەتایی (Primitive Streak)، لەگەڵ دەرکەوتنی ئەم شریتە سەرەتاییەی کۆرپەلەکە، چینەکانی لەش وئەندامەکانی کۆرپەلە وکۆئەندامی دەماری کۆرپەلەکە پێکدێنێت، دوایی ئەم شریتە سەرەتاییە هیچ شوێنەوارێکی نامێنێت جگە لە جێماوەیەك نەبێت، کە لە مرۆڤی پێگەیشتوودا پێی دەڵێن ئێسکی کلێنچکە (Coccyx) [٤٦].

[46] THE DEVELOPING HUMAN- CLINICALLY ORIENTED EMBRYOLOGY - Keith L. Moore, T.V.N. Persaud, Mark G. Torchia, Elsevier, TENTH EDITION- INTERNATIONAL EDITION- 2016 - Pages:52-58 .

–Langmann's Medical Embryology - T.W.Sadler - Lippincott Williams & Wilkins - 10th Edition - 2006- Pages:55-63.

## پێکهاتنی شریتی سەرەتایی:

لـــە چـــواردەهەمین ڕۆژی گەشـــەکردنی کۆرپەلـــەدا ٢ خەپلەکـــەی کۆرپەلـــە درێژدەبنـــەوە هـــەتا شـــێوەیەکی هـــەرمێیی وەردەگـــرن، ســـەرەپانەکەی بەشـــی پێشەوەیەتی بەڵام بەشە کۆتاییەکەی باریك دەبێتەوە.

خانـەکانی چـینی ئیکتـۆدێرمی دەرەوە لـە ناوچـەی کۆتاییـدا چـالاك دەبـن وسەرەنجام دەبنە پێکهێنـەری شـریتی سـەرەتایی (Primitive Streak)، بـۆ یەکـــەمجار لـــە پانزەهـــەمین ڕۆژی دوای پیتانـــدنی هێلکەکـــەدا دەردەکـــەوێت، وپێکهـــاتووە لـــە خانـــەی شێوەداســـی لـــە کۆتـــایی چـــینی دەرەوەی دیســـکی کۆرپەلەکەدا.

لـــە ســـەرەتای هەفتـــەی ســـێیەمدا ودوای پێکهـــاتنی شـــریتی ســـەرەتایی دابەشبوونێکی خێرا وگەشەکردنێکی بەپەلە لە خانەکانی ئەم شریتەدا ڕوودەدات، ودەبێتە هۆی درێژ بوونەوەی ودوایی هێڵێکی ڕاست پێکدێنێت، هەردوو لای ڕاست وچەپی کەمێك بـەرز دەبنـەوە وکۆتاییەکەشـی بـەرزتر دەبێـت وگرێـی سـەرەتایی (Primitive node) دروستدەکات.

**بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی لاپەڕە (٤٠٢-٤٠٣)**

---

-http://www.med.umich.edu/lrc/coursepages/m1/embryology/ embryo/ 05embryonicperiod. htm :Anatomy- University of Michigan Medical School - Embryonic Period (3-8 weeks.)

-http://www.sciencedirect.com/topics/neuroscience/primitive-streak.

-https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/18023726 ; The mechanisms underlying primitive streak formation in the chick embryo Chuai M, Weijer CA - Curr Top Dev Biol. .٢٠٠٨"٨١-١٣٥:٥٦

-https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pmc/articles/PMC2949267/ ; The enigmatic primitive streak:prevailing notions and challenges concerning the body axis of mammals ; Karen M. Downs – Bioessays. 2009 Aug; 31 (8):892–902.

له كاتی درێژ بوونەوەی ئەم شریتەدا له ناوەڕاستیدا ڕێڕەوێك دروست دەبێت كە پێیدەووترێت چاڵایی سەرەتایی (Primitive groove)، لەم ڕێڕەوەوە خانەكانی شریتی سەرەتایی دەچنە ناو دیسكی كۆرپەلەكەوە لەڕێی كونێكەوە كە پێیدەوترێت كونی سەرەتایی (Primitive pit)، لێرەوە شریتی سەرەتایی دروستبوونی تەواودەبێت كە دەكەوێتە بەشی كۆتایی دیسكی كۆرپەلەكەوە، كاتێك شریتی سەرەتایی دروست دەبێت ئیتر دەتوانرێت تەوەرەی پێشەوە بۆ دواوەی كۆرپەلەكە بزانرێت وپێشەوە ودواوەی دیاری دەبێت، هەروەها بەشی پشتی وسكی وراست وچەپی جیادەكرێتەوە [٤٧].




پاش دروستبوونی شریتی سەرەتایی بە ماوەیەكی كەم كۆچی خانەكان لە دەرەوە بۆ ناوەوە بەناو ڕێڕەوەكەدا ڕوودەدات، ودیسكی كۆرپەلەكە جیادەبێتەوە بۆ ٣ چین.

خانە دروستبووەكان له شریتی سەرەتاییەوە لە كونی سەرەتاییەوە دەچنە ناو كۆرپەلەكەوە وبەلای ڕاست وچەپدا بڵاودەبنەوە، دوایی ئەم خانە

---

[47] THE DEVELOPING HUMAN- CLINICALLY ORIENTED EMBRYOLOGY - Keith L. Moore, T.V.N. Persaud, Mark G. Torchia, Elsevier, TENTH EDITION- INTERNATIONAL EDITION- 2016 - Pages:52-58.

-Langmann's Medical Embryology - T.W.Sadler - Lippincott Williams & Wilkins - 10th Edition - 2006- Pages:55-63.

کۆچکردووانە دەبنە پێکهێنەری چینێکی نوێ لە کۆرپەلەکەدا، کە پێیدەووترێت چینی ناوەراست یان (میزۆدێرم Mesoderm)، ئەم چینە نوێیە پاش ماوەیەکی کەم کاردەکاتە سەر چینی هایپۆبلاست (Hypoblast) ودەبێتە هۆی گۆڕانی ئەم چینە ودروستبوونی چینێکی نوێ کە جێیدەگرێتەوە وپێیدەووترێت ئیندۆدێرم (Endoderm)، زۆر بە کورتی دەتوانین بڵێین لە ئەنجامی پێکهاتنی شریتی سەرەتایی وخێراتربوونی دابەشبوونە چالاکیەکەی دیسکی کۆرپەلەکە درێژ دەبێتەوە، وهەر سێ چینەکەی لەشی دروست دەبن ولە یەکتری جیادەبنەوە[٤٨].




لە ناسراوترین ئەوزانایانەی باسی شریتی سەرەتاییان کردووە هەردووزانا (هانس سپیمان hans spemann) و (هیلدا مانگۆلد Hilde Mangold)ن، کە هەستان بە توێژینەوە لەسەر شریتی سەرەتایی وبۆیان دەرکەوت کە کرداری دروستبوونی کۆرپەلەکە رێکدەخات، وناویاننان رێکخەری سەرەتایی ( Primary organizer)، ئەم ٢ زانایە هەستان بە برینی ئەم بەشەی کۆرپەلەیەك وچاندنی

[48] THE DEVELOPING HUMAN- CLINICALLY ORIENTED EMBRYOLOGY - Keith L. Moore, T.V.N. Persaud, Mark G. Torchia, Elsevier, TENTH EDITION- INTERNATIONAL EDITION- 2016 - Pages:52-58.

لە کۆرپەلەیەکی تری ئاژەڵدا کە لە هەمان تەمەندا بوو لە هەفتەی سێیەم وچوارەمدا، ئەوەبوو ئەم پارچە چێنراوە بووە هۆی دروستبوونی کۆرپەلەیەکی تری لاوەکی لە کۆرپەلە سەرەکیەکەدا، ساڵی (١٩٣٥) زانای ئەڵمانی سپیمان خەڵاتی (نۆبل)ی وەرگرت لەسەر ئەو دەست پێشخەریانەی بۆ دۆزینەوەی شریتی سەرەتایی وچاندنی [49].

بەڵام دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) پێش ١٤٠٠ساڵ باسی کاری ئەم شریتەی کردووە، بەڵام بە زاراوەی جیاواز وناوی (عجب الذنب)ی لێناوە کە فەرموویەتی (منه خلق) واتە: مرۆڤ لەمەوە دروستبووە.

لەبەر ئەم گرنگیەی شریتی سەرەتایی راپۆرتی (وارنۆك Warnock) لە پەرلەمانی بەریتانیا تایبەت بە پیتاندنی دەستکرد لە دەرەوەی منداڵدان وقۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە کردوویەتی بە نیشانە وقۆناغی جیاکەرەوە بۆ ئەنجامدانی تاقیکاریی لەسەر کۆرپەلە دوای پیتاندنی دەستکرد، پێش پەیدابوونی ئەم شریتە یاساکە رێگا بە تاقیکردنەوە دەدات لەسەر کۆرپەلەی مرۆڤ، بەڵام پاش پەیدابوونی ئەم شریتە (کە یاساکە بە سەرەتای پەیدابوونی راستەقینەی مرۆڤی

---

[49] https://www.nobelprize.org/nobel_prizes/medicine/laureates/ /١٩٣٥spemann-lecture.html ; Hans Spemann - Nobel Lecture, December 12, 1935 ; The Organizer-Effect in Embryonic Development.

- https://embryo.asu.edu/pages/hans-spemann-1869-1941 ; The Embryo Project Encyclopedia " Hans Spemann (1869-1941) - By:Karen Wellner ; Published:2010-06-15.

- https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pmc/articles/PMC2464568/ ; Spemann's organizer and self-regulation in amphibian embryos ; Edward M. De Robertis ,Nat Rev Mol Cell Biol. 2006 Apr; 7(4):296- 302 .

- https://embryo.asu.edu/pages/hilde-mangold-1898-1924 ; The Embryo Project Encyclopedia " Hilde Mangold (1898-1924) - By:Maria Doty; Published:2011-05-09.

- http://www.bioinfo.org.cn/book/Great%20Experments/great30.htm; Spemann and Mangold's Discovery of the Organizer

داناوه) هەموو جۆره تاقیکارییەکی لەسەر کۆرپەلەی مرۆڤ قەدەغە کردووه لە ڕۆژی چواردەیەمی دروستبوونی کۆرپەلەکەوه، کە لەم ڕۆژەوه شریتی سەرەتایی پەیدادەبێت [50]. **هەروەها بڕوانە وێنەکانی لاپەڕه** (٤٠٥)

(د. کیس مور) لەمبارەوه دەڵێت: بەشی هەره زۆری گەشە کردن ودرێژ بوونەوەی تۆپەڵە خانەکەی کۆرپەلە دەگەڕێتەوه بۆ کۆچ کردنی خانەکان لە شریتی سەرەتاییەوه، ولەبەرئەوەی ئەم شریتە دەکەوێتە بەشی دواوەوەی (بەشی کلکی) تۆپەڵە خانەی کۆرپەلەکەوه، کەواتە ئەم کلکەی کۆرپەلەکەیە کە بناغە وسەرەتای ڕاستەقینەی دروستبوونی ئەندامەکانی کۆرپەلەی مرۆڤە.

کەواتە دروستبوونی شریتی سەرەتایی بریتییە لە سەرەتایەکی ڕاستەقینەی جیابوونەوەی شانەکانی کۆرپەلە بۆ دروست کردنی چینە جیاجیاکان وئەندامەکانی لەشی کۆرپەلەکە، لەڕاستیدا ئەوەی دەناسرێت بە قۆناغی دروستبوونی ئەندامەکان (Organization) لە کۆرپەلەدا تەنها دوای پەیدابوونی شریتی سەرەتایی دەست پێدەکات، کە لە سەرەتای هەفتەی ٤ تا کۆتایی هەفتەی ٨ دەخایەنێت.

بە شێوەیەك کە کۆرپەلەکە لە کۆتایی ئەم ماوەیەدا هەموو کۆئەندامە سەرەکییەکان وئەندامەکانی تێدا دروستبووه، وتەنها هەندێك وردەکاریی کەم

---

[50] https://embryo.asu.edu/pages/report-committee-inquiry-human-fertilisation-and-embryology-1984-mary-warnock-and-committee.

- http://www.legislation.gov.uk/ukpga/1990/37/contents ; Human Fertilisation and Embryology Act 1990.

- http://www.hfea.gov.uk/docs/Warnock_Report_of_the_Committee_of_Inquiry_into_Human_Fertilisation_and_ Embryology_1984.pdf " Warnock, Mary.

Chairman. Report of the Committee of Inquiry into Human Fertilisation and Embryology. London:Her Majesty's Stationery Office, 1984.

وگەورەبوون وگەشە کردنی ئەم ئەندامانە ماوە، کە لە قۆناغەکانی داهاتوودا روودەدەن[٥١].

لێرەوە بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین مرۆڤ لە شریتی سەرەتاییەوە دروست دەبێت وسەرەتای راستەقینەی هاتنە بوونێتی لەداهاتوودا.

## سەرەنجامی شریتی سەرەتایی:

لێرەدا کاتی پرسیارێك هاتووە کە دەڵێت: ئایا ئەم بەشەی کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت بەڕاستی کلکە؟ وسەرەنجام چی لێدێت؟

ئەگەر سەیری (وێنەی خوارەوە) بکەین کە گەشەکردنی کۆرپەلە روونەکاتەوە، دەبینین بە جوانی وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەدرێتەوە، کە بۆمان دەردەخات چۆن ئەم بەشەی دواوەی کۆرپەلەکە لوولدەخوات بۆ ئەوەی کلکێك دروست بکات.




١- وێنەیەکی راستەقینەی کلکێك کە بۆکۆرپەلەکە دروستدەبێت لە هەفتەی چوارەمدا.
٢- لەم وێنەیەدا دەبینین کە چۆن کلکەکە نامێنێت لە هەفتەی حەوتەمدا.

کە هەردوو وێنەکە وێنەیەکی راستەقینەی ئەم کلکەیە لە کۆرپەلەیەکی ٤ هەفتەدا، ونەمانی ئەم کلکە لە هەفتەی حەوتەمدا.

[51] THE DEVELOPING HUMAN- CLINICALLY ORIENTED EMBRYOLOGY - Keith L. Moore, T.V.N. Persaud, Mark G. Torchia, Elsevier, TENTH EDITION- INTERNATIONAL EDITION- 2016 - Pages:52-58.

پاش دروستبوونی ئەندامانەکان لێیەوە وتەواو بوونی کاری ئەم شریتە لە هەفتەی چوارەمدا، سەرەنجام ئەم شریتە دەستدەکات بە پووکانەوە وتەنها لە کۆتایی بڕبڕەی پشتی کۆرپەلەکەدا دەمێنێتەوە، (د. کیس مور) دەڵێت: شریتی سەرەتایی دوای ئەم کردارانە زۆر بە زوویی دەچێتەوەیەك ولە قەبارەدا بچووك دەبێتەوە ودەبێت بە ئەندامێکی ناگرنگ لە ناوچەی کۆتایی بڕبڕەی پشتدا (لە ئێسکی کلێنچکەدا) [52]. **هەروەها بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە (٤٠٤)**

کەواتە لەبەرئەوەی شریتی سەرەتایی بریتییە لە هۆکاری گەشەکردنی کۆرپەلە، ولە مرۆڤی گەورەدا شوێنەوارەکەی تەنها بریتییە لە ئێسکی کلێنچکە، سەرەنجامی گشتی دەتوانین بڵێین کە بەشێکی ئەم کلێنچکەیە بنچینەی دروستبوونی مرۆڤە، بە تەواوەتی وەك فەرموودەکان ئاماژەیان پێداوە.

ناوچەی کلێنچکە ناوچەیەکی ئێسکیە ولەبەرئەوەی شریتی سەرەتایی دەبێت بە بەشێك لەم ناوچەیە ئەوا دەتوانین بڵێین: لە گەورەدا شریتی سەرەتایی یان (عجب الذنب) بریتیە لە ئێسکێك.

لێرەدا سەبارەت بەو زاراوەیەی کە لە فەرموودەکاندا هاتووە (عجب الذنب) دەڵێین: وەك پێشتر بینیمان لە رووی کۆرپەلەزانییەوە گونجاوترین زاراوەیە بۆ وەسفکردنی ئەوبەشەی کە کۆرپەلەکەی لێوە دروستدەبێت، زۆر گونجاوترە لە زاراوەکانی (شریتی سەرەتایی یان هێڵی سەرەتایی) و(رێکخەری سەرەتایی) کە زانایانی کۆرپەلەزانی بەکاری دێنن.

چونکە زاراوەی (عجب الذنب) ئاماژە دەدات بە بوونی کلك لە کۆرپەلەدا (ذنب)، وهەروەها ئاماژە دەدات بەو شوێنەی کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت (ئەویش بەهۆی ووشەی عجب: کە بە مانای کۆتایی کلك دێت)، هەروەها ئاماژە دەدات بۆ قەبارەی ئەوشتەی کە مرۆڤی لێوە دروست دەبێت (ئەویش لەرێی

---

[52] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ووشەی عجب: کە مانایەکی تری بریتیە لە بەشێکی بچووکی کۆتـایی ئێسـکی کلـك یان بەشێکی کلێنچکە).

ئەم لەپێشیەی زاراوەکەی فـەرموودەکان هەیـەتی بەسـەر زاراوە زانسـتیەکاندا ئیعجازێکی دەربڕین وبەیان کردنە لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ).

بەپێی سەرچاوەکانی کۆرپەلـەزانی شریتی سـەرەتایی لـە ئێسـکی کلێنچـکەدا شـوێنەوارێك دروسـتدەکات ئەوەنـدە بچـووکە کـە حیسـابی بـۆ ناکرێـت وبەچـاو نابینرێت [٥٣].

کە دەقاودەق ئەمەیە پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بۆ داوە کە هەموو لەشـی مـرۆڤ پاش مردن دەڕزێت ونامێنێـت تـەنها بەشـێکی کـەمی ئـەم کلێنچـکەیە نـەبێت کـە بەچاو نابینرێت (واتە:عجب الذنب)، فەرموویەتی: ئادەمیزاد لەمەوە دروست بووە، وهەر کاتێك پـەروەردگار وویسـتی لێبێـت لـە ڕۆژی دواییـدا لەشـی مرۆڤـەکان لـەو بەشە کەمەی ئێسکی کلێنچکەوە دروستدەکاتەوە [٥٤].

---

[٥٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٥٤] بڕوانە: ئاماژەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان وسوننەتدا – د.کاوە فەرەج سەعدون – چاپی یەکـەم– ٢٠٠٨.

– هەروەها: گۆڤـاری (الإعجـاز): ژمـارە (١)ی صـەفەری ١٤١٦ك – تـەمموزی ١٩٩٥ز – (هیئـة الإعجـاز العلمي في القرآن والسنة)/ بابەتی: (الإعجاز الطـبي في أحاديـث الرسـول عـن عجـب الـذنب: د.محمـد علـي البار)، هەروەها: إعجاز القرآن فيما تخفيـه الأرحـام/ كـريم نجيـب الأغـرّ/ دار المعرفـة – بـيروت/ الطبعـة الأولى– ٢٠٠٥.

# دیاردەی هەورە بروسکە شایەتی لەسەر پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) دەدات

پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکدا دەربارەی دوارۆژ وپردەکەی (صراط)ی دۆزەخ دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَوْا إِلَى الْبَرْقِ كَيْفَ يَمُرُّ وَيَرْجِعُ فِي طَرْفَةِ عَيْنٍ﴾ (رواه مسلم) واتە: ئایا هەورە بروسکەتان نەبینیوە کە دەڕوات ودەگەڕێتەوە لە چاوترووکانێکدا.

لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) دیاردەی هەورە بروسکە بۆ هاوەڵانی ڕووندەکاتەوە بەووردەکارییەکی زۆر وباسکردنی هەندێك نهێنی هەورە بروسکە کە مرۆڤ تاوەکودوای سەدەی هەژدەیەم نەبێت پەی بەونهێنیانە نەبردووە، باسکردنی ٢ قۆناغی ڕۆشتن وگەڕانەوە بۆ تەزووی هەورە بروسکە دەستپێشخەرییەکی گەورەیە چونکە ئێمە بەچاوی ئاسایی تەنها هەورە بروسکەکە دەبینین وئەم ٢ قۆناغە نابینین.

دەرکەوتنی نهێنییەکانی هەورە بروسکە وقۆناغەکانی تەنها دوای سەدەی بیست ویەکەم وداهێنانی ئامێرە پێشکەوتووەکانی پێوانە ووێنەگرتن بوو، کە ئامێری وێنەگرتنی زانستی وا پەیدابووە کە لە چرکەیەکدا دەتوانێت زیاتر لە ١٠٠٠ وێنە بگرێت، پاشان توانرا ٢ قۆناغی ڕۆشتن وگەڕانەوە بۆ تەزووی کارەبایی هەورە بروسکەکە دیاری بکرێت [٥٥].

---

[55] https://www.srh.noaa.gov/jetstream/lightning/lightning_max.html ; JetStream Max:The Lightning Process:Keeping in Step.

- http://journals.ametsoc.org/doi/abs/10.1175/1520-0493(2001(129%3C0108%3ACSASBE%3E2.0.CO%3B2 ; Combined Satellite- and Surface-Based Estimation of the Intracloud-Cloud-to-Ground Lightning Ratio over the Continental United States, Dennis J. Boccippio ,Kenneth L. Cummins ,Hugh J. Christian and Steven J. Goodman.

پاشان دیاریکردنی خێرایی بۆ هەورە بروسکە دەستپێشخەرییەکی بێوێنەیە کە لە فەرموودەکەدا بە چاوتروکاندنێك دیاریکردووە، لە چەند توێژینەوەیەکی نوێدا دەرکەوت کە ئەوماوەیەی هەورە بروسکە دەیخایەنێت لەنێوان ١٠-١٠٠ میللی چرکەدایە (میللی چرکە بریتییە لە ١ بەش لە ١٠٠٠ بەشی چرکەیەك)، بەهەمان شێوەش ماوەی چاوتروکانێك لەمرۆڤدا هەمان کات دەخایەنێت کەبەپێی تەمەن وباری تەندروستی ودەروونی دەگۆڕێت بەڵام هیچ کاتێك لەوماوەیە تێناپەڕێت [٥٦].




---

- http://www.public.asu.edu/~gbadams/lightning/lightning.html ; Lightning ; Compiled and Created by Dennis Mollet and James Kistner.
- https://lightning.nsstc.nasa.gov/primer/primer2.html ; A Lightning Primer ; Characteristics of a Storm LIGHTNING.
- https://www.sciencedirect.com/science/article/pii/002191697090142X ; Duration of a lightning flash -A.R.K.Sastry – Journal of Atmospheric and Terrestrial Physics –Volume 32, Issue 11 ,November 1970, Pages 1841-1842, IN1, 1843.
- http://www.kaheel7.com/ar/index.php/2012-12-04-18-32-28/106-2010-02-27-13-32-11 مرور البرق ورجوعه معجزة نبوية
- https://www.youtube.com/watch?v=-3GCvb_7iuc

[56] http://www.public.asu.edu/~gbadams/lightning/lightning.html ; Lightning ; Compiled and Created by Dennis Mollet and James Kistner.
- https://lightning.nsstc.nasa.gov/primer/primer2.html ; A Lightning Primer ; Characteristics of a Storm LIGHTNING.
- https://www.sciencedirect.com/science/article/pii/ 002191697090142X ; Duration of a lightning flash -A.R.K.Sastry - Journal of Atmospheric and Terrestrial Physics - Volume 32, Issue 11 ,November 1970, Pages 1841-1842, IN1, 1843.

# پێشبینییەك لە ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ)

لە فەرموودەیەكی پەیامبەردا (ﷺ) هاتووە: لە غەزای تەبوكدا پێغەمبەر (ﷺ) بەیەكێك لە هاوەڵەكانی فەرمووە: ﴿يُوشِكُ يَا مُعَاذُ إِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ أَنْ تَرَى مَا هَا هُنَا قَدْ مُلِئَ جِنَانًا﴾ (رواه مسلم) واتە: ئەی موعاز ئەگەر خوای گەورە تەمەنی درێژت بداتێ نزیكە كە تۆ ئێرە (واتە ناوچەی تەبوك) ببینێت كە پڕبووە لە باخ وسەوزایی. **بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەكانی لاپەڕە (٤٠٦)**

كە لەوكاتەدا ناوچەی تەبووك زۆر ووشك وبێئاوبووە، بەڵام وەك فەرموودەكە پێشبینی كرد داوای سەدان ساڵ پاش گۆڕانی كەش وهەوای ئەوناوچەیە ئێستا یەكێكە لە سەوزترین ناوچەكانی نیوە دورگەی عەرەب وپڕە لە باخ وبێستان.

ناوچەی تەبوك لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بیابانێكی كەم ئاوبوو، بەڵام بەهۆی گۆڕانكارییەكانی ژینگە، كە ناوچەی تەبوكی بەتایبەتی گرتەوە بەشێوەیەك ڕێژەی بارانبارین لە ناوچەی تەبوكدا زیادی كرد كە بووە گرنگترین سەرچاوەی دەستكەوتنی ئاوی شیرین لە شانشینی عەرەبی سعودیدا.

بەوەش تەبوك لە بیابانەوە گۆڕرا بە یەكیك لە ناوچە كشتوكاڵییەكان بەجۆرێك لە ساڵی (١٤٢٠)ی كۆچیدا، پانتایی زەویی چێنراو نزیكەی (٢٢٨٣٨٤٠ هێكتار) بوو، كە لە ٧٠٪ی ئەو ڕێژەیە دەكەوێتە دەوروبەری شاری تەبوكەوە، ڕێژەی گەنم لە پێش هەمووبەرهەمە چێنراوەكانی تردا دێت.

هەروەها (شركة تبوك للتنمية الزراعية– تادكوا) بە گەورەترین كۆمپانیای كشتوكاڵی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دادەنرێت، وپسپۆڕە لە بەرهەمهێنانی میوە وئالیك ودانەوێڵە وپەتاتە وپیازدا، دەكەوێتە ناوچەی تەبوكەوە، هەروەها لە تەبوكدا كۆمپانیای (ئەسترا) هەیە كە پانتایی زەوییەكەی ٣٥ كم دووجایە وگوڵی سروشتی بەرهەمدەهێنێت، وتەنها بۆ بازاڕەكانی ناوخۆی سعودیە دەنێردرێت.

هەروەها كێڵگەكانی تەبوك ترێ وزەيتوون وچەقاله وقۆخ وقەيسی ومزرەمەنييەكان وسێو بەرهەم دێنن [57].






[57] http://quran-m.com/quran/article/2633/%D8%AC%D9%86%D8%A7%D9%86-%D8%AA%D8%A8%D9%88%D9%83-%D8%A7%D9%84%D8%AA%D9%8A-%D8%AA%D9%86%D8%A8%D8%A3-%D8%A8%D9%87%D8%A7-%D8%A7%D9%84%D9%86%D8%A8%D9%8A-%D8%B5%D9%84%D9%89-%D8%A7%D9%84%D9%84%D9%87-%D8%B9%D9%84%D9%8A%D9%87-%D9%88%D8%B3%D9%84%D9%85

(جنان تبوك التي تنبأ بها النبي صلى الله عليه وسلم - فراس نور الحق).

# بەشی سێیەم
# سوود وەرگرتن لە ئیعجازی زانستی سونەت لەرۆژگاری ئەمڕۆدا بۆ خزمەتی فەرمووده

سوود وەرگرتن لە ئیعجازی زانستی سوننەت لە رۆژگاری ئەمڕۆدا بەشێوەیەکی سـەرەکی بـۆ خزمـەتی دەرخسـتنی راسـتییەکانی فـەرمووده صـەحیحەکان وراستکردنەوەی فەرمووده لاوازەکان گرنگە، لەمڕۆدا دەتوانرێت ئیعجازی ئامـاژە زانستییەکان لەسوننەتدا بـە چـەند شـێوەیەك سـوودی لێوەربگیرێت بـۆ خزمـەتی سوننەت، لەوانە:

١- بەڵگەیەکی سەردەمیانەیە بۆ دەرخستنی راستییەکانی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)، کاتێك بەراوردی ئاماژە زانستییەکانی هەندێك لە فـەرموودەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) دەکەین لەگەڵ راستییە زانستییەکان لە رۆژگـاری ئـەمڕۆدا کـە تـەنها چـەند ساڵێك دەبێت زانایان ئەوراستییانەیان بۆ دەرکەوتووە، بۆمان دەسەلمێت مەحاڵـە ئـەم ووتانـە لـە زانیـاریی مرۆڤـەکانی ئەوکاتـەدا بووبێـت ودەبێـت تـەنها لـە سەرچاوەیەکی سـەروومرۆڤەکانەوە هاتبێت کـە ئاگاداری هەموونهێنییەکانـە کـە پـەروەردگاری دروسـتکەری گـەردوون ونێـرەرەی پەیامبەرەکەیـەتی، لەبەشـی پێشتری ئەم توێژینەوەیەدا چەندین نموونەمان لە سـوننەتدا هێنایـەوە کـە ئامـاژە زانستییەکانیان ١٠٠٪ لەگەڵ راستییە زانستییەکانی سەدەی ٢١دا یەکدەگرێتەوە.

لەلایەکی ترەوە بوونی ئەم ئاماژە ناوازانە لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا لە کتێبەکانی فەرموودەدا هەن ئەوراستییە دەسەلمێنن کە ئەم ووتانەی لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) ووتراون لەسـەروو زانیارییـەکانی مرۆڤـی ئـەو سـەردەمەدا بـووە وسەرچـاوەیەکی خوداییـان هەیـە، کەواتـە موسـوڵمانانی

پێشـین دەسـتپاك ودەمپـاك ومتمانـەپێكراو بـوون لـە گەیانـدنی فـەرموودەكانی پەیامبەرەكەیان.

٢- دەتوانرێت سوود لەم سەلماندنە زانسـتییە وەربگیرێـت وەك بەڵگەیـەك بـۆ راسـتكردنەوە وبـەهێزكردنی هەنـدێك لـەو فەرموودانـەی لاوازییـان هەیـە لـەرووی سەنەدەوە، چونكە دەركەوتنی راستییەكی زانستیی وورد لە هـەر فەرموودەیەكـدا گومانی رێكەوت ناهێڵێت ودەیسەلمێنێت كە ئـەم ووتەیـە سەرچاوەیەكی خـودایی هەیە، لێرەدا ٢نموونە دەهێنینەوە:

**یەكەم**: فەرموودەی: ﴿لا تركب البحر إلا حاجا أومعتمرا أوغازيا في سبيل الله، فإن تحت البحر نـاراً﴾ (رواه أبـوداود) واتـە: سـواری كەشـتی مەبـە لەسـەر دەریـا مەگەر بۆ حەج یـان عـەمرە یـان غـەزا نـەبێت چـونكە لـەژێر دەریـادا ئـاگر هەیـە، فەرموودەیەكی لاوازە وەك زانایان باسیان كردووە:

{قـال الشـيخ الألبـاني رحمـه الله في الإرواء (١٦٩/٤): الحـديث ضـعيف أخرجـه أبوداود وغيره من طريـق بشـر أبـي عبـد الله عـن بشـير ابـن مسـلم عـن عبـد الله بـن عمرومرفوعا، وهذا ضعيف، بشر وبشير كلاهما مجهول وفي إسناده اضطراب، ولـذلك اتفق الائمة على تضعيفه، قال ابن حجر في التلخيص الحبير ج:٢ ص:٢٢١:

حديث روي أنه صلى الله عليه وسلم قال: (لا يركبن أحد البحر إلا غازيا أومعتمرا أوحاجا) رواه أبوداود والبيهقي من حديث عبد الله بن عمرومرفوعا بزيادة فـإن تحـت البحر نارا وتحت النار بحرا، قـال أبـوداود رواتـه مجهولـون، وقـال الخطـابي ضـعفوا إسناده وقال البخاري ليس هذا الحديث بصحيح، ورواه البزار من حديث نافع عن بن عمر مرفوعا وفيه ليث بن أبي سليم وهوضعيف} [58].

[58] http://www.ahlalhdeeth.com/vb/showthread.php?s=&threadid=2567

بەپێی نوێترین دۆزینەوە زانستییەکان دەرکەوتووە کە بنی دەریا وزەریاکان زیاتر لە ٨٠٪ی تەقینەوە بورکانیەکانی زەوی لەخۆگرتووە، کە لە قووڵایی هەزاران پێدان لەبنی دەریادا وتەنها لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا مرۆڤ بە بەکارهێنانی ژێردەریاییە بەهێز وپێشکەوتووەکان توانی بچێتە ئەوقووڵاییانە وبەچاوی خۆی بیانبینێت. **بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی لاپەڕە** (٤٠٧-٤٠٨)

لێرەوە دەرکەوت کە بەشێوەیەکی فیعلی بنی زەریا ودەریاکان داگیرساوە وکوڵاوە، ولەبنکەکانیاندا چەندین درز وکەلێن هەیە کە لێیانەوە ماددەی تواوە وگڕکانیی دەردەپەڕنە دەرەوە، ئەم تۆڕە لە کەلێن ودرزەکان ماوەی هەزاران کیلۆمەتر درێژ دەبنەوە، وبەهۆیەوە ساڵانە ملیۆنان تەن لەو ماددە ئاگرین وتواوانە دێنە دەرەوە بۆ بنی دەریا وزەریاکان، پلەی گەرمی ئەو ماددە تواوانە دەگاتە زیاتر لە ١٠٠٠ پلەی سەدی وکاتێك دەگەنە بنی دەریاکان بەهۆی بەرکەوتنیان لەگەڵ ئاوەکەدا وردە وردە ئاوەکە گەرم دەکەن ولە هەندێك شوێندا دەیانکوڵێنن.

زۆر جاریش ئەم تەقینەوە بورکانییانەی ژێردەریا لەگەڵ ئەو بومەلەرزە بەهێزانەی لەگەڵیاندا ڕوودەدەن کاریگەریی تەواو لەسەر ڕووی زەریا ودەریاکان و ووشکانییەکانی دەوروبەری دروستدەکات لەشێوەی شەپۆلەکانی تسونامی کە کاریگەرییەکی کاولکەری هەیە وەك لەم ساڵانەی دوایی لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا وووڵاتی یابان بەتایبەتی بینیمان [59]. **بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە** (٤٠٩)

ئەمەش ڕاستیی زانیارییەکانی ئەم فەرموودەیە دەسەلمێنێ وبەهیچ شێوەیەك ئەم ووتەیە لەزانیارییەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) تا سەدان ساڵ دواتر

---

- هەروەها: إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل- محمد ناصرالدين الألباني- المكتب الإسلامي- الطبعة الثانية- ١٩٨٥.

[59] https://oceantoday.noaa.gov/deepoceanvolcanoes/

- https://oceantoday.noaa.gov/underwatervolcanoes/

وەرنەگێراوە، بەڵکودەبێت سەرچاوەیەکی خودایی هەبێت، بەمەش فەرموودەکە لەرووی مەتنەوە بەهێز دەبێت.





**بەهۆی بوونی هەزاران بورکانی ئاگرین لەژێر دەریا وزەریاکاندا**
**بنی زەریا ودەریاکان بەفیعلی داگیرساوە وکوڵاوە**

**دووەم**:- لە روایەتێکدا هاتووە: ذكر الرازي في (تأريخ صنعاء): وروى عبد الرزاق أن رسول الله (ﷺ): أمر وبر بن يحنس الأنصاري حين أرسله إلى صنعاء والياً عليها فقال: ادعهم إلى الإيمان، فإن أطاعوا لك به، فاشرع الصلاة، فإذا أطاعوا لك بها فمر ببناء المسجد لهم في بستان باذان، من الصخرة التي في أصل غمدان، واستقبل بها الجبل الذي يقال له:ضِيْن)[٦٠].

واتە: لە کتێبی (مێژووی صەنعا)دا (کە دانەرەکەی: أحمد بن عبدالله بن محمد الرازي)ە، وساڵی ٤٦٠ی کۆچی وەفاتی کردووە، وزۆر لە زانایان وەسفی چاکەیان کردووە) هاتووە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە هاوەڵێکی کرد بەناوی (وەبری ئەنساری) کاتێك وەك کاربەدەست ناردی بۆ شاری صەنعا پێی فەرموو: بانگیان بکە بۆ ئیمان، ئەگەر بەگوێیان کردی پاشان بانگیان بکە بۆ نوێژ وفێریانکە،

[٦٠] تأريخ مدينة صنعاء – أحمد بن عبدالله بن محمد الرازي – تحقيق ودراسة: د.حسين بن عبدالله العمري– دار الفكر المعاصر– الطبعة الثالثة–١٩٨٩.

ئەگەر بەگوێیان کردی فەرمان بکە با مزگەوتێك بۆ خۆیان دروستبکەن لە باخەکەی (بازان) ولە بەردەکەی بناغەی کۆشکی (غمدان)، وپاشان قیبلەکەی رووبکەرە ئەوشاخەی کە ناوی (ضین)ە، ئەم فەرموودەیە لە کتێبەکانی فەرموودەدا نەهاتووە.

له ریوایەتێکی تردا هاتووە: قَالَ وَبَرُ بْنُ يحنس الْخُزَاعِيُّ: قال لي رَسُولُ اللَّه (ﷺ): (إِذَا بَنَيْتَ مَسْجِدَ صَنْعَاءَ، فَاجْعَلْهُ عَنْ يَمِينِ جَبَلٍ، يُقَالُ لَهُ:ضِينَ)، قال الهيثمي في مجمع الزوائد (٢ /١٢): رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي الْأَوْسَطِ وَإِسْنَادُهُ حَسَنٌ، واتە: (وەبری ئەنساری) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) پێیفەرمووم: ئەگەر مزگەوتی (سەنعا)ت دروستکرد ئەوە بیناکەی بخەرە لای راستی شاخێك کە پێیدەووترێت (ضین)[61].

پێغەمبەر (ﷺ) لە هەمووژیانیدا یەمەنی نەدیوە، بەڵام وەك لەم فەرموودەیەدا دیارە زۆر بەووردیی شوێنی دروستکردنی مزگەوتێك بۆ یەکێك لە هاوەڵەکانی دیاری دەکات کە ئێستا مزگەوتی گەورەی سەنعای پێدەڵێن وتائێستاش ماوە.

خەڵکی یەمەن بە پیرۆزترین وچاکترین مزگەوتی وڵاتی یەمەنی دادەنێن چونکە دەڵێن بەفەرمان ورێنموویی راستەوخۆی پێغەمبەر (ﷺ) دروستکراوە، گرنگترین سیفەتی ئەم مزگەوتە راستیی و ووردیی قیبلەکەیەتی کە بەتەواوەتی رووی لە کەعبەیە نەك بەنزیکەیی وەك زوربەی مزگەوتەکانی تری دونیا.

ئەگەر بەئامێرە زانستییەکانی ئەمڕۆ وەك مانگە دەستکردەکان پێوانە بکەین بۆ قیبلەی مزگەوتەکە تا کەعبەی پیرۆز، بەتایبەتی لەرێی بەرنامەی نەخشەوانی ورووپێوی (Google Earth) دەبینین بە هێڵێکی راست دەگاتە ناو کەعبەی پیرۆزەوە کە دووریی نێوان شاری سەنعا ومەککەی پیرۆز نزیکەی ٨١٥کم دەبێت،

---

[61] http://fatwa.islamweb.net/fatwa/index.php?page=showfatwa&Option=FatwaId&Id=179755

که مەحاڵ بووە لە رۆژگاری پێغەمبەردا (ﷺ) کەس ئەم ووردەکارییە بکات، چونکە تەنها دوای سەدەی بیستەم مرۆڤ توانی نەخشەی ووردی سەر رووی زەوی بکێشێت، لێرەوە ووردەکاریی گەورەی ئەو تەوجیهاتە نەبەویەمان بۆ دەردەکەوێت لە دروستکردنی مزگەوتەکەی سەنعادا کە شوێنی مزگەوتەکە ورووەکەی بەشێوەیەك دیارییکرد کە بە تەواوەتی رووی لە کەعبە بێت، ئەمەش بەزانیاریی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) مەحاڵ بووە ئەنجام بدرێت ودەبێت تەنها لە زانیارییەکی سەرووی مرۆڤەکانەوە ئەو تەوجیهە هاتبێت کە پەروەردگاری ئاگاداری هەموونهێنییەکانە [٦٢].

## وێنە روونکەرەوەکان:



گۆڕەپانی مزگەوتەکە لە سەرەوە.



مزگەوتەکەی کە پێغەمبەری خوا (د. خ) فەرمانیدا بە دروستکردنی لەنێوانی دوو منارەکەدا.

---

[62] http://quran-m.com/quran/article/2250/%D8%A7%D9%84%D8%A3%D9%82%D9%85%D8%A7%D8%B1-%D8%A7%D9%84%D8%B5%D9%86%D8%A7%D8%B9%D9%8A%D8%A9-%D8%AA%D8%B4%D9%87%D8%AF-%D8%A8%D9%86%D8%A8%D9%88%D8%A9-%D9%85%D8%AD%D9%85%D8%AF:

الأقمار الصناعية تشهد بنبوة محمد (ﷺ)/ الشيخ عبد المجيد الزنداني.

- https://www.eajaz.org/index.php/component/content/article/84-Twenty-sixth-issue/818 ; الأقمار الصناعية تشهد بصدق الرسول (صلى الله عليه وسلم)
- https://www.youtube.com/watch?v=U7TPH3NoEB0

## سەرەنجام بەم شێوازە دەبێت:

هێڵێکی ڕاست لەڕووگەی مزگەوتەکەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی بەدروستکردنی داوە و بە لوتکەی چیای (ضین) دا تێدەپەڕێت و دەگاتە ناوەڕاستی کەعبەی پیرۆز:



وێنەی مزگەوتی گەورەی (صنعاء) بە پێی ماڵگە دەستکردەکان.



وێنەی چیای (ضین) لە (عمران) بە پێی ماڵگە دەستکردەکان کە لەسەر لوتکەکەی سەربازگەیەکی بچووکی لێیە.



وێنەی زەوی لە بەرنامەی (گوگل ئێرس) دا.



لە بەرزاییەکی زۆرەوە هێڵەکە بەم شێوازە درێژ دەبێتەوە:



٣- یەكێكی تر لە سوودە گەورەكانی ئیعجازی زانستی لە سوونەتدا بریتییە لەلابردنی هەڵە تێگەیشتن لە هەندێك لە فەرموودە صەحیحەكان، كە لەوانەیە بەهۆی فراوانی لێكدانەوەی ماناكان لە زمانی عەرەبیدا، یان وەهم كردنی هەندێك لە گێڕەوەی فەرموودەكان، یان هەڵەكردن لە راڤەی فەرموودەكاندا دروست ببێت، لێرەدا دەتوانرێت راستییە زانستییەكان بەكاربهێنرێن بۆ سەرخستن وتەرجیح كردن لەنێوان گێڕانەوەكانی هەندێك لەوفەرموودانەی گێڕانەوەی جیاوازیان هەیە (الترجيح بين الروايات) [٦٣]، كە لەوانەیە ئەگەر بەجیاوازی ودوور لەیەك ببێتەهۆی تێگەیشتنێكی هەڵە ودژبەیەك بۆ هەندێك لە فەرموودە صەحیحەكانی پێغەمبەر (ﷺ)، وەك:

## ئایا كۆبوونەوەی دروستبوونی كۆرپەلە (إجتماع الخلق) لە ٤٠ رۆژ یان ١٢٠ رۆژدا دەبێت؟

لە فەرموودەیەكی صەحیحدا هاتووە: لە (حذيفة بن أسيد)ەوە: ﴿إذا مر بالنطفة ثنتان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكاً فصورها وخلق سمعها وبصرها وجلدها ولحمها وعظامها...﴾ (رواه مسلم:٢٦٤٥) كە بەئاشكرا دەفەرموێت دروستبوونی ئێسك لە كۆرپەلەدا (كە لەدوای قۆناغەكانی نطفة وعلقة ومضغة) لە هەفتەی شەشەمەوە (٤٢ رۆژ) دەستپێدەكات كە ئەم راستییەش كۆرپەلەزانی نوێ سەلماندوویەتی وئیعجازێكی زانستی ئاشكرایە لەم فەرموودەیەدا [٦٤].

---

[63] http://www.jameataleman.org/main/articles.aspx?article_no=1196: أهمية الإعجاز بين المسلمين: رفع الإشكال في الأحاديث المشكلة والفهوم المشكلة.

[64] THE DEVELOPING HUMAN - CLINICALLY ORIENTED EMBRYOLOGY - Keith L. Moore, T.V.N. Persaud, Mark G. Torchia, Elsevier, TENTH EDITION - INTERNATIONAL EDITION - 2016- Pages:52-58.

- Langmann's Medical Embryology - T.W.Sadler - Lippincott Williams & Wilkins - 10th Edition – 2006 - Pages:55-63

كەواتە بەپێی ئەم فەرموودە صەحیحە هەر ٣ قۆناغی (نطفة وعلقة ومضغة) تەنها ٤٠ رۆژ دەخایەنن، بەڵام فەرموودەیەکی صەحیحی ترمان هەیە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذلك ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذلك ثُمَّ يَبْعَثُ اللهُ مَلَكًا ...﴾ (رواه البخاري:٣٢٠٨) کە لێرەدا هەر یەکێك لە ٣ قۆناغەکانی (نطفة وعلقة ومضغة) ماوەی ٤٠ رۆژی بۆ دیاریکردووە کە کۆیان دەکاتە ١٢٠رۆژ، ئەمەش پێچەوانەی فەرموودەکەی پێشتر وزانستی نوێیە، زۆرێك لە زانایانی پێشین ئەم بۆچوونەیان لەم فەرموودەیەوە بۆ دروستبووە، وەك: ئیمامی نەوەوی لە (شرح صحيح مسلم) [٦٥]، و(ابن حجر العسقلاني) لە (فتح الباري) [٦٦]، وقورتوبی لە تەفسیرەکەیدا [٦٧]، و(إبن القيم الجوزية) [٦٨] وهەندێکی تریش، لەگەڵ ئەم رایە باوەدا هەندێك زانای تر هەبوون کە وتوویانی کۆبوونەوەی دروستبوونەکە لە ٤٠ رۆژی یەکەمدا دەبێت، وەك: (كمال الدين محمد بن علي الأنصاري المعروف بإبن الزملكاني) [٦٩]، (ابن حجر) لە (فتح الباري)دا دەڵێت: هەندێك لە راڤەکارانی دوایین بەلای ئەوەدا دەچن کە مانای فەرموودەکەی (حوزەیفە) راسترە کە دروستبوون لە ٤٠رۆژدا تەواو دەبێت، لەوانە: (ابن الزملكاني) لە (ابن الحاجب)ەوە ئەوەمان بۆ نەقڵ دەکات کە عەرەب کاتێك

---

[٦٥] بروانە: صحيح مسلم بشرح الإمام النووي– تحقيق: خليل مأمون شيحا – دار المعرفة– الطبعة الثانية عشرة – ٢٠٠٦.

[٦٦] فتح الباري شرح صحيح البخاري– أحمد بن علي ابن حجر العسقلاني– مكتبة دار السلام– الطبعة الثالثة – ٢٠٠٠ – ٦/٦٧٢.

[٦٧] تفسير القرطبي (الجامع لأحكام القرآن) – محمد بن أحمد الأنصاري القرطبي– تحقيق: عبدالرزاق المهدي– دار الكتاب العربي– الطبعة الأولى – ٢٠٠٥:١٢/ ٧.

[٦٨] التبيان في أقسام القرآن – محمد بن أبي بكر ابن قيم الجوزية – دراسة وتحقيق: محمد حامد الفقي– دار المعرفة – بيروت، لبنان:٢/ ٣٤٠ .

[٦٩] البرهان الكاشف عن إعجاز القرآن – كمال الدين محمد بن علي الأنصاري المعروف بإبن الزملكاني– تحقيق:خديجة الحديثي – مطبة العاني– بغداد/١٩٧٤ :ص:٢٧٥.

دەیانەوێت تەعبیر لە ڕووداوێك بکەن کە دوای ئەوچەندین ڕووداوی تر هەن بەڵام پەیوەندییان بەڕووداوی یەکەمەوە هەیە وایان پێباشترە یەکەم پێش بخەن کە هەموویانی لەخۆگرتووە لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێکیان پێشی کەوتوون لە ڕووداندا، چونکە مەبەست لێرەدا تەرتیبی دروستبوونە [٧٠].

هەروەها چەندین زانای هاوچەرخیش هەن کە هەمان ئەم بۆچوونەیان هەیە لەوانە: عبدالمجيد الزندانی ود.عبدالعزيز المصلح، بەڵام کاتێك هەموو ڕیوایەتەکانی ئەم فەرموودەیە کۆدەکەینەوە ئەم دژبەیەکییە نامێنێت، چونکە لە ڕیوایەتی ئیمامی موسلیم بۆ هەمان فەرموودەدا هاتووە: عن عبد اللّٰه بن مسعود قال حدثنا رسول اللّٰه صلى الله عليه وسلم وهو الصّادق المصدوق: ﴿إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذلك عَلَقَةً مِثْلَ ذلك، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذلك مُضْغَةً مِثْلَ ذلك، ثُمَّ يُرْسَلُ الْمَلَكُ فَيَنْفُخُ فيه الرُّوحَ ...﴾ (رواه مسلم:٢٦٤٣)، کە لێرەدا وشەی (في ذلك) هاتووە لەپێش زاراوەکانی (علقة ومضغة) واتە: لەهەمان ٤٠ ڕۆژەکەدا سەرەتا (نطفة) دەبێت ودوایی دەبێت بە (علقة) وپاشان بە (مضغة)، کە ئەمەش زانستی نوێ ١٠٠٪ پشتگیریی لێدەکات، لێرەوە بە بەکارهێنانی ڕاستییە زانستییەکان ڕیوایەتی ڕاست وتەواوی فەرموودەکە دەرکەوت.




---

[٧٠] فتح الباري شرح صحيح البخاري- أحمد بن علي ابن حجر العسقلاني- مكتبة دار السلام- الطبعة الثالثة - ٢٠٠٠.

## ئایا ( ڕەشکە ) چارەسەری تێدایە بۆ هەموونەخۆشییەك؟

لێرەشدا نموونەیەك دەخەینەڕوو لە هەڵە ڕاڤەکردنی فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەربارەی ڕەشکە دواوە و وەك چارەسەرێك دیاریکردووە:

عن أبي هريرة (رض) أنه سمع رسول الله (ﷺ) يقول: «إن في الحبة السوداء شفاء من كل داء إلا السام» (رواه البخاري: ٥٣٦٣-٥٣٦٤، ومسلم: ٢٢١٥) والسام: الموت.

هەروەها هاتووە: «ما من داء إلا في الحبة السوداء منه شفاء، إلا السام» (رواه مسلم:١٧٣٥)، هەروەها هاتووە: «عليكم بهذه الحبة السوداء، فإن فيها شفاء من كل داء إلا السام» (رواه الترمذي:٢٠٤١، وصححه الألباني).

ئەم فەرموودەیە دەربارەی ڕەشکە لە زوربەی کتێبەکانی فەرموودەی وەك (البخاري ومسلم ومسند أحمد والترمذي وابن ماجة والنسائي)دا هاتووە بەزیاتر لە ٢٥ ڕیوایەتی جۆراوجۆر کە لەلایەن چەندین صەحابەوە گێڕدراوەتەوە، کە گومان لەگرنگی ئەم ئامۆژگارییەی پێغەمبەر (ﷺ) ناهێڵێتەوە، ولە چەندین بۆنەدا ئامۆژگاری موسوڵمانانی پێکردووە.

زانایانی ڕاڤەی فەرموودە بوون بە ٢ بەشەوە دەربارەی فەرموودەکان: ئایا ڕەشکە وەك لە فەرموودەکاندا هاتووە چارەسەری تێدایە بۆ هەموو نەخۆشییەك بەرەهایی؟ یان تایبەتە بە هەندێك نەخۆشی؟

هەندێکیان وتوویانە ئەم گشتییە مەبەست پێی تایبەتە (عام یراد بە الخصوص)، واتە: بۆ هەندێك نەخۆشی یان لەهەندێك باردا یان بەشێوازێکی تایبەتی سوودی هەیە، لەو زانایانە: (ابن حجر وأبوبكر بن العربي والمناوي) [٧١].

---

[٧١] بڕوانە: فتح الباري شرح صحيح البخاري- أحمد بن علي ابن حجر العسقلاني- مكتبة دار السلام- الطبعة الثالثة- ٢٠٠٠- ٦/٦٧٢، هەروەها: تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي- محمد بن عبد الرحيم المباركفوري- صححه: عبدالرحمن محمد عثمان - دار الفكر- بيروت: ٦/ ١٦٢.

هەندێك زانای تریش دەربارەی فەرموودەكان وتوویانە رەشكە بەرەهایی چارەسەری تێدایە بۆ هەموونەخۆشییەك، لەوانە:(أبومحمد بن أبي جمرة) [٧٢].



لە رۆژگاری ئەمڕۆدا سەدان توێژینەوەی زانستی بەتایبەتی لەسەر رەشكە ئەنجامدراون (ناوە زانستییەكەی: Nigella Sativa)، بەتەواوەتی دەركەوتووە كە بۆ زۆربەی نەخۆشییەكان چارەسەر وسوودی تێدایە [٧٣].

تەنانەت چەندین سایتی تایبەت بە رەشكە لە تۆڕی ئینتەرنێت هەیە كە باسی سوودە زۆرەكانی رەشكە دەكەن [٧٤]، ئەگەر باسی توێژینەوە زانستییە باوەڕپێكراوەكان (محكم) بكەین، زیاد لە ١٠٠٠ توێژینەوەی جۆراوجۆر دەبینین كە لە هەموو لایەكی جیهان ئەنجامدراون [٧٥]، لەلایەن هەزاران پزیشك وتوێژەری زانستییەوە، كە دەریانخستووە رەشكە سوود وشیفای تێدایە بۆ زۆربەی هەرە زۆری كێشە تەندروستییەكانی مرۆڤ، لەوانە: دژە شێرپەنجە، دژە میكرۆب وكەڕوو ودژە هەوكردن، دژە ئۆكسان، دژە ژەهراوی بوون وپاككەرەوەی جگەر، پارێزەر

---

[٧٢] هو الشيخ الإمام: محمد بن أحمد بن عبد الملك الأموي القرشي المالكي، فقيه ومحدث، تولى القضاء وصنف التصانيف، وكان أسند من بقي بالأندلس، أبومحمد بن أبي جمره المغربي المالكي، توفى بالديار المصرية في: ٥٩٩هـ. ينظر: تاريخ الإسلام للذهبي: ٥٢/ ٢٨٥، ومعجم المؤلفين: ٣/ ٧٠.

[٧٣] الشفاء بالحبة السوداء بين الإعجاز النبوي والطب الحديث– الدكتور حسان شمسي باشا – الطبعة السادسة/ ١٩٩٩.

- https://www.eajaz.org/index.php/component/content/article/72-Fourteenth-number/712-Black-bean :

الحبة السوداء ...شفاء من كل داء ...د.عبدالجواد الصاوي

[74] https://www.nigella-sativa.com/

[75] https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/?term=nigella+sativa

بۆ دڵ ومێشك وگورچیله وپێست وغودەی دەرەقی، خاوکەرەوەی بۆرییەکانی خوێن وماسولکە، چالاککەری کاری مێشك ویادەوەری وڕێگر لە خەڵەفاوی، بۆ نەخۆشییەکانی ژنان ودووگیانی [٧٦] ....

لە هەمووی گرنگتر ئەو دەیان توێژینەوە زانستییانەن کە ئەنجامدراون لەسەر کاریگەریی ورۆڵی ڕەشکە لە بەهێزکردنی سیستمی بەرگری لەش [٧٧]، کە دیارە

---

[76] Aftab Ahmad ,Asif Husain, Mohd Mujeeb ,Shah Alam Khan Abul Kalam Najmi Nasir Ali Siddique Zoheir A. Damanhouri and Firoz Anwar ,A review on therapeutic potential of *Nigella sativa*:A miracle herb, Asian Pac J Trop Biomed .2013 May; 3(5):337–352. https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pmc/articles/PMC3642442/
-Huda Kaatabi ,Abdullah Omar Bamosa ,Ahmed Badar , Abdulmohsen Al-Elq ,Bodour Abou-Hozaifa ,Fatma Lebda ,Akram Al-Khadra and Sameeh Al-Almaie ,Nigella sativa Improves Glycemic Control and Ameliorates Oxidative Stress in Patients with Type 2 Diabetes Mellitus:Placebo Controlled Participant Blinded Clinical Trial, PLoS One .2015 ;10(2):e0113486.
:https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pmc/articles/PMC4338020/
-https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/28603137
-https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/27364039
-https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/22083982

[77] https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/?term=nigella+sativa +immunity.
- Majdalawieh AF ,Fayyad MW ,Immunomodulatory and anti-inflammatory action of Nigella sativa and thymoquinone:A comprehensive review, Int Immunopharmacol. 2015 Sep;28(1(:295-304. doi:10.1016/j.intimp.2015.06.023. Epub 2015 Jun 26. : https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/26117430
- Sultan MT ,Butt MS ,Karim R ,Ahmad N ,Ahmad RS ,Ahmad W , Nigella sativa fixed and essential oil improves antioxidant status through modulation of antioxidant enzymes and immunity, Pak J Pharm Sci. 2015 Mar;28(2):589-95. : https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/25730812
- Gholamnezhad Z ,Rafatpanah H ,Sadeghnia HR ,Boskabady MH , Immunomodulatory and cytotoxic effects of Nigella sativa and

سیستمی بەرگری رۆڵی بەرگریکرنە لە لەشی مرۆڤ لەدژی نەخۆشییەکان وکارتێکەرە جۆراوجۆرەکان وپاراستنی لەشساغی مرۆڤ، کەواتە دەتوانین بڵێین رەشکە لەرێی بەهێزکردنی بەرگری لەشەوە رۆڵی هەیە لە خۆپارێزیی وچارەسەری هەموو نەخۆشیەکانی مرۆڤ، ئەمەش ١٠٠٪ یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ئاماژەی فەرموودەکە وئیعجازێکی زانستی ئاشکرایە، بەمجۆرە راڤەی دروستی فەرموودەکەمان بۆ دەرکەوت کە رەشکە بەرەهایی چارەسەری تێدایە بۆ هەموو نەخۆشییەکانی مرۆڤ تەنها مردن نەبێت.




ئەوەی مایەی تێبینی کردنیشە ووشەی چارەسەر (شفاء) لە فەرموودەکەدا بە نەکیرە واتە نەناسراو هاتووە، کە لە زمانی عەرەبیدا مانای گشتگیریی (عموم) دەگەیەنێت وزانستی ئەمرۆش سەلماندوویەتی سوودەکانی رەشکە گشتگیرن، لەلایەکی تریشەوە خاسیەتە پارێزەر وچارەسەرییەکانی رەشکە لە هیچ ماددە وپێکهاتەیەکی تری سروشتیدا نابینرێت و وێنەی نییە، بۆیە ئاوا بەتایبەتی لە فەرموودەکاندا باسکراوە.

---

thymoquinone on rat splenocytes, Food Chem Toxicol. 2015 Dec;86:72-80. doi:10.1016/j.fct.2015.08.028. Epub 2015 Sep 3. : https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/26342766

٤- لـەمڕۆدا ناحـەزانی ئیسـلام هەوڵـدەدەن لـەرێی گومـان خسـتنەناو فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) تانە لە ئاینەکەمان بدەن وهەوڵدەدەن یەکێك لە پایەکانی ئیسلام کە سوننەتە لەلای موسوڵمانان گومانـاویی بکەن بۆ ئەوەی دووریان بخەنەوە لە پەیڕەویی کردنی، کە گوایە فەرموودەکان یەکناگرنەوە لەگەڵ راستییە زانستییەکاندا، هەندێك موسوڵمانی ساویلکەش شوێن ئەم گومانـە کەوتوون وبەنەزانیی داوا دەکەن پەیڕەویی کردن لـە سوننەت وەلا بنرێت وتـەنیا قورئان سەرچاوە بێت بۆ عیبادات وموعامەلات!!

ئەم بانگەشەیە تەنانەت سوکایەتی کردنـە بـەقورئانی پیرۆزیش کـە بەئاشـکرا داوامـان لێدەکات شوێن پێغەمبـەر (ﷺ) وسـوننەتەکانی بکـەوین، لێرەدا ئێمـە دەتوانین لەرێی بەکارهێنانی دۆزینەوە زانستییەکان وتوێژینـەوە زانستییەکانەوە گومان بڕەوێنینەوە لەسەر هەندێك لەو فـەرموودە راسـتانەی ئاماژەی زانستییان لەخۆگرتووە.

نموونەیەك دەهێنینەوە کە بریتییە لە:

## فەرموودەی کەوتنی مێش بۆ ناو دەفری خواردنەوەکان:

ئەم فەرموودەیە بە چەندین ریوایەتی صەحیح هـاتووە لەوانـە: ﴿إذا وَقَـعَ الـذُّبَابُ في شَرَابِ أَحَـدِكُمْ فَلْيَغْمِسْـهُ ثُـمَّ لِيَنْزِعْـهُ فـإن في إِحْـدَى جَنَاحَيْـهِ دَاءً وَالْـأُخْرَى شِـفَاءً﴾ (رواه البخـاري:٣٠٧١)، فەرموودەکـە لـەرێی ٣ هـاوەڵی پێغەمبـەرەوە (ﷺ) کـە (أبـوهريرة وأبوسعيد الخدري وأنس)ن گێڕدراوەتەوە.

هـەروەها زانایـانی فـەرموودە (أحمـد وأبـوداود والنسـائي وابـن حبـان وابـن ماجـة) گێڕاویانەتـەوە، کـە گومـان لەراسـتیی سـەنەدی ئـەم فەرموودەیـەدا نییـە بـەڵکو ئـەم فەرموودەیە لە بەرزترین ئاستی فەرموودەی صەحیحدایە، بەڵام هەندێك کەس دەیکەنـە رەخنەیەك لەسەر سوننەت کە مێش مێروویـەکی پیسـە وچۆن دەبێت دەرد ودەرمـانی تێدا کۆببێتەوە.

سەرەتا بابزانین فەرموودەکە باسی پاکێتی مێش ونەبوونی پیسیی ناکات، بەڵکو دووپاتی دەکاتەوە کە باڵێکی نەخۆشیی وپیسیی هەڵگرتووە بەڵام باڵەکەی تری چارەسەری ئەو پیسیی ونەخۆشییەی تێدایە بۆیە دەبێت نوقم بکرێت لە دەفری خواردنەوەکان بۆ ئەوەی چارەسەرەکەی کە هەر خۆی هەڵیگرتووە بگات بەنەخۆشیی وپیسییەکەی سەر لەشی، پاشان فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) خۆیان بەڵگەن وپێویست ناکات بۆ بەڵگەی تر بگەڕێین بۆ پشتراست کردنەوەیان، ئێمە تەنها بۆ بەهێزکردنی دڵە لاوازەکان ئەم بەڵگانە دێنینەوە [٧٨].

هەندێکی تر دەڵێن کارپێکردنی ئەم فەرموودەیە گرنگ نییە چونکە نە لە بواری بیروباوەڕ یان عیبادەتدا باسنەکراوە، ئەم قسەیە مەبەست پێی بەکەم زانینی سوننەت وکارپێنەکردنێتی، موسوڵمانی مولتەزیم هەمیشە هەوڵدەدات کار بەسوننەت بکات وبڵاوی بکاتەوە، ئیسلامیش دینێکی کامڵە بە عەقائید وعیبادات وموعامەلات ورەووشتەکانییەوە ونابێت هیچ جوزئیاتێکی بەکەم تەماشا بکرێت، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّمُبِينٌ﴾ (البقرة:٢٠٨)، ئیمامی (ابن كثير) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: پەروەردگار لێرەدا فەرمان بە بەندە ئیماندارەکانی دەکات لەوانەی باوەڕیان بەپێغەمبەر (ﷺ) هێناوە کە هەموو لایەنەکانی ئیسلام وشەریعەتەکەی وەرگرن وکاری پێبکەن ودوورکەونەوە لە نەهیەکانی تا ئەوپەڕی توانایان [٧٩].

ئەم فەرمانەی پێغەمبەر (ﷺ) حوکمێکی شەرعی وئامۆژگاریشی تێدایە بۆ موسوڵمانان، کە روونی دەکاتەوە ئەگەر مێش کەوتەناو دەفری خواردنەوەکانتان ونەتانتوانی رێگری لێبکەن و ویستتان ئەو خواردنەوەیە سوود لێببینن، ئەوا دروستە نەیرێژن وبەکاری بهێنن دوای ئەوەی مێشەکەی تێدا نوقم دەکەن.

---

[78] http://www.jameatalcman.org/main/articles.aspx?article_no=1198
أهمية الإعجاز بين المسلمين: المطلب الثالث: دمغ الشبهات

[٧٩] تفسير القرآن العظيم– الإمام ابن كثير– تحقيق: أ.د. حكمت بن بشير بن ياسين – دار ابن الجوزي– الطبعة الأولى– ٢٠١١: ١/ ٢٤٨.

ئەم فەرمانە ئامۆژگارییەكە بۆ موسولّمانان وهیچ زانایەك نەیفەرمووە كە واجیبە جێبەجێی بكەین، بەڵكو ئەگەر دڵت نەچووە سەری مەیكە ودەفرەكە برێژە وتاوانباریش نابیت.

ئەم فەرموودەیە بەكەس نالێت مێش ڕاوكە وبیخەناو دەفری خواردنەوەكەت! هەرگیز هانی ئەوە نادات دەفرەكان بە سەربەتاڵی بەجێبهێڵرێن چونكە لە فەرموودەی تردا فەرمان دەكات بەداپۆشینیان، هانی كەس نادات لە كەمتەرخەمی كردن لە پاكوخاوێنی ماڵەكان وشەقامەكان، بەهیچ شێوەیەك ڕێگری نەكردووە لە پزیشكان وتەندروستكاران كە قەلاچۆی مێش بكەن.

بەخەیاڵی كەسیشدا نەیەت كە ئەم فەرموودەیە هانی دروستكردنی كێڵگەی بەخێوكردنی مێش دەدات؟!! بەلاّم ئەگەر تێبینی كۆتایی فەرموودەكە بكەین: (فإن في إِحْـدَى جَنَاحَيْـهِ دَاءً وَالْـأُخْرَى شِـفَاءً) دەبیـنین پێغەمبەر (ﷺ) هانمـان دەدات بـۆ لێكۆڵینەوە لە مێش بۆ زانینی ئەو دەرد ودەرمانەی هەڵیگرتوون لەسەر باڵەكانی ولەشی.[٨٠]

بەڵێ راستە زانستی نوێ پیسیی وزیانەكانی مێشی دەرخستووە، بەلاّم بەهیچ شێوەیەك بوونی چارەسەری لە لەشی مێشدا ڕەتنەكردۆتەوە، ولەزۆر دۆزینەوە وتوێژینەوەی زانستیشدا بوونی دژبەیەكەكان لە لەشی زیندەوەرەكاندا سەلمێنراوە، بەڵگە نەویستیشە كە دەبێت لەشی مێش چارەسەر ودژی ئەو میكرۆب وپیسیانەی تێدابێت كە هەڵیاندەگرێت لەسەر لەش وباڵەكانی، چونكە ئەگەر وانەبێت ئەو میكرۆبانە خۆشی لەناودەبەن ونەیدەتوانی ئەو پیسی ومیكرۆبانە بگوێزێتەوە.

لەلایەكی ترەوە لە چەندین توێژینەوەی زانستیی نوێدا بوونی چارەسەر لە لەشی مێشدا دەركەوتووە، یەكێك لەو توێژینەوانە چەند توێژەرێكی موسوڵمان بە سەرپەرشتی (د.مصطفی ابراهیم حسن) پرۆفیسیۆری مێروناسی پزیشكی وسەرۆكی بەشی توێژینەوەكانی مێرووە گوێزەرەوەكانی نەخۆشی لە كۆلیجی زانست لە زانكۆی ئەزهەر لە میصر ئەنجامیاندا.

---

[٨٠] الاصابة في صحة حديث الذبابة – د.خليل إبراهيم ملا خاطر– الطبعة الأولى– ١٩٨٥.

تێیدا ٤ جۆر مێشیان هەڵبژارد بەژمارەی ٢٠دانە بۆ هەر جۆرێك، وهەستان بە توێژینەوە لەسەر باڵەکانیان بەجیا بۆ دیاریکردنی جۆری ئەو میکرۆبانەی لەسەر باڵەکانی ئەم مێشانە دەژین، سەرەنجام ٩جۆر بەکتریای جیاوازیان عەزل کرد لەگەڵ ٢جۆری کەڕوو لەوانە:

(Pseudomonas aeruginosa, Salmonella, S. aureus, B. subtilis)

کە ئەمانە بەکتریای نەخۆشیکەری بەهێزن بۆ مرۆڤ، وبینیان میکرۆبەکان بەگشتی کاری یەکتر خاودەکەنەوە ویەکتر لەناودەبەن، ولەناو هەموویاندا جۆرێکیان بەناوی (Bacillus circulans) لە هەموویان بەهێزتر بوو بۆ لەناوبردنی جۆرەکانی تر کە نەخۆشی دروستدەکەن، لە کاتێکدا ئەم میکرۆبە لە کەسی ئاساییدا نەخۆشی دروستناکات بەڵکوسوودیشی هەیە [81].

هەروەها بینیان ڕێژەی ئەم میکرۆبە بەهێزە تەنیا لەسەر یەك باڵی مێشەکان زۆرە کە بتوانێت ئەوانەی تر کە لەسەر باڵەکەی ترن لەناوبەرێت!

٢ جۆریش کەڕوویان جیاکردەوە کە دەتوانن ماددەی دژە میکرۆب برێژن ومیکرۆبەکانی تر لەناودەبەن.

کە دەگەڕێینەوە بۆ فەرموودەکە: (إذا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي شَرَابِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ ثُمَّ لِيَنْزِعْهُ فإن فِي إِحْدَى جَنَاحَيْهِ دَاءً وَالأُخْرَى شِفَاءً) لێرەدا پیتی (فاء)ی بەکارهێناوە لە (فَلْيَغْمِسْهُ) کە مانای خێرایی دەگەیەنێت لە نوقم کردنیدا، ودواتر (ثُمَّ)ی بەکارهێناوە کە مانای هێواشی دەگەیەنێت لە دەرهێنانیدا لە شلەمەنییەکە، کە ئەمە بوار دەدات بە بەکتریا وکەڕووە بەسوودەکان بۆ ئەوەی دژە ماددەکانیان برێژنە ناو شلەکە وبەکتریا زیانبەخشەکان لەناو ببەن، هەروەها ئەوەیان سەلماند کە ئەو دژە میکرۆبانە تەنانەت

---

[81] https://www.canada.ca/en/health-canada/services/chemical-substances/fact-sheets/chemicals-glance/bacillus-circulans.html
- Yin H ,Pijning T ,Meng X ,Dijkhuizen L ,van Leeuwen SS , Engineering of the Bacillus circulans β-Galactosidase Product Specificity, Biochemistry. 2017 Feb 7; 56(5(:704-711. doi:10.1021/acs.biochem.7b00032. Epub 2017 Jan 25. : https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/28092444

ئەگەر شلەکەش بخورێتەوە بەچالاکی دەمێننەوە لەگەدەدا چونکە بەرگەی گەرمی زۆر وترشێتی دەگرن.

گەورەیی فەرموودەکە لە فەرمان بەنوقم کردنی مێشەکە لە میکانیکییەتی دەردانی دژە ماددە چالاکەکاندا (واتە چارەسەرەکە) دەردەکەوێت، کە ئەمە روونادات ئەگەر ناوەندێك نەبێت بۆ بەیەکگەشتنی دەرد ودەرمانەکە بەبێ بەربەست، هەروەها بینیان کە ماددە دژە میکرۆبەکەی لە کەڕووەکانەوە دەردەدرێت تەنها دوای مژینی شلەمەنی ناو دەفرەکەوە دەبێت بۆ ناو کەڕووەکە کە دەبێتەهۆی ئاوسانیان وپاشان تەقینیان وەك بۆمبێك کە دژەمیکرۆبەکە بۆ ماوەی ٢ملم لەناو دەفرەکەدا فڕێدەدات، ئەمەش ماوەیەکی زۆرە لەچاو قەبارەی هەرە بچووکی میکرۆبەکاندا [٨٢].

هەروەها لە چەند توێژینەوەیەکی تاقیگەیی کە لەلایەن: (أ.د.نبیە عبدالرحمن باعشن) وهاوکارەکانی لەبەشی بایۆلۆجی کۆلێجی زانستی زانکۆی شاعبدالعزیز لە

---

[٨٢] المجلة الأكاديمية للإعجاز العلمي، ١٤٣٧هـ، عدد ١، رقم ٢، ص ٢٣ :

ISSN:2356-9824 & doi:10.19138/ejaz.37.2

- www.academya.net/ejaz/paper/ejaz.37.2.pdf :
الداء والدواء في جناحي الذباب – المجلة الأكاديمية للإعجاز العلمي

- https://faculty.psau.edu.sa/.../doc-6-ppt-bd11d7018e63948d8b6b 0e .. PPT الداء والدواء في جناحي الذباب

- https://www.eajaz.org/index.php/component/content/article/85-Number-xxvii/786-Disease-and-medication-in-the-two-wings-of-the-flies –Ahmad, M.; Hassan, M. and Zayed, A. (1995):Microbial flora associated with some species of biting and non–biting flies (Diptera). J. Fac. Edu., 20 :477–489.91- Ghanem, E.H.; Hassan, M.I.; Gazal, S.A.; El–Sehrawi, M.H. and Ali, O.A. (1986):Studies on bacterial flora associated with three species of blood sucking flies (Diptera). Egyptian Society of Applied Microbiology, Proc. VI. Conf. Microbiol. Cairo, Vol. 1, part (3). Taxonomy Paper No. 22.

- http://www.kaheel7.com/ar/index.php/2010-02-02-22-31-09/497-2012-09-27-17-47-56 الذباب فيه شفاء: معجزة نبوية

سعودیە ئەنجامدرا بەناونیشانی (تأثير الغمس والسقوط للذبابة المنزلية على مدى تلوث الماء والأغذية بالميكروبات) کە تێیدا کاریگەریی کەوتنەناو وپاشان نوقم کردنی مێش لەنا وشلەیەکدا لێکدرایەوە ودەرکەوت کە ژمارە وچڕیی میکرۆبەکان لەو شلەیەی کە مێشەکەی تێدا نوقمکرا زۆر کەمترە لەوەی مێشەکە تەنها کەوتبوە ناوی بەبێ نوقم کردن.

ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە چاوەڕوان دەکرێت، چونکە نوقمکردن دەبێتە هۆی لێکردنەوەی زیاتری میکرۆبەکان لە لەشی مێشەکەوە، ئەمە تەنها بەوە لێکدەدرێتەوە کە لەهەمان کاتدا لە لەشی مێشەکەوە ماددەیەکی دژە میکرۆب رژاوەتە ناو دەفری شلەمەنیەکەوە، کە توێژینەوەکەی پێشتری (د.مصطفى ابراهيم) روونیکردەوە [٨٣].

لە شوێنە جیاوازەکانی دونیادا توێژینەوە دەکرێت لەسەر مێش وخاسییەتە چارەسەرییەکانی، لە توێژینەوەیەك لە ئوسترالیا باسی دۆزینەوەی دەرمانی دژە میکرۆب دەکەن لە شوێنێك کە بەخەیاڵی کەسدا نایەت ئەویش لەشی مێشە [٨٤]، ئەمانە چەند نموونەیەکی کەمن لە توێژینەوەی زانستی لەسەر فەرموودەکەی سەرەوە، کە دەتوانرێت توێژینەوەی وردتر وفراوانتری لەسەر بکرێت بەتایبەتی لەلایەن توێژەرانی موسوڵمانەوە بۆ ئەوەی ئەم راستییە گەورەیەی سوننەت زیاتر بدرەوشێتەوە [٨٥].

---

[٨٣] هەمان سەرچاوەکانی پێشوو+

- http://bayanelislam.net/Suspicion.aspx?id=04-04-013#_ednref17:

نفي الإعجاز العلمي في حديث الذبابة

[84] Danny Kingsley , The new buzz on antibiotics, www.abc.net.au, 1 October 2002 :

http://www.abc.net.au/science/articles/2002/10/01/689400.htm

-http://www.vidyya.com/vol7/v7i23_4.htm: Protein in fly saliva speeds healing of incisions, wounds

[85] http://www.pravdareport.com/science/tech/20-01-2006/9535-fly-0/ :The fly effect:Russian scientists invent new medicine with the help of flies, St. Petersburg State University, 2006

# بەشی چوارەم
# ئەنجامگیریی وراسپاردەکان

**ئە نجامگیریی:**

١- ئیعجـازی قورئـان وسـوننەت بابـەتێکی گرنگـە وبەدرێـژایی مێـژووی موسـوڵمانان زانایانمـان گرنگـی تـەواویان پێـداوە وبنـەمادۆزییان بـۆ کـردووە وچەندین نووسینیان پێشکەش کردووە بۆ دەرخستنی گەورەیی ئەم بابەتە، بەڵام پێویستە پێناسەیەکی نوێ بکرێت کە ببێتەهۆی گرتنەخۆی هەموو لایەنەکانی ئیعجاز لە قورئان وسوننەتدا.

٢- ئیعجازی زانستی لە قورئان وسوننەتدا بەڵگەی سەردەمە بۆ دەرخستنی راستیی وسەرچاوەی خودایی پەیامی پیرۆزی ئیسلام، ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا بەتایبەتی ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) جۆرێکە لە وەحی خودایی لەو سۆنگەیەوە کە پەیامبەر (ﷺ) کەسێکی پارێزراو بووە لە هەڵە وبەردەوام بەچاودێریی خودایی پشتگیریی کراوە، بۆیە لـە زانیـاریی خوداییـەوە قسـەی کـردووە ورێنمـایی هاوەڵـەکانی وهـەموو موسوڵمانانی کردووە، دەرکەوتنی ئەو راستییە زانستییانە لە سوننەتدا لە رۆژگـاری ئەمڕۆمانـدا موعجیزەیـەکی گەورەیـە بـۆ پەیامبەرەکـەمان وفەرموودەکانی، پێمان دەڵێت بەشێوەیەك کە گومانی تێدا نامێنێت ئەی مرۆڤ رێز لەژیریی خۆت بگرە وشوێن پێغەمبەر ونێردراوی خودا وپەیامەکەی بکەوە کە دەستەبەری سەربەرزی دونیا وپاشەڕۆژتان بۆ دەکات.

٣- ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا بابەتی گەورەیی وگرنگی سوننەتمان زیاتر بۆ دەردەخات وەك سەرچاوەی دووەمی ئیسلام، لە هەمان کاتدا

وەلامێکی لۆژیکی وزانستییە بۆ ئەوانەی گومان لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) دروستدەکەن ودەیانەوێت خەڵکی لە شوێنکەوتنی دووربخەنەوە، چونکە مەحاڵە ئەم فەرموودانەی ئێستە لەبەردەستماندان ولە کتێبەکانی سوننەتدا تۆمار کراون ووتەی کەسێکی ئاسایی پێش ١٤٠٠ساڵ بێت یان بەدەم پێغەمبەرەوە هەڵبەسترابن چونکە مرۆڤی پێش سەدەی ٢١ هیچ ئاگاداری ئەمانە نەبووە، کە دەیسەلمێنێت سەرچاوەیەکی خودایی هەیە، وبێگومان ووتەی پێغەمبەرمانە (ﷺ).

٤- بوونی چەندین نموونەی ئیعجازی زانستیی جۆراوجۆر لەبوارە زانستییە جیاوازەکاندا لە کتێبەکانی سوننەتدا دڵنیاییمان دەداتێ کە ئەو کەسانەی ئەم فەرموودانەیان کۆکردووەتەوە وبۆیان پاراستووین خەڵکانێکی ئەمین ومتمانەپێکراو بوون چونکە زانستی سەدەی ٢١ گەورەیی وئەمانەت لە کارەکانی ئەواندا دەردەخات.

٥- ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا دەتوانرێت وەك ئامرازێکی راستاندن وساخکردنەوەی ئەوفەرموودانە بەکاربهێندرێت کە لەرووی سەنەدەوە کێشەیان هەیە، چونکە دەرکەوتنی راستییەکی زانستیی وورد لە فەرموودەیەکدا کە تەنها لەمڕۆماندا مرۆڤەکان درکیان پێکردووە گومان لەراستیی ئەو فەرموودەیە ناهێڵێت ودەبێت لە سەرچاوەیەکی سەروو مرۆڤەکانەوە ئەم نهێنییە ئاشکرا کرابێت.

٦- راستییە زانستییەکان وتوێژینەوە زانستییەکان ئامرازێکی بەسوودن بۆ تەرجیح کردن لەنێوان گێڕانەوەکانی هەندێك لەو فەرموودانەی بەچەند ریوایەتێك هاتوون، وهەروەها بۆ راڤەکردنی دروستی مانای هەندێك لەو فەرموودانەی ئاماژەی زانستییان لەخۆگرتووە.

٧- توێژینەوە زانستییەکان دەتوانن گومان بڕەوێننەوە لەسەر هەندێك لەوفەرموودە صەحیحانەی ئاماژەی زانستییان لەخۆگرتووە وناحەزانی ئیسلام بۆ تانەدان لە سوننەت بەکاریدێنن.

بەڵام لێرەدا بەرای من پێویستە ڕەچاوی هەندێك مەرج وڕێکخەر بکەین لەکاتی لێکۆڵینەوە لە ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا:

١- لێکدانەوەی دەقەکان بەپێی ماناکانیان لەزمانی عەرەبیدا ودەبێت ئەوزاراوەیە ماناکە هەڵبگرێت باپێشتریش زانایان بەو شێوەیە لێکیان نەدابێتەوە.

٢- زانینی ئەو ژینگە وبارودۆخەی ئەو فەرموودەیەی تێدا ووتراوە ئەویش لەرێی کۆکردنەوەی دەقە جیاوازەکانی هەمان فەرموودە لە کتێبەکانی سوننەتدا بەمەبەستی بینینی وێنەکە لە هەموو لاکانیەوە.

٣- لێکدانەوەی فەرموودەکان لەژێر ڕۆشنایی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا چونکە فەرموودە ڕوونکەرەوەی قورئانە.

٤- نابێت بەهیچ جۆرێك ملی فەرموودەکان بادەین بۆ ئەوەی مانایەك لەخۆبگرێت کە بگونجێت لەگەڵ بیردۆزێکی زانستیدا کە لەوانەیە ڕاست بێت یان هەڵە، بەڵکودەبێت دەقەکە بەئاشکرا ئاماژەی بۆکردبێت.

٥- دەبێت تەنها پشت بەراستییە زانستییەکان ببەستین لەکاتی لێکۆڵینەوە لەبواری ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا.

**راسپاردەکان:**

١- بەردەوامیدان بەم کۆنگرانەی بابەتەکانی سوننەت ڕووندەکەنەوە وگومانەکان دەرەوێننەوە.

٢- کۆکردنەوە وپۆلێنکردنی ئەوفەرموودانەی ئامـاژەی زانستییان تێدایە وپاشان راڤەکردن ودەرخستنی ئەم ئاماژە ناوازانە لەرێی نووسینی کتێبی تایبەتمەند (کە بەزمانی کوردی زۆر کەمە) یان ووتار وتوێژینەوە لە گۆڤارەکاندا یان هۆکارەکانی تری گەیاندن لەم سەردەمەدا.

٣- بەردەوامیدان بە لێکۆڵینەوەی بابەتی راستاندنی فەرموودە لاوازەکان لەرێی ئیعجازی زانستی ووەرگرتنی رای کەسانی پسپۆڕ لەبوارە شەرعییە جۆراوجۆرەکاندا ودانانی هێڵە گشتییەکان لەم بوارەدا، هەروەها بواری ئیعجازی زانستی لە سوننەتدا بەگشتی.

٤- دروستکردنی ناوەندێك یان لیژنەیەکی تایبەتمەند لە کەسانی پسپۆڕی شەرعی وزانستی بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لەوفەرموودانەی لاوازن لەرووی سەنەد وراستاندنی ئەوفەرموودانەی ئاماژەی زانستییان تێدایە.

٥- ئاماژە زانستییەکان لە سوننەتدا دەتوانێت یەکلاکەرەوەی گێڕانەوە جیاوازەکانی هەندێك لە دەقەکانی سوننەت بێت، لەرێی ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستیی لەسەریان، هەروەها ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستیی بۆ رەواندنەوەی گومان لەسەر ئاماژە زانستییەکانی دەقە صەحیحەکانی سوننەت.

# خلاصة بحث: الإعجاز العلمي في السنة ( الواقع والمأمول )

## أهداف البحث:

١- عرض تعريف جديد للمعجزة ودلائل النبوة.

٢- استخدام المكتشفات العلمية لإضهار حقائق السنة ومصدرها الإلاهي.

٣- الإستفادة من الحقائق العلمية لتصحيح بعض الأحاديث الضعيفة المشتملة على إشارات علمية.

٤- إستخدام الحقائق العلمية للترجيح بين الروايات المختلفة لبعض الأحاديث.

٥- الرد على الشبهات التي تثار حول بعض الأحاديث عن طريق الإعجاز العلمي.

## طريقة ومواد البحث:

هذا البحث عبارة عن إستقراء ومتابعة للموضوع بطريقة علمية بعد البحث في المصادر المختلفة من كتب ومواقع بحثية علمية محكمة لموضوع الإعجاز العلمي في السنة.

## المحاولات السابقة:

بعد البحث الدقيق لم أجد بحثاً آخر مطابقا في العنوان أو المحتوى.

## المقدمة:

المعجزة في تعريف العلماء عبارة عن تلك الأمور والظواهر الخارقة للعادة التي يجريها الله سبحانه وتعالى على يد أنبيائه الكرام والتي يتحدون بها الناس في عصرهم أن يأتوا بمثله، يقول الإمام ابن تيمية الحراني: هي عبارة عن كل خارق للعادة، وعند علماء السلف كـ(أحمد بن حنبل) وغيره كانوا يسمونها الآيات، في القرآن الكريم ورد ذكر (الآية) في ٨٠ موضعاً بمعنى الدلائل الواضحة التي تؤكد صدق الرسول وتحث على الإيمان به، و وردت أيضا كلمة (البينة) ١٢مرة، و(بيّنات) ٤٠مرة، و(برهان) في موضعين.

إستخدام مصطلح الإعجاز للقرآن عند العلماء بدأ في نهاية القرن الثاني وبداية القرن الثالث الهجري، ولكن عند الحديث عن الخوارق في السنة استخدم العلماء مصطلح (علامات النبوة) عند البخاري وغيره، وبعد ذلك (دلائل النبوة) عند أبي نعيم الأصبهاني والبيهقي، إذا رجعنا للتعريف القديم للمعجزة نجد أن بعض دلائل النبوة لايدخل تحت هذا التعريف لإفتقارها لشرط التحدي، لهذا نحن بحاجة لتعريف جديد للمعجزة في يومنا هذا، وأنا أجد أن تعريف (أ.د. صالح بن أحمد رضا) في كتابه (الإعجاز العلمي في السنة النبوية) مشتمل على كل جوانب الإعجاز في القرآن والسنة حيث يقول: (المعجزة أمر يجريه الله على يد نبيه، أو علم يبديه من قوله، لايقدر أحد الإتيان بمثله في زمانه يكون دليلاً على نبوته لخروجه عن طاقة الخلق)، وهذا تعريف جامع للإعجاز.

بهذا التعريف الجديد كل دلائل النبوة (من أمثال: تكثير الطعام والماء، حنين الجذع، شفاء جروح الصحابة، تسبيح الحصى، ودعواته المجابة وغيرها الكثير) عبارة عن معجزات، لأن القصد بها إثبات النبوة وتثبيت إيمان الصحابة وليس تحديهم بهذه المعجزات لأنهم كانوا في أعلى درجات الإيمان.

## المناقشة:

## أولا:

الإعجاز العلمي في السنة عبارة عن الإشارات العلمية في حديث الرسول (ﷺ) الى الكون والمخلوقات والإنسان والتي ثبتت صحتها بعد الرسول (ﷺ) بمئات السنين، وبعد تقدم العلوم والمكتشفات، التي تثبت مصدرها الإلاهي لأن الإنسان في عصر الرسول كان عاجزاً أن يعرف هذه الحقائق بعلوم ومكتشفات عصره، من أمثلة الإعجاز العلمي في السنة:

– قافية الرأس مركز النوم واليقظة:جاء في حديث للرسول (ﷺ): ﴿يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَنَامَ ثَلَاثَ عُقَدٍ، يَضْرِبُ كُلَّ عُقْدَةٍ عَلَيْكَ لَيْلٌ

طَويلٌ فَارْقُدْ، فَإِن اسْتَيْقَظ فَذَكَرَ اللَّـهَ انْحَلَّـتْ عُقْـدَةٌ، فَـإِنْ تَوَضَّـأَ انْحَلَّـتْ عُقْـدَةٌ، فَـإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلاَّ أَصْـبَحَ خَبِيـثَ الـنَّفْسِ كَسْـلاَنَ﴾ (متفق عليه)، وفيه إشارة واضحة أن مركز التحكم في النوم للإنسان موجود في قافيـة الرأس في خلف الرأس والرقبة، وهذا ما أثبته العلم الحديث أن مركز التحكم في النـوم واليقظة موجود في التشكيل الشبكي في الجهة الخلفية لجذع الدماغ.

– لاشفاء في الحرام: قال النبي (ﷺ): ﴿إن الله لم يجعل شفاء أمـتي فيمـا حـرم عليها﴾ (رواه أبوداود وصححه ابن حبان) وجاء في السنة عندما سأل صحابي الـنبي (ﷺ) أن يرخص له في صنع الخمر بغرض الإستشفاء، فلم يرخص له وقـال (ﷺ): ﴿إنه ليس بدواء ولكنه داء﴾ (رواه مسـلم)، سـابقا كـان الأطبـاء يقولـون أن شـرب الخمر بجرعات قليلة ومحددة يومياً ليس بضار للإنسان ولـه فوائـد مثـل الوقايـة مـن جلطات القلب، ولكن أحدث الأبحاث العلمية في القـرن ٢١ أثبـت خطـأ هـذه النظريـة، والتي تقول أن تناول الخمـر والمـواد المسـكرة حتـى في أقـل الجرعـات يوميـا سـبب لحدوث السرطانات المختلفة في الجسم.

– الأحاديث التي جعلت (عجب الذنب) أساس تخلق الإنسان في بطن أمـه: تحـدث النبي (ﷺ) في بعض الأحاديث عن عجب الذنب وجعله بوضوح الأسـاس الـذي منـه يخلق الإنسان، مثل حديث: ﴿كُلُّ ابْنِ آدَم يَأْكُلُه التُّـراب إلاّ عَجْـبَ الـذَّنَب، مِنْـهُ خُلِـقَ وَمِنْهُ يُركب﴾ (رواه مسلم).

هذه الأحاديث فيها إشارات علمية جديدة جداً: الإنسـان في بدايـة خلقـه كـان لـه ذنب، من هذا الذنب يخلق الجنين، هذا الذنب عبارة عن عظـم، هـذا الـذنب أول شـيء في الجنين يكتمل تخلقه ومنه يتخلق الإنسان وجميع أنسجته وأنظمة جسـمه، وهـذه الإشـارات تتفـق مـع أحـدث المكتشـفات العلميـة في علـم الأجنـة لأن عجـب الـذنب في العربية هـوالعظم العصعصـي، ومصـدر هـذا العظـم في الجـنين هـو الشـريط أو الخـط الأولي، الذي يعتبر البداية الحقيقية لتخلق الجنين وأجهزته.

- ظاهرة البرق تشهد بصدق الرسول (ﷺ): قال النبي (ﷺ): ﴿أَلَمْ تَرَوْا إِلَى الْبَرْقِ كَيْفَ يَمُرُّ وَيَرْجِعُ فِي طَرْفَةِ عَيْنٍ﴾ (رواه مسلم)، في هذا الحديث يشرح الرسول (ﷺ) ظاهرة البرق لصحابته بدقة متناهية ويكشف عن بعض أسرار البرق التي لم تكن معروفة للبشر قبل القرن ١٨، تحديد طورين للبرق (المرور والرجوع) كشفت عنه أحدث المكتشفات العلمية حول البرق في القرن ٢١ بأستخدام الكاميرات ذات السرعة العالية جداً، وتحديد سرعة للبرق (طرفة عين) سبق علمي غير مسبوق، حيث حدد العلماء سرعة البرق في حدود بعض من الميللي ثانية وهو تقريبا نفس المدة الزمنية التي تستغرقها طرفة للعين في الإنسان الأعتيادي.

- تنبؤ في حياة النبي: جاء في حديث للنبي (ﷺ): ﴿يُوشِكُ يَا مُعَاذُ إِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ أَنْ تَرَى مَا هَا هُنَا قَدْ مُلِئَ جِنَانًا﴾ (رواه مسلم)، قال النبي (ﷺ) هذا في غزوة تبوك للصحابي معاذ بن جبل، وتبوك في عصر النبي (ﷺ) كانت صحراء جرداء قليلة المياه كما بينه الحديث، ولكن بعد عشرات ومئات السنين من هذا الحديث الشريف حدث تغير مناخي كبير في هذه المنطقة وهي اليوم من أخضر المناطق الزراعية في المملكة السعودية وأكثرها مياهاً، ومليئة بالبحيرات والبساتين الخضراء.

## ثانيا:

نستطيع الإستفادة من الإعجاز العلمي في السنة لخدمة الحديث الشريف بهذه الطرق:

١- عبارة عن دليل عصري لأضهار حقائق السنة:عندما نقارن الإشارات العلمية في بعض الأحاديث مع أحدث المكتشفات والبحوث العلمية نجد تطابقاً كاملاً بينهما، ويتضح إستحالة ورود هذه المعلومات من مصادر بشرية في عصر النبوة بل يجب أن تكون أتت من مصدر فوق البشر وهوالله سبحانه وتعالى، من ناحية أخرى وجود هذه الإشارات المتعددة في كثير من الأحاديث في يومنا هذا أكبر دليل على صدق وأمانة علماء الحديث ونقلته من النبي (ﷺ).

٢- نستطيع الإستفادة من الإعجاز العلمي كدليل لتصحيح بعض الأحاديث الضعيفة السند، لأن ثبوت حقيقة علمية في حديث ضعيف دليل على ربانية مصدره، مثل حديث:(لا تركب البحر إلا حاجا أومعتمرا أوغازيا في سبيل الله، فإن تحت البحر ناراً( (رواه أبوداود وهو حديث ضعيف)، ما أشار إليه هذا الحديث أكتشفه العلماء في أواخر القرن ٢٠ من وجود ألاف البراكين في قشرة الأرض تحت البحار والمحيطات.

٣- نستطيع إستخدام الحقائق العلمية للترجيح بين الروايات المختلفة لبعض الأحاديث، مثل حديث: ﴿إذا مر بالنطفة ثنتان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكاً فصورها وخلق سمعها وبصرها وجلدها ولحمها وعظامها...﴾ (رواه مسلم)، يشير هذا الحديث بوضوح الى أن تكون العظام (وهي بعد مراحل: النطفة والعلقة والمضغة) يبدأ في الأسبوع السادس وهوما أثبته علم الأجنة الحديث.

ولكن عندنا أحاديث في البخاري تقول: ﴿إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذلك ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذلك ثُمَّ يَبْعَثُ الله مَلَكًا...﴾ (رواه البخاري)، وقد حدد لكل من مراحل (النطفة والعلقة والمضغة) أربعين يوما، والمجموع (١٢٠ يوما) وهومخالف للحديث السابق ولعلم الأجنة، ولكن يرتفع هذا الخلاف عندما نجمع كل روايات الحديث، فنجد في رواية الإمام مسلم: ﴿إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذلك عَلَقَةً مِثْلَ ذلك، ثُمَّ يَكُونُ فِي ذلك مُضْغَةً مِثْلَ ذلك، ثُمَّ يُرْسَلُ الْمَلَكُ فَيَنْفُخُ فيه الرُّوحَ ... ﴾ (رواه مسلم)، حيث نرى زيادة (في ذلك) قبل كلمات (علقة ومضغة) وهي زيادة صحيحة وجزء من الحديث، فيصير المعنى أن كل مراحل (النطفة والعلقة والمضغة) تحدث في نفس الأربعين يوما الأولى وليس ثلاث أربعينيات مختلفة، وهذا الذي يؤيده العلم الحديث فتنجلي الرواية الصحيحة والكاملة للحديث.

٤- نستطيع من خلال إستخدام الكشوفات العلمية الرد على الشبهات التي تثار حول بعض الأحاديث الصحيحة: مثل حديث: ﴿إذا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي شَرَابِ أَحَدِكُمْ

فَلْيَغْمِسْهُ ثُمَّ لِيَنْزِعْهُ فَإِن فِي إِحْدَى جَنَاحَيْهِ دَاءً وَالْأُخْرَى شِفَاءً﴾ (رواه البخاري) ورواه أيضاً (أحمد وأبوداود وابن حبان وابن ماجة) وهو في أعلى درجات الصحة للحديث، فالبعض يقولون أن الذباب حشرة نجسة ومعدية فكيف يجتمع الداء والدواء في جناحي الذباب؟ لكن عند بحثنا للموضوع عند البحوث العلمية الحديثة نجد صحته من الناحية العلمية العملية والمخبرية.

## نتائج البحث:

١- يثبت الإعجاز العلمي للسنة أن السنة وحي إلاهي، وأن الرسول (ﷺ) تحدث من العلم الإلاهي حينما أرشد صحابته وتابعيه.

٢- الإعجاز العلمي للسنة يثبت أهمية السنة كثاني مصادر التشريع، وهو رد منطقي للذين يشككون في مصداقية الحديث، لأنه من المحال وجود مئات الأمثلة من السبق العلمي للسنة في كتب الحديث اليوم مصادفة لأن البشر في زمن البعثة لم يفقهوا من هذه المواضيع شيئا، فقط إنسان القرن ٢٠ و٢١ اكتشفوا هذه الحقائق، وهذا يثبت الوحي في السنة النبوية.

٣- وجود مئات الأمثلة من الإشارات العلمية في السنة يؤدي الى اليقين في عدالة وأمانة علماء الحديث ورواته وجامعيه ومحققيه، فعلوم القرن ٢١ أثبت أمانتهم وحرصهم في تعاملهم مع السنة.

٤- يمكن إستخدام الإعجاز العلمي في السنة كأداة لتصحيح بعض الأحاديث الضعيفة من حيث السند، لأن ظهور حقيقة علمية دقيقة في حديث نبوي يثبت صحتها و ورودها عن طريق الوحي.

٥- الحقائق العلمية الحديثة مفيدة في الترجيح بين روايات الحديث المختلفة.

٦- عن طريق البحوث العلمية نستطيع الرد على الشبهات المثارة حول بعض الأحاديث الصحيحة المشتملة على إشارات علمية.

## Abstract

this is a literature review about Scientific miracles of Sunnah, (Muujizah) or miracle was defined as an unnatural event that happens on the hands of God's prophets to challenge human beings that they cannot do the same, that's to proove that those prophets where messengers of Allah.

This term (Muujizah) is invented by our muslim Scholars and not mentioned in Quran and Sunnah, instead there is the term (signs of prophecy) which is wider in meaning and include those Signs that Allah showed it to our prophet's companions.

So we need a new definition for (Muujizah) which will be as follows: It's an unnatural event that Allah do it for his prophet or a Knowledge that is revealed in his Teachings that nobody in his era could do or say the same and become a proove on his prophecy because its beyond human capabilities.

Scientific miracles of Sunnah are those scientific references mentioned in the teachings of the prophet about the universe and the creations that science discovered after hundreds of years, thus it's impossible for ordinary humans of that time to know these facts.

We have plenty of scientific references in Hadeeth of the prophet: like these:

- The back of the Head (Qafiah) is the center of sleep & awakeness.
- The are no treatment in those things that Allah Forbiddens, Especially drinking Alcohol.

- The coccyx (Ajib Athanab) is the basis of the embryo's creation.
- The lightening has two phases that happens in a blink of an eye.
- The prophet predicted that the province of Tabuk (in Saudi Arabia) which was a desert area will become garden & Green area.

From scientific point of view all these sayings are 100% correct, thus scientific miracles in sunnah nowadays is a great proove of the Devine source of these knowledges and prooves that those muslim scholars who passed sunnah to us in there writings were trust worthy and honest in transferring the prophets sayings to us, also we can use scientific gestures in sunnah to correct those hadeeths with a slight weakness in the line of the reciters, because when there is a precise scientific reference in any hadeeth it prooves its Devine origin, also we can favor the right narration between several narrations of the same Hadeeth, or tell the right meaning of some Hadeeths, also by using scientific discorings and researchs we can clarify doughts about other Hadeeths.

# ئیعجازی زانستی له ئایەتەکانی بیستن وبینین له قورئانی پیرۆزدا

﴿إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً﴾ (الإسراء:٣٦)

## پێشەکی

- ووشەی بیستن (السمع) ولێوەرگیراوەکانی (١٨٥) جار لەقورئانی پیرۆزدا هاتوون، بەڵام ووشەی بینین (البصر) ولێوەرگیراوەکانی تەنها (١٤٨)جار هاتوون، لەکاتێکدا ووشەی بیستن (السمع) لەهەر شوێنێکدا هاتبێت بەواتای بیستنی دەنگەکان وقسەکان وتێگەیشتنی هاتووە، بەڵام ووشەی(البصر) تەنها (٨٨)جار بەواتای بینینی رووناکی وتەن وشێوەکان بەچاوهاتووە ولەجارەکانی تردا بەمانای تێفکرین وتێگەیشتنی ژیریبیانە بۆ دیاردەکانی بوونەوەر وژیان هاتووە.

- ووشەی بیستن (السمع) وبینین (البصر) هاوڕێ لەگەڵ یەکدا لە ٣٨ ئایەتی قورئاندا هاتوون، هەروەك لەم نموونانەدا:

﴿ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾ (السجدة:٩).

﴿وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾ (المؤمنون:٧٨).

﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَى عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُم مِّن شَيْءٍ﴾ (الأحقاف:٢٦).

﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (النحل:٧٨).

﴿قُلْ هُوَ الَّذِي أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾ (الملك:٢٣).

﴿أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ والأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللّهُ فَقُلْ أَفَلاَ تَتَّقُونَ﴾ (يونس:٣١).

﴿مَا كَانُواْ يَسْتَطِيعُونَ السَّمْعَ وَمَا كَانُواْ يُبْصِرُونَ﴾ (هود:٢٠).

﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ (الإنسان:٢).

– هەروەها ووشەی کەڕی (الصمم) هاوڕێ لەگەڵ ووشەی کوێری (العمی) ٨جار هاتوون کە لە زوربەیاندا کەڕی پێش کوێری کەوتووە، هەروەك لە:

﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ﴾ (محمد:٢٣).

﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ﴾ (البقرة:١٧١).

﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاَ يَرْجِعُونَ﴾ (البقرة:١٨).

﴿وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا﴾ (الفرقان:٧٣).

– ئەوەی تێبینی دەکەین لەم ئایەتە پیرۆزانەدا ئەوەیە کە هەمیشە ووشەی بیستن (السمع) پێش ووشەی بینین (البصر) کەوتووە وزیاتر گرنگی پێدراوە! لێرەدا دەپرسین ئایا ئەم پێش خستنە مانایەکی تایبەتی هەیە؟

ڕەنگە وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە لەسەرەتادا لەژێر ڕۆشنایی ئەو زانیارییانەی هەمانە لەسەر ئەم ٢ هەستە کارێکی قورس بێت وتێگەیشتنی گران بێت، چونکە ئەوەی زانراوە لەرووی هەردوو زانستی کارئەندامزانی (Physiology) وتوێکاری (Anatomy)دا ئەوەیە کە دەماری بینین لەهەر چاوێکدا لە زیاتر لە (١ملیۆن) ڕیشاڵی دەماری پێکدێت لەکاتێکدا دەماری بیستن لەهەر گوێیەکدا تەنها لە (٣٠هەزار) ڕیشاڵی دەماری پێك دێت، هەروەها زانستی کارئەندامزانی بۆمان باس دەکات کە سێیەکی دەمارەکانی هەست لەمرۆڤدا دەمارەکانی بینینن وئەو زانیارییە هەستیانەی کە لەڕێی گوێ وە بە مێشك دەگات تەنها ١٢٪ی زانیارییەکانە بەڵام ٧٠٪ی زانیارییە هەستییەکان لەڕێی چاوەوە دەگات بەمێشك. **بڕوانە وێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی لاپەڕە (٤١١)**

– لێرەدا جارێکی تر دەپرسین ئایا هۆکاری ئەم پێشخستنەی هەستی بیستن بەسەر هەستی بینیندا بەنزیکەیی لەهەموو ئایەتەکاندا دەبێت چی بێت؟ بێگومان دەبێت هۆکاری گرنگ هەبێت کە هێشتا ئێمە پەیمان پێنەبردووە، بەڵام ئەگەر ئێمە وورد ببینەوە لەو راستییە زانستیانەی کەلەم دواییانەدا لە زانستەکانی (کۆرپەلەزانی، توێکاری، کارئەندامزانی وزانستی پزیشکی)دا دۆزرانەوە ئەوا وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەست دەکەوێت وبە ئاشکرا ئیعجازی زانستی ئەو ئایەتە پیرۆزانەمان بۆ روون دەبێتەوە.

لەوراستییە زانستیانەی تا ئێستا زانراون بریتییە لە:




**١- گەشەکردنی کۆرپەلەیی گوێ وچاو:**

هەردووهەستی بیستن وبینین بەنزیکەیی لەیەك کاتدا گەشەدەکەن لە سەرەتای دروستبوونی کۆرپەلەدا، بینراوە کە پەرەی بیستن (الصفيحة السمعية Otic Placode) لەسەرەتای هەفتەی چوارەمی ژیانی کۆرپەلەدا گەشە دەکات کە یەکەم پێکهاتەی کۆئەندامی بیستنە، هەروەها چاڵایی چاویش (الأخدود البصري Optic Sulci) لەسەرەتای هەفتەی چوارەم (لەرۆژی ٢٢دا) گەشە دەکات.

گوێی ناوەوەی کۆرپەلە لەم پەڕەی بیستنەوە گەشە دەکات کە ووردە ووردە لوولپێچی گوێ (Membraneous Cochlea) دروست دەکات (کە سەرەتا بەدرێژی دروست دەبێت وپاشان لوول دەخوات)، لەهەفتەی ۱۸یەمدا چواردەوری ئەم لوولپێچە بەکرکڕاگە دەدرێت وگەشە دەکات تاوەکو دەگاتە قەبارەی ئاسایی خۆی لەکۆتایی هەفتەی ۱۸یەمدا.

لەکۆتاییدا بەئێسك دەورە دەدرێت ولەم کاتەدا ئەندامی هەستیاری بیستنی گوێ لەناو ئەم لوولپێچە ئێسکەدا دروست دەبێت کە بریتییە لە ئەندامی کۆرتی (عضو كورتي)، لەناو ئەم ئەندامەدا خانە هەستیارەکانی بیستن لە چواردەوری دەماری بیستندا دروست دەبن.

لێرەوە دەبینین گوێی ناوەوەی کۆرپەلە پێگەیشتووە وگەیشتۆتە قەبارەی ئاسایی خۆی وئامادەیە بۆ هەستان بەکرداری بیستن لە کۆتایی مانگی پێنجەمەوە.وەك دەزانین ئەم بەشەی گوێ یە (گوێی ناوەوە) کە دەتوانێت هەست بە دەنگەکان بکات ووەکوتەزوویەکی دەماری (إشارات عصبية) بیگەیەنێتە مێشك بۆ ئەوەی هەستی پێبکرێت بەبێ ئەوەی پێویست بەگوێی ناوەڕاست ودەرەوە بکرێت (ئەم دووبەشە تەنها کاریان گەیاندنی دەنگەکانە بۆ گوێی ناوەوە) چونکە ئەم ۲ بەشە لەکۆتایی گەشەی کۆرپەلە لەهەفتەی ۳۲دا دروست بوونیان تەواودەبێت.

ئەگەر بێینە سەر باس کردنی گەشەی چاودەبینین وەك زانستی کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکات گەشەی تۆڕی بینین (الشبكية Retina)ی هەستیار بۆ رووناکی تەنها دوای هەفتەی ۲۵ تەواودەبێت، گەشەی دەماری بینین وتەواو بوونی داپۆشینی بۆ ئەوەی تەزووەکان بەباشی بگەیەنێت دوای ۱۰هەفتە لە لەدایك بوونی کۆرپەلەوە دەبێت هەروەها پێڵوی چاوەکانی کۆرپەلە بەیەکەوە نووساون وتەنها دوای هەفتەی ۲٦ لەیەك جیادەبنەوە.

لەمەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە گوێی ناوەوەی کۆرپەلەی مرۆڤ گەشەی تەواودەبێت وتوانای بیستنی لەمانگی پێنجەمەوە دەست پێدەکات بەلام چاوەکان لەدوای مانگی حەوتەمەوە دەکرێنەوە وچینە هەستیارەکەی بۆ رووناکی




گەشە دەکات، کە هەتا ئەوکاتەش دەماری بینین گەشەی تەواو نەبووە و چاوەکانیش ناتوانن هیچ ببینن لەبەر ئەوەی لەناو ٣ تاریکیدان.

**٢- بیستن وبینین:**

بەشێوەیەکی زانستیانە سەلمێنراوە کە گوێی ناوەوەی کۆرپەلە لەمانگی پێنجەمیدا هەست بە دەنگەکان دەکات کە لەوکاتەدا گوێی لە لێدانی دڵ ودەنگی ریخۆڵەکانی دایکێتی، لەئەنجامی ئەم بیستنەدا چەند تەزوویەکی دەماری لەگوێی ناوەوە ودەماری بیستن وناوچەی بیستن لەمێشکدا دروست دەبێت کە دەتوانین ئەم تەزووانە تۆمار بکەین بەچەند ئامێرێکی تایبەتی تاقیگەیی کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا سەلمێنەری ئەوراستیەیە کە کۆرپەلە توانای بیستنی هەیە لەم قۆناغە سەرەتاییەی ژیانیدا.

بەپێچەوانەوە ئەم جۆرە تەزووە دەماریانە تۆمار نەکراوە لەئەندامی بینینی کۆرپەلەدا تەنها لەپاش لەدایك بوونیەوە نەبێت.

ئەوە گرنگە کە بزانین دەنگەکان بەدوورێگە دەگەنە گوێی ناوەوە وهەستی پێدەکرێت: ١- لەرێی گوێی دەرەوە پاشان گوێی ناوەڕاست کە پڕن لەهەوا لەمرۆڤی ئاساییدا پاشان بۆ گوێی ناوەوە، ٢- لەرێی ئێسکەکانی کەللەی سەرەوە راستەوخۆ بۆ گوێی ناوەوە.

شەپۆلە دەنگیەکان لەرێی یەکەمەوە بەهۆی هەوا دەگوازرێتەوە وە لەرێی دووەمەوە بەهۆی ئێسکە کانی کەللەی سەرەوە دەبێت کە گوێزەرەوەیەکی زۆرباشە بۆ دەنگەکان، هەروەها گوێی دەرەوەی کۆرپەلە لەسکی دایکیدا پڕە لە شلەمەنی کە شلەمەنیەکانیش گوێزەرەوەیەکی زۆر باشن بۆ دەنگەکان، وەك دەبینین کاتێك خۆمان سەر نوقم دەکەین لەئاودا لەکاتی مەلەکردندا زۆر بەباشی گوێمان لە دەنگەکان دەبێت.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کۆرپەلە دەتوانێت گوێی لە دەنگەکان ببێت کە دەگەنە گوێی ناوەوە بەهۆی ئێسکەکانی کەللەی سەرەوە یان لەرێی گوێی دەرەوە کەپڕە لە شلەمەنی.

بەڵام لەلایەکی ترەوە کۆرپەلە ناتوانێت لەسکی دایکیدا هیچ ببینێت نەك تەنها لەبەر ئەوەی چواردەوری هەمووی تاریکە بەڵکو لەبەر پێکەوەنووسانی پێڵووەکانی چاوی، لەبەر پێنەگەیشتنی تەواوی تۆڕی بینین، وە لەبەر تەواو نەبوونی گەشەکردنی دەماری بینین کە هەموویان لەکۆتایی سکپڕیدا گەشەیان تەواودەبێت.

## ٣- تەواوبوونی گەشە کردنی هەردوو هەستی بیستن وبینین:

کۆرپەلە دەتوانێت بە شێوەیەکی ئاسایی ببیستێت دوای چەند رۆژێك لە لەدایك بوونی، ئەویش پاش ئەوەی ئەوشلەمەنیانەی کە لە گوێی دەرەوە وناوەڕاستدا دەمێنێتەوە هەڵدەمژرێنەوە، بینراوە کە کۆرپەلەی مرۆڤ تەنها زیندەوەرێکە کە دەست دەکات بە بیستن لەناو سکی دایکیدا بەڵام هەموو

زینـدەوەرەکانی تـر کۆرپەلـەکانیان لـەپاش لـەدایك بوونیـان بەماوەیـەك دەسـت دەکەن بەبیستن، ئەمانەش چەند نموونەیەکن:

- کۆرپەلەی مرۆڤ پێش لە دایك بوونی بە ١٦هەفتە دەبیستێت.
- کۆرپەلەی بەرازی غینیا پاش لەدایك بوونی بە ٥-٦سەعات دەبیستێت.
- کۆرپەلەی پشیلە پاش لەدایك بوونی بە ٥-٦رۆژ دەست دەکات بەبیستن.
- کۆرپەلەی کەروێشك پاش لەدایك بوونی بە ٧رۆژ دەست دەکات بەبیستن.
- کۆرپەلەی سەگ پاش لەدایك بوونی بە ١٠رۆژ دەست دەکات بەبیستن.

بەڵام ئەگەر بێینـە سـەر هەسـتی بیـنین دەبیـنین لـە کـاتی لـەدایك بوونـدا زۆر لاوازە و وەکونەبوو وایە، زۆر قورسـە بـۆ تـازە بووەکـە ڕووناکی لـە تـاریکی جیـا بکاتەوە، تەنها چەند وێنەیەکی لێـڵ بـۆ شـتەکان دەبینێـت، چـاوەکانی دەجـوڵێن بەبێ ئەوەی بتوانێت بیوەستێنێت لەسەر شتە بینراوەکـان، تـەنها لـەدوای مـانگی سێیەم یان چوارەم دەست دەکات بە ناسینەوەی وێنـەکان وشـێوەی دایکـی یـان شـێوەی شووشـەی شـیرەکەی دەناسـێتەوە، لـەپاش مـانگی شەشـەم روخسـاری مرۆڤەکان دەناسێتەوە، ئەم گەشە کردنەی هەستی بینین تاوەکو تەمەنی ١٠ساڵان بەردەوام دەبێت.

## ٤- گەشەکردنی ناوچەکانی بیستن وبینین لەمێشکی مرۆڤدا:

زانسـتی کۆرپەلـەزانی سـەلماندوویەتی کـە ناوچـەی بیسـتن لەمێشـکدا گەشەدەکات وپێدەگات پێش ناوچەی بینین، وە توانراوە تـەزووی دەمـاری تۆمـار بکرێت لەناوچەی بیستن لە مێشکدا لەکاتی ئاگادار کردنـەوەی کۆرپـەلـە لـە سـکی دایکیـدا ئـەویش بـەهۆی بـەکارهێنانی زەنگێکـی ئاگادارکردنـەوە لـەنزیك سـکی دایکەکـە لـە سـەرەتای مـانگی پێنجـەمی کۆرپەلەییـدا، ئـەو دەنگانـەی کۆرپەلـە دەیبیستێت لەکاتی نیوەی دووەمی سکپڕیدا دەبێتە هۆی هاندانی ناوچەی بیسـتن لەمێشکیدا بۆ ئەوەی گەشەی کامڵ ببێت.

لەلایەکی ترەوە ناوچەی بینین بەهیچ جۆرە ئاگادارکەرەوەیەك لەم کاتەدا ئاگادار نابێتەوە بۆیە گەشەسەندنی زۆر بەرەو پێش ناچێت، چونکە وەك لەزانستی کارئەندامزانیدا بینراوە هۆکارە ئاگادار کەرەوەکان دەبنە هۆی هاندانی گەشەکردنی هەر ڕێرەوێکی دەماری کە پیایاندا تێدەپەڕن، بەم شێوەیە ڕێڕەوی دەماریی ودەماری بیستن لەمانگی پێنجەمەوە هاندەدرێت بۆ گەشەکردن بەڵام ڕێڕەوی دەماریی ودەماری بینین هان نادرێت تەنها دوای لەدایك بوون نەبێت.



# ناوچەکانی بیستن وبینین لە مێشکدا

لەبەر ئەم هۆکارانەی کە باسمان کرد منداڵ لەسەرەتای ژیانیدا زانیارییە دەنگیەکان زووتر فێردەبێت وەك لە زانیارییە ڕووناکیەکان (بینراوەکان) وزووتر لەبەریان دەکات وەك لە زانیارییە بینراوەکان، بۆ نموونە: منداڵ زیاتر ووتە ودەنگەکان لەبەردەکات ولێیان تێدەگات وەك لە تێگەیشتنی ئەو وێنە

ونووسـينانەی کـە دەیبینێـت، هـەروەها باشـتر وخێراتـر ئایەتـەکانی قورئـان وسروودەکان لەبەر دەکات، قسەکردن لـەکاتێکی زۆر زووتـردا فێردەبێت لەچاو فێربوونی نووسین وخوێندنەوە.

ئەمانە هەمووی لەبەر ئەوەیە کە ناوچەی بیستن لەمێشکدا زووتر پێدەگات لەچاو ناوچەی بینین، هەر بۆیە ئەم ئامارژانە لە قورئاندا دەبینین: ﴿لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَا أُذُنٌ وَاعِيَةٌ﴾ (الحاقة:١٢) واتە: ئێمە ئەم قورئانەمان کردووە بە یادخەرەوەیەك بۆ ئەوەی بە گوێ یە تێگەیشتووەکانتان وەریبگرن (واتە گوێکان گرنگترن بۆ تێگەیشتن وشت وەرگرتن)!!

## ٥- گەشەکردنی ناوچەی لێکدانەوەی زمان لەمێشکدا:

ناوچەی لێکدانەوەی زمان (Language Interpretation Area) لە توێکڵی مێشکدا گەشە دەکات کە دەکەوێتە نزیك ناوچەی هەستی بیستن لەمێشکدا وبەشێوەیەکی زۆر بەتین ونزیك لەگەڵیدا گرێ دەدرێت لەچاو ئەو پەیوەندییەی ناوچەی لێکدانەوەی زمان لەگەڵ ناوچەی هەستی بینین هەیەتی، ئەم نزیکیەی هەردوو ناوچەی بیستن ولێکدانەوەی زمان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستیەی کە ناوچەی هەستی بیستن وکارەکانی گوێ لەکاتێکی زۆر زووتردا پێدەگەن لە پێگەیشتنی ناوچەی هەستی بینین وکارەکانی چاو.

لەمانەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە:

أ- ئەندامی بیستن وبەشەکانی گوێی کۆرپەلە زۆر زووتر لەئەندامی بینین وبەشەکانی چاو گەشە دەکات، ئەندامی بیستن دروست بوونی کامڵ دەبێت وپێدەگات تاوەکو لەمانگی پێنجەمی ژیانی کۆرپەلەییدا دەگاتە قەبارەی ئاسایی خۆی لە مرۆڤێکی پێگەیشتوودا، بەڵام تەواو بوون وکامڵ بوونی چاوەکان بۆ قەبارەی ئاسایی خۆی لە مرۆڤێکی پێگەیشتوودا تەنها لە ١٠ ساڵیدا دەبێت.

ب- كۆرپەلە دەست دەكات بە بیستنی دەنگەكان لە سكی دایكیدا لـە مـانگی پێنجەمیەوە بەرەوسەر بەڵام تەنها لەدوای لەدایكبوونی نەبێت ناتوانێت رووناكی و وێنەكان ببینێت.

ج- هـەموو ناوچـەكان وریرەوەكـانی بیسـتن لەمێشـكدا زۆر زووتـر پێدەگـەن وگەشەدەكەن وەك لە ناوچەكان وریرەوەكانی بینین.

لێرەدا دەبێت بگەرێینەوە بۆ ئایەتە پیرۆزەكان:

﴿وَهُوالَّـذِي أَنشَـأَ لَكُـمُ السَّـمْعَ وَالْأَبْصَـارَ وَالْأَفْئِـدَةَ قَلِيلًـا مَّـا تَشْـكُرُونَ﴾ (المؤمنون:٧٨).

﴿ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾ (السجدة:٩).

﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً﴾ (الأحقاف:٢٦).

﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ الْسَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (النحل:٧٨).

﴿قُلْ هُوالَّذِي أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ﴾ (الملك:٢٣).

﴿أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ والأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيَّتَ مِنَ الْحَـيِّ﴾ (يونس:٣١).

﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ (الإنسان:٢).

هەموو ئەو ئایەتە پیرۆزانە ئامـاژە بـۆ دروسـت بـوون وپێگەیشـتنی كۆرپـەلـەی مرۆڤ دەدەن، لە هەموویاندا بەبێ جیـاوازی باسـی بیسـتن پێشـتر كـراوە لـەبینین، ووشەی (سمع) پێش (بصر) كـەوتووە، ئەمانـە بێگومـان بەرێكـەوت نییـە بـەڵكو ئیعجازێكی خودابیە كە زانایان تەنها لەم دواییانەدا گەیشتنە ئەم راستییە زانستیە شـاراوانە كـەخۆی لەخۆیـدا سـەلماندنی ئیعجـازی زانسـتی ئـەم ئایەتـە پیرۆزانـە وسەلماندنی خوداوەندی قورئانە.

فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) لەگەڵ قورئاندا یەك دەگرێتەوە لەوەدا کە بیستنی پێش خستووە بەسەر بینیندا، چۆن نا چونکە هەردووکیان بێگومان لەیەك سەرچاوەوە هاتوون، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿إذا مر بالنطفة ثنتان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكا فصورها وخلق سمعها وبصرها وجلدها ولحمها وعظامها﴾ (رواه مسلم) واتە: کاتێك کە کۆرپەلە ٤٢ شەوی بەسەردا تێدەپەڕێت خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت کە شێوەی مرۆڤی بداتێ وپاشان بیستن وبینین وپێست وگۆشت وئێسقانی بۆ دروست بکات.

پاشان باسەیری ئەوئایەتە پیرۆزانەی تر بکەین کە هەردوو هەستی بیستن وبینینی تێدا هاتوون، وەك:

﴿لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْئًا﴾ (مريم:٤٢).

﴿مَا كَانُواْ يَسْتَطِيعُونَ السَّمْعَ وَمَا كَانُواْ يُبْصِرُونَ﴾ (هود:٢٠).

﴿إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً﴾ (الإسراء:٣٦).

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ اللّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَارَكُمْ وَخَتَمَ عَلَى قُلُوبِكُم﴾ (الأنعام:٤٦).

﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ﴾ (فصلت:٢٢).

﴿وَلَوشَاء اللّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ﴾ (البقرة:٢٠).

﴿حَتَّى إِذَا مَا جَاؤُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَارُهُمْ وَجُلُودُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (فصلت:٢٠).

لەو ئایەتە پیرۆزانەدا قورئان ئاماژە بەهەردوو کرداری بیستن وبینین دەدات، لەبەرئەوەی کە کرداری بیستن پێش کرداری بینین گەشەی کردووە وبیستنیش زۆر گرنگترە لەفێربووندا وزیاتر دەچەسپێت لە یادەوەریەکانی منداڵدا، هەربۆیە خوای گەورە بیستنی پێش بینین خستووە، ئەو راستییە زانستیانەی پێشتر باسکران ئیعجازی زانستی ئەم ئایەتانەش دەردەخەن، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا

چەندین لایەنی تر هەیە کە هەستی بیستن بەسەر هەستی بینیندا زاڵ دەکات لەگرنگیدا، وا لەخوارەوە باسیان دەکەین وزیادیان دەکەین بۆ خاڵەکانی پێشتر:

٦- لە رووی کارئەندامزانییەوە (فیزیۆلۆجیەوە) زانراوە کە مرۆڤ سەرەتا هەستی بینین لەدەستدەدات پێش هەستی بیستن لە: {سەرەتای خەودا، لەکاتی وەرگرتنی مادەی بێهۆشکەر (بەنج)، لەکاتی سەرەمەرگدا پێش مردن، لەکاتی دابەزینی پەستانی ئۆکسجین لەهەوادا (کاتێك بەشاخێکی بەرزدا سەردەکەوین یان کە سواری فڕۆکە دەبین بۆ بەرزییەکی زۆر)، یان لەکاتی کەمخوێنی مێشکدا وەك لە رۆژووەوان روودەدات کاتێك رۆژوودەشکێنێت وگەدەی زۆر بەخێرایی پڕدەکات، یان لەکاتی هەستانێکی زۆر کتوپڕ وخێرا لەحاڵەتی پاڵ کەوتنەوە} لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا مرۆڤ سەرەتا هەستی بینین لەدەستدەدات پاشان بیستن.

### ٧- کاریگەریی خێرایی وبەرز بوونەوە لەسەر بیستن وبینین:

زیادبوونی خێرایی بەکتوپڕی بەتایبەتی لای فڕۆکەوانان یان کەشتیوانە ئاسمانیەکان لەکاتی فڕین لەبەرزییە زۆرەکاندا کاریگەرییەکی نێگەتیڤانە لەسەر هەستی بینین دروست دەکات کە دەبێتە هۆی لێڵ بوونی بینین پێش ئەوەی بەتەواوی فڕۆکەوان لەدەستی بدات وتووشی کوێرییەکی تەواوی کاتی ببێت، بەلام لەم کاتەدا بینراوە کە فڕۆکەوان هەستی بیستنی لەدەست نادات وبەشێکی زۆری دەمێنێتەوە لەو کاتەی داهاتوودا کە یارمەتی فڕۆکەوانەکە دەدات بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ دامەزراوەکانی سەر زەوی بمێنێت.

### ٨- بوارەکان و رووبەری بیستن وبینین:

مرۆڤ دەتوانێت ئەو دەنگانە ببیستێت کە دەگەنە گوێی لەهەموو لایەك ولەهەموو بەرزییەکەوە، لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین کە رووبەری بیستنی مرۆڤ ٣٦٠پلەیە بەهەموو لایەکیدا، بەڵام ئەگەر مرۆڤ سەری لەجێگەیەکدا جێگیر بکات ئەوا تەنها دەتوانێت لەرووبەرێکی دیاری کراودا تەنەکان ببینێت کە بەنزیکەیی

دەکاتە ١٨٠پلە بەرووی ئاسۆیی و١٤٥پلە بەرووی ئەستوونی ورووبەری بینینی بۆ رەنگەکان زۆر لەمە کەمتریشە.

هەروەها بینراوە کە تیشکی رووناکی هەمیشە بەهێڵێکی راست دەڕوات واتە ئەگەر تەنێکی ناڕوون رێی پێبگرێت ئەوا ناتوانێت بەناویدا بڕوات یان بەدەوریدا پێچ بکاتەوە کەواتە بواری بینین زۆر دیاریکراوە، بەڵام شەپۆلە دەنگیەکان بەهەموو لایەکدا دەڕۆن ودەتوانن لەگۆشەکان وبەدەوری تەنەکاندا پێچ بکەنەوە وبەئاسانی دەگوێزرێنەوە بەناو شلەمەنی وتەنە ڕەقەکاندا ومرۆڤ زۆر بەئاسانی دەیان بیستێت، کەواتە بوار و رووبەری بیستن زۆر فراوانترە لە بواری بینین.

## ٩- کاریگەریی نەخۆش کەوتنی مێشك لەسەر بیستن وبینین:

ئەوە گرنگە کە بزانین هەستی بیستنی هەر گوێیەك لەهەردوو لاکەی مێشك ناوچەی کۆنترۆڵ کردنیان هەیە لەبەرئەوە ئەگەر لایەکی مێشك نەخۆش بکەوێت ئەوا ئەو کەسە هەستی بیستنی هیچ گوێیەکی لەدەست نادات، سەبارەت بەهەستی بینین بینراوە کە ناوچەی کۆنترۆڵ کردنی نیوەی هەر چاوێك دەکەوێتە لاکەی تری مێشکەوە هەربۆیە ئەگەر لایەکی مێشکی مرۆڤ نەخۆش بکەوێت ئەوا هەستی بینین لەو نیوەی هەردووچاوەکەی کە پێچەوانەیە لەدەست دەدات.

١٠- لای هەموو کەسێك زانراوە کە ئەو کەسەی لەدایك دەبێت بەکەڕی ناتوانێت قسەش بکات یان فێری ببێت، بەڵام ئەو کەسەی کە بەکوێری لەدایك دەبێت دەتوانێت بەئاسانی فێری قسەکردن ببێت کەواتە لەدەستدانی هەستی بیستن خەتەرناك ترە وەك لەدەست دانی هەستی بینین، لەوانەیە لەبەر ئەمە بێت کە لە قورئاندا ووشەی کەڕی (صمّ) لەگەڵ ووشەی لاڵی (بکم) لەزۆر شوێندا هاتووە وپێش کوێریی (عمي) کەوتووە، وەك:

﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاَ يَرْجِعُونَ﴾ (البقرة:١٨).

﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ﴾ (البقرة:١٧١).

١١- لــەكاتی لەدەســتدانی هەســتی بینینــدا بینــراوە كــە ناوچــەكانی بیــنین لەمێشكدا هەڵدەستێت بەچەندین كرداری گرێدان ولەگەڵ ناوچەكانی تـری مێشـكدا گرێ دەدرێت بەچەندین كرداری سوودبەخش كە ئەمـە دەبێتـە هـۆی زیـاتر بـوونی توانـای مێشـك بـۆ شـت وەرگـرتن وهـەڵگرتنی زانیـاریی وزیـادبوونی زیرەكـی ئـەو كەسە، بەڵام ناوچەكانی بیستن لەمێشكدا هەڵناستن بـەم كـرداری گرێدانـە (لەبـەر هۆیـەكی نـەزانراو) لـەكاتی لەدەسـت دانـی هەسـتی بیسـتندا، هەربۆیـە بینـراوە ئەوكەسـانەی هەســتی بینینیــان لەدەســت دەدەن زۆریــان خــەڵكانی لێهــاتوو وزیرەكیــان لێدەردەچــێت، بەپێچــەوانەوە زۆر بەدەگمــەن كەســانێك هەســتی بیستنیان لەدەست بـدەن خـەڵكی لێهاتوویـان لێدەردەچێت، ئەمـەش زۆر گرنگـی پێـدان بــە بیســتن دەگەیــەنێت كــە ناوچــەكانی بیســتن لەمێشــكدا زۆر زیــاتر تایبەتمەندییان وەرگرتووە بۆ كرداری بیستن.

١٢- لێرەدا ئاماژە بەو دەوروبەرە سەرەتاییە دەدەین كە قورئانی پیرۆزی تێدا هاتەخوارەوە، ئەوكۆمەڵگایە زیاتر سروشتێكی بیستنی (سمعي) هـەبووە وەك لـە بینین چونكە شوێنێكی بیابـانی بـووە كـە زیـاتر ئاگاداركـەرەوەی بیسـتراو هەیـە، هەروەها كۆمەڵگاكە خۆی كۆمەڵگایەكی بیسـتن بـووە وەك لـەبینین وخـەڵكی ئـەو سەردەمە بەزۆری نەخوێندەوار بوون وخەڵكی تەنها لەڕێگەی بیسـتنەوە شـت فێـر دەبوون، ئایەتـەكانی قورئـان دەبیسـتران ولەبـەر دەكـران لـە سـنگەكاندا ولـەڕێی هاوەڵەكانەوە دەگەیەنران بەخەڵكی.

لەگەڵ ئەوەدا كـە نووسـەرەوەكانی قورئـان ئایەتـەكانیان دەنووسـیەوە بـەڵام تەنها لەسەردەمی پێشەوا (عثمانی كوڕی عفان)دا بەنووسراوی بەسـەر ناوچـەكانی موسوڵماناندا بڵاوكرایەوە لەوانەیە هۆكاری ئەمە ئەوە بووبێت كـە خـەڵكانێكی زۆر كـەم خوێندنــەوە ونووســینیان دەزانــی، كەواتــە لەســەردەمی هاتنــە خــوارەوەی قورئاندا بیستن زۆر لەبینین گرنگتر بووە.

١٣- خـوای پـەروەردگار هەسـتی بیسـتن وئەندامەکـەی تایبەتمەنـد کـردووە لەقورئاندا وکاتێك باسی گرنگی هەستی هەندێك لەبەنـدەکانی دەکـات باسـی گـوێ وهەستی بیستنیان دەکات، هەروەك لە:

﴿وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا﴾ (الأنعام:٢٥).

﴿يَجْعَلُونَ أَصْابِعَهُمْ فِي آذَانِهِم مِّنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ﴾ (البقرة:١٩).

﴿فَضَرَبْنَا عَلَى آذَانِهِمْ فِي الْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا﴾ (الكهف:١١).

﴿جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ﴾ (نوح:٧).

﴿لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَا أُذُنٌ وَاعِيَةٌ﴾ (الحاقة:١٢).

١٤- ﴿لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَا أُذُنٌ وَاعِيَةٌ﴾ ئەم ئایەتە پـیرۆزە ئـەوە دووپـات دەکاتەوە کە دەنگە زانیارییە بیستراوەکان بە گوێکانی مرۆڤ باشتر دەگەنە ئاستی تێگەیشتن لەو زانیارییانەی کە لە ڕێگەی ترەوە پێیدەگات وەك لە ڕێگەی بینین.

١٥- ئەو ئایەتە کەمانەی کە ووشەی بینین (بصر) تێیدا پـێش بیسـتن (سمـع) خـراوە ئەوانـەن کـە هەڕەشـەی سـزادان دەکـات بەرامبـەر تاوانـەکان یـان باسـی بێباوەڕان دەکات، ولە هیچیاندا باسـی دروسـت بـوونی ئـەم هەسـتانە، یـان باسـی گەشەکردن وکارەکانیان ناکات:

﴿وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ (الأعراف:١٧٩).

﴿وَحَسِبُواْ أَلاَّ تَكُونَ فِتْنَةٌ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ اللّهُ عَلَيْهِمْ ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٌ مِّنْهُمْ﴾ (المائدة:٧١).

﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا مَّأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ﴾ (الإسراء:٩٧).

﴿أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَا أَمْ لَهُمْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ (الأعراف:١٩٥).

١٦- سەبارەت بەزۆری ئەو زانیارییانەی لەڕێی هەستی بینینەوە وەریدەگرین بەرامبەر ئەو زانیارییانەی لەڕێی بیستنەوە بۆمان دێت دەڵێین:

زۆری گەیشتنی زانیارییە بینراوەکان ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو زانیاریانە تێگەیشتنی زۆرتر دروست دەکەن لە مێشکدا، بەڵکو زانیارییە دەنگییەکان (لەگەڵ کەمیشیاندا) بۆچوون وتێگەیشتنی زیاتر دروست دەکەن لەچاو زانیارییە ڕووناکیەکان، بۆ نموونە: ووتنی ووشەیەك بەچەند شێوازێك ولەرەلەرێکی جیاواز چەند بۆچوونێکی چیاواز بۆ بیسەر دروست دەکات، بەڵام نووسینی هەمان ووشە بەچەند رەنووسێکی جیاواز تەنها یەك بۆچوون بۆ خوێنەر دەگەیەنێت، هەروەها فیلمە بێدەنگەکان تەنها کەمێك زانیاری دەگەیەنن لەو زانیاریانەی کە فیلمە قسەکەرەکان دەیگەیەنن بە بینەر.

ئەم راستییە زانستییانە هیچ مرۆڤێك نەیزانیوە پێش ١٤سەدە وهەندێکی تەنها لەم سالآنەی دواییدا زانراون، تەنانەت هەندێك لە زانایانیش وایان دەزانی کە هەستی بینین گرنگترە لەهەستی بیستن، بەڵام توێژینەوە زانستییە نوێکان زۆرێك لەو راستیانەیان دۆزیەوە وبەشێوەیەك کە هیچ جۆرە لێڵیەکی تێدا نییە ئیعجازی زانستی ئەو ئایەتانەیان سەلماند کە بیستنیان پێش بینین خستووە، ئەویش لەبەر پێشکەوتنی بیستن لەدروست بوون وگەشەکردن وکاری ئەندامیدا ولەبەر ئەو جیاکەرەوە زۆرانەی هەستی بیستن هەیەتی بەسەر هەستی بینیندا، پاك وبێگەردی بۆ ئەوخودایەی کە دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾.

## سەرچاوەکان:


- الإعجاز العلمي في آيات السمع والبصر في القرآن الكريم:أ.د.صادق الهلالي، د.حسين اللبيدي/ لةبلآوكراوةكانى:هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة.
- آيات الله المبصرة – أ.د. توفيق علوان.
- Human Anatomy & Physiology In Health & Disease: Shirley R. Burke.

# هەستکردن بە ئازار لەنێوان قورئان وزانستی پزیشکیدا

لە چەندین سەدە لەمەوپێشەوە وتا ماوەیەکی نزیك لە ئێستا بیروباوەڕی خەڵکی وەهابوو کە هەموو ئەندامەکان وپارچەکانی لەشی مرۆڤ هەستیارە بۆ ئازار، وایاندەزانی کە لە سەری دەدەیت هەموو سەری دێشێت، ئەگەر لە چاوی بدەیت هەموو بەشەکانی چاوی ئازاریان دەبێت!!

لای هیچ کەسێك ئەوراستییە نەزانرابوو کە لە لەشدا چەند دەمارێکی تایبەت هەیە بۆ گواستنەوەی جۆرە جیاوازەکانی ئازار، تاوەکو زانستی توێکاری (علم التشریح Anatomy) پەردەی لەسەر رۆڵی تەنۆلکە هەستیار وکۆتاییە دەمارییەکانی پێست ودەمارەکان خۆیان لادا لە هەست پێکردن وگواستنەوەی جۆرە جیاوازەکانی ئازاردا.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا چەندین راستی زانستی روون دەکەینەوە کە ئەو بیروباوەڕە کۆنە هەڵدەوەشێنێتەوە وبە بەراورد کردنی ئەم راستییە زانستیانە لەگەڵ ئەوەی کە لە قورئاندا هاتووە دەربارەی پێست، وپسپۆڕیی پێست لە گواستنەوەی هەستە جیاوازەکاندا دەگەینە ئەو راستیەی کە ئەم قورئانە ووتەی خوای دروستکەری بوونەوەرە وهەر ئەویشە ئەم راستیانەی لە نیگاکەیدا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ناردووە.

با سەرەتا ئەوئایەتانە بهێنین کە باس لەم بابەتە دەکەن:

– خوای گەورە لەبارەی سزای بێباوەڕان لە رۆژی دواییدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ الْعَذَابَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ (النساء:٥٦).

- لەسەر هەمان بابەت لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَسُقُوا مَاء حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءهُمْ﴾ (محمد:١٥).

## راڤەی ئایەتەکان:

موفەسیرەکانی قورئان زۆر بەجوانی لە مانای ئەم ئایەتانە تێگەیشتبوون، بەشێوەیەك کە لێکدانەوەکانیان بۆ ئایەتە پیرۆزەکان بەهۆی دۆزینەوە زانستییە نوێکانەوە پشتڕاست کراوەتەوە.

- سەبارەت بە ئایەتی یەکەم (الطبري) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: فەرموودەی (سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا) مانای ئەوەیە کە ئێمە بێباوەڕان دەکولێنین لە ئاگری دۆزەخدا ودەیان برژێنین، (كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ) واتە هەر کاتێك پێستی لەشیان ببرژێت تا بە تەواوەتی دەسووتێت، (بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا) ئێمە پێستەکانیان بۆ دەگۆڕین بە پێستی تر غەیری ئەوپێستەیان کە سووتاوە، (لِيَذُوقُواْ الْعَذَابَ) واتە ئێمە وایان لێدەکەین بۆ ئەوەی ئازاری سزادان وپیسترین شێوەی ببینن، ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەوان لە دونیادا باوەڕیان بە ئایەتەکانی خودا نەهێناوە وپشت گوێیان خستووە وبەدرۆیان دەخستەوە.

- (الزمخشري)یش لە تەفسیرەکەیدا (الكشاف) دەڵێت: بۆ ئەوەیە کە ئەو سزایە بۆیان بەردەوام بێت ولێیان نەبڕێت.

- دەربارەی ئایەتی دووەم (القرطبي) لە تەفسیری (الجامع لأحكام القرآن)دا دەڵێت: ﴿وَسُقُوا مَاء حَمِيمًا﴾ واتە: ئاوێکی لەکوڵ وزۆر کوڵاویان بۆ دەهێنرێت، کە نزیك دەکرێتەوە لێیان دەم وچاویان دەبرژێنێت ودەبێتە هۆی وەرینی تووك وپێستی سەریان، کاتێك دەرخواردیان دەدرێت ناوسك وریخۆڵەکانیان پارچە پارچە دەکات ولە کۆمیانەوە دێتەدەرەوە.

-(الطبري) دەڵێت: ئەو کەسانەی کە لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە ئاوێکیان دەرخوارد دەدرێت کە گەیشتووەتە ئەوپەڕی گەرمیی ودەبێتە هۆی

پارچە پارچە کردنی ریخۆڵەکانیان وناوسکیان، هەردوو زانا {الشوكاني لە تەفسیری (فتح القدیر)دا وابن كثیر لە تەفسیرە بەناوبانگەکەیدا (تفسیر القرآن العظیم)} هەمان تەفسیری ئەم ئایەتەیان کردووە.

## پێست وئازاردانی بە ئاگر:




باشە دەبێت نهێنی هەست کردن لە پێستدا چی بێت؟ چۆن ئێمە هەست بە ئازار وساردیی وگەرمیی دەکەین؟ چۆن دەتوانین ئەوشتەی پەنجەی لێدەدەین یەکسەر بیناسینەوە؟ چۆن ئێمە هەست بە ئازارەکانی ناو لەشمان دەکەین؟

راستییە زانستیەکان لەم بارەوە چەند ساڵێکی کەم دەبێت دۆزراونەتەوە، ئەویش لە رێی هەردوو زانستی توێکاری وزانستێکی نوێتر کە پێیدەوترێت شانەزانی (علم الأنسجة Histology).

کە پاش دۆزینەوەی ووردبینە زۆر بەهێزەکان نهێنیەکانی پێست وژێر پێستی مرۆڤ لەرێی ئەم زانستەوە بۆمان ئاشکرا بووە، ومیکانیزمی هەست کردنی لە پێستدا بۆ روون کردووینەتەوە.

## راستییە زانستیەکان دەربارەی پێست:

پێستی مرۆڤ لە ٢ چینی سەرەکی شانە (چینی سەرەوە یان چینی ڕوویی Epidermis، وچینی خوارەوە Dermis) وچینێکی هاوپێچ لەژێریانەوە (Subcutaneous Layer) یان چینی (Hypodermis) پێك هاتووە.



تركيب الجلد

پێستی مرۆڤ شانەکانی ناوەوە دەپارێزێت لە ووشکبوونەوە یان لەدەستچوون وفەوتانی شلەمەنی، هەروەها جەستە دەپارێزێت لە ماددە زیانبەخشەکان و لە گۆڕانکارییەکانی پلەی گەرمیش.

بەشی خوارەوەی پێست ئەم پێکهاتانەی تێدایە: ئەو ڕژێنانەی ئارەق دەردەدەن یان ئارەقە ڕژێنەکان (sweat glands). لوولەکانی خوێن، کۆتاییە دەمارییەکان یان هەستەوەرەکان (sensory receptors) وبنی موووەکان ونینۆکەکان، هەریەکێك لە پێکهاتەکانی پێست بە کارێکی گرنگ هەڵدەستێت بۆ پاراستنی لەش وبارە ئاساییەکەی.

ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە لە پێکهاتەکانی پێست بریتین لە کۆتاییە دەمارییەکان، وخانە وتەنۆلکەکانی هەستکردن لە پێستدا، کە وەك زەنگی ئاگادار کەرەوەن بۆ لەش لەهەر بارێکی نائاسایی.

هەروەك ئاماژەمان پێدا لەمرۆڤدا دەرکەوتووە کە هەستکردن لە پێستدا بەهۆی تۆڕێکی بەربڵاو لە کۆتاییە دەمارییەکانەوە دەبێت، کە لە کۆتاییەکانیاندا چەندین

جۆر خانە وتەنۆلکە هەیە، کە هەر یەکێکیان تایبەتن بە جۆرێکی دیاریکراو لە هەستکردن، ئەمانە پێیان دەووترێت سەنتەرەکانی هەستکردن لەپێستدا.

ئەگەر بڕوانینە نەخشەی پێکهاتنی پێست دەسەڵاتی گەورەی پەروەردگارمان بۆ دەردەکەوێت، سەرەتا لە رەنگینی شێوەکەی کە بۆمان روون دەکاتەوە چۆن هەستە دەمارەکان دابەشبوون لە پێستی مرۆڤدا، دەبینین کە نزیکەی ١٥جۆر سەنتەری جیاواز بۆ هەمووجۆرەکانی هەستی دەماریی دۆزراونەتەوە لەلایەن پزیشکان وزانایانی توێکاریەوە، کە هەندێکیان بەناوی ئەو زانایەوە ناونراوە کە یەکەمجار دۆزیویەتەوە، شێوەی ئەم تەنۆلکانە زۆر جیاواز وتایبەتین: هەندێکیان لە شێوەی سەبەتەدان، وهی تریان لە شێوەی کۆمەڵێك هێڵی یەك سەنتەردان وەك شێوەی پیاز، یان لەگەڵ کۆتاییە دەماریەکاندا درێژ بوونەتەوە.




زانایان هەست کردنیان لەلایەن مرۆڤەوە بەهۆی ئەم تەنۆلکانەوە دابەش کردووە بۆ ٣ ئاست:

أ- هەست کردنی سەر روویی (سطحي).

ب- هەستی قووڵ.

ج- هەستی تێکەڵاو (مرکب).

هەستی سەر رووی پێست (سطحي) چوار جۆرە:

١- بەرکەوتن وپەستان.

٢- ئازار.

٣- هەستکردن بە گەرمیی.

٤- هەست کردن بە ساردیی.

هەستی قووڵیش تایبەتە بە جومگە وماسولکەکان وبریتییە لە هەستەکانی:

- هەستکردن بە باری لەش (Proprioception).

- ئازاری قووڵی ماسولکەکان.

- هەستکردن بە لەرینەوە (Pallesthenia).

میکانیزمی هەستکردن وبەیەکەوە کارکردن لە هەردوو هەستەکەدا (روویی وقووڵی یان هەستی تێکەڵاو) بریتییە لە ناسینەوە وناونانی شتە ناسراوەکان وئەوانەی دەخرێنە ناودەستەوە، واتە هەستی ناسینەوەی شتەکان بەدەست لێدانیان (Stereognosis).

هەروەها توانای دیاریکردنی شوێنی بەرکەوتن لەسەر پێست، هەستی بەرکەوتنیش واتە ناسینەوەی تەنەکان بە دەست لێدانیان، بۆ ئەم هەستەیان دەبێت توێکڵی مێشك سەلامەت بێت بۆ ئەوەی بوونی هەبێت و رووبدات.

## خانەکان وتەنۆلکەکانی هەستکردن بە گۆڕانکاییە ژینگەییەکان لە پێستدا:

وەك پێشتر باسمان کرد چەند تەنۆلکەیەك وخانەی تایبەت هەیە بۆ دۆزینەوە وهەست کردن بە گۆڕانکارییەکان لە ژینگەی مرۆڤدا کە پێیان دەووترێت (وەرگرەکان) یان هەست پێکەرەکان (Receptors)، کە دابەش دەکرێن بۆ ئەم بەشانە: **بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە** (٤١٥-٤١٦)

- ئەو خانانەی بە دەوروبەر کاریان تێدەکرێت (Extroceptors): ئەمانە تایبەتن بە هەستی بەرکەوتن (واتە هەستکردن بە دەست لێدان)، وبریتین لە:

تەنۆلکـــەکانی میســـنەر (Meissner's Corpuscles) کـــە زۆر بـــڵاون، وخانـەکانی میرکـل (Merkles Corpuscles) کـە ئەمانـە زیـاتر لـە شـوێنە بێمووەکاندا هەن، وەك سەرە پەنجەکان ولێوەکان.

- تەنۆلکـــەکانی پاسـینی (Pacinian corpuscles) کـە زیـاتر لـەو شوێنانەدان کە قورسییان لەسەرە وەك ناو لەپی دەست وناوەوەی پێ، شـێوەیان وەك پیـاز وایـە وتایبـەتن بـە گواسـتنەوەی هەسـت بـە پەسـتان ولەرینـەوە، ئـەم تەنۆلکانـە هـەموویان بەگشـتی ژمارەیـان دەگاتـە زیـاتر لـە ٥٠٠،٠٠٠ لەسـەر رووی هەموو لەش.

- خانــەکانی مووەکــان وتەنۆلکــە کۆتاییــەکانی کــروز (Crause End Bulbs) وهـەروەها تەنۆلکـەکانی تومسـا، ئەمانـە تایبـەتن بـە هەسـتکردن بـە ساردیی.

- قووچـەکەکان یـان لوولـەکانی رووفینـی (Ruffini's Cylinders): کـە تایبەتن بە هەستکردن بـە گـەرمیی، ژمـارەی ئـەم تەنۆلکانـەش دەگاتـە زیـاتر لـە (٢٠٠٠٠) لە هەموو رووی لەشدا.



- تەنۆلکەکانی گۆلجی (Golgi Corpuscles): کە لەناو جومگە وماسولکەدا هەن وهەستە قووڵەکان دەگوێزنەوە.

- کۆتاییە دەمارییە هەستیەکان یان کۆتاییە دەمارییە بەرەڵاکان (کە تۆڕێکی ئالۆز پێك دەهێنن وپێیان دەووترێت تۆڕی لانگەرهانس Langerhans) کە بۆ هەستکردنە بە ئازار، ئەم کۆتاییە دەمارییانە زۆر بەربڵاو وزۆرن لەسەر رووی پێست، کە بینراوە ژمارەیان دەگاتە (٣-٥ ملیۆن) لە هەموو رووبەری پێستدا.

لێرەوە دەتوانین بڵێین کە پێستی مرۆڤ بریتیە لە رووپۆشێك کە تۆڕێکی ناکۆتا لە ریشاڵ وکۆتاییە دەماریەکان دادەپۆشێت، وپێستی مرۆڤ نەخشە وخەریتەیەکی سەرسوڕهێنەرە لە یەکتر برینی ئەودەمارانەی کە کۆنترۆڵی دەکەن، ئەوەتا ٦٢ دەمار کۆنترۆڵی هەموولەش دەکەن (بێجگە لە دەمارە مێشکیەکان)، وهەستەکانیان لێوە کۆدەکەنەوە و بۆ مێشکی دەگوێزنەوە.

لە مێشکیش خۆیەوە راستەوخۆ ١٤ دەمار دەردەچن کە دەمارە مێشکی (یان سەرییەکانن)، کەواتە کۆی گشتی ٧٦ دەمارن کە کۆنترۆڵی رووبەرەکانی هەست دەکەن لە لەشی مرۆڤدا.

لە لایەکی ترەوە زانستی توێکاری سەلماندوویەتی کە کۆتاییە دەمارییەکان وریشاڵە دەماریەکانی تایبەت بە گواستنەوەی ئازار وهەست بە گەرمیی زۆر لەیەکەوە نزیکن، هەروەها روونیشی کردۆتەوە ئەو رێگەیەی دەیبڕن بۆ سەرەوە هەمان رێگەیە، ئەم دەمارانە لە پێستەوە دەڕۆن تا دەگەنە درکە پەتکی ناو بڕبڕەی پشت (النخاع الشوکی Spinal Cord)، ولەوێوە بۆ مێشکۆکە (المخیخ Cerebellum) وپاشان بۆ مێشکی ناوەڕاست (Mid Brain)، ولە کۆتاییدا بۆ توێکڵی مێشك، لەمانەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پێست گرنگترین بەشی لەشە بۆ هەست کردن بە ئازار وگەرمیی، لەبەرئەوەی کە زۆر دەوڵەمەندە بەو کۆتاییە دەماریانەی کە هەستەکانی ئازار وگەرمیی دەگوێزنەوە.



ئەم هێڵکارییانە ئەو دەمارانەی کۆنترۆڵی هەموو چالاکییەکانی لەش و هەستەکان دەکەن دەردەخات







شكل رقم (٣)
القسم المركزي والمحيطي للجهاز العصبي حيث يتكون الجهاز العصبي المركزي من الدماغ والحبل الشوكي، ويتكون الجهاز العصبي المحيطي من الأعصاب القحفية والشوكية.

## هەست كردن بە گەرمیی وساردیی:

بەهۆی ئەوتەنۆلكانەی كە هەستەكانی ساردیی وگەرمیی دەگوێزنەوە هاوسەنگیی لە پلەی گەرمیی لەشدا روودەدات، كە لە پلەیەكی دیاریكراودا دەمێنێتەوە (كە بە ناوەندیی بریتییە لە ٣٧ پلەی سەدی)، ئەگەر بێتو پلەی گەرمی لەش دابەزێت بۆ ٣٥ پلەی سەدی ئەوا سەرەتا ئەو تەنۆلكانەی هەستیارن بۆ ساردیی هاوار وئاماژەی مەترسی دەنێرن، ومێشكی مرۆڤ ولەم بارە ئاگادار دەكەن، ئەگەر ئەم باری ساردبوونەوەیە بەردەوام بێت وهاوارەكان وەڵامی نەبێت، ئەوا ووردە ووردە لەش دەچێتە حاڵەتێكی سڕبوون ونەمانی هەستەوە.

لەلایەكی ترەوە ئەگەر پلەی گەرمی لەش وپێست بەرزبێتەوە لە ئاستی ئاسایی خۆی بە هۆی دووچار بوونی مرۆڤ بۆ سەرچاوەیەكی گەرمی یان ئاگر، سەرەتا مرۆڤ هەست بە ناڕەحەتی دەكات، پاشان ئازار پەیدا دەبێت كە ووردە ووردە زیاد دەكات تا دەگاتە ئەوپەڕی وبەرزترین پلەی ئازار، كە بینراوە ناڕەحەترین ئازار لەكاتی سووتانە روویی (سەطحی)یەكاندا دەبێت، بە زیادبوونی پلەی سووتانەكە ئازارەكەی ووردە ووردە دەوەستێت لەو ئاستەدا وزیاتر نابێت، بەڵكوبە هێواشی بەرەونەمان دەڕوات، تەنانەت ئەگەر هەموو پێستیش بسووتێت وببێت بە خەڵووز ئیتر ئازار نامێنێت.

## پلەكانی سووتانی پێست وجۆرەكانی:

زانایان وپزیشكان پلەكانی سووتان دابەش دەكەن بۆ ٤ پلەی سەرەكی، ئەم پلانە بەپێی ئەوچینانەی پێست كە دەسووتێت دیاری دەكرێت وتا سووتانەكە قووڵتر بێت پلەی سووتانەكە زیاد دەكات، ئەگەر سەیری پێستی مرۆڤ بكەین لەكاتی هەر یەكێك لەم سووتانانەدا، دەبینین لە سووتانی پلە یەكدا تەنها چینە ووشكەكەی بەشی سەرەوەی پێست دەگرێتەوە ولەسەر شێوەی هەوكردنێكی

پێست دەردەکەوێت، لەم سووتانەدا هەڵئاوسان وئازارێکی کەم روودەدات لەبەرئەوەی سووتانەکە پلە یەکە وتەنها خانەکانی رووی دەرەوەی پێست دەگرێتەوە، ئەوەش ئاشکرایە کە ئەم سوور بوونەوە وهەڵئاوسان وئازارە دوای ۲ تا ۳ رۆژ نامێنێت. **بڕوانە وێنەکانی لاپەڕە ( ٤١٦ )**

ئەگەر یەکسەر باسی سووتانی پلە سێ بکەین دەبینین کە هەموو چینەکانی پێست دەگرێتەوە ولەوانەیە شانەکانی ژێرەوەش وەك ماسولکە وئێسکیش بگرێتەوە، لێرەدا پێست نەرمی ولاستیکیی لە دەست دەدات وووشك ورەق دەبێت، لەم حاڵەتەدا نەخۆشەکە زۆر هەست بە ئازار ناکات لەبەرئەوەی کۆتاییە دەماریەکان وتەنۆلکەکانی هەستکردن زوربەیان لەناوچوون بەهۆی سووتانەوە.

ئەگەر بچینە سەر پلەی چوارەمی سووتان، ئەم پلەیە پێی دەووترێت بوون بەخەڵوز (التفحم)، کە هەروەك لە ناوەکەیەوە دیارە پێستی مرۆڤ وەك خەڵوزی لێدێت، لەم حاڵەتەشدا نەخۆش هەست بەهیچ ئازار وهەستێکی تر ناکات لەو بەشەی پێستیدا، لەبەرئەوەی هەموو تەنۆلکەکان وکۆتاییە دەمارەکان بە تەواوەتی لەناوچوون.

ئێستاش با بگەڕێینەوە بۆ سووتان لە پلەی دووەم، ئەم پلەیە دەکرێت بە ۲ بەشەوە:

١- روویی (سطحي).

٢- قووڵ.

لە حاڵەتی سووتانی روویی پلە دوودا چینی سەرەوەی پێست (رووی پێست) دەکولێت وهەروەها چینی ژێرەوەش (ناوەوەی پێست) کە لەژێر چینی سەرەوەدایە، لەم حاڵەتەدا هەردوو چینەکەی پێست لەیەك جیادەبنەوە وچەندین دەردراو وپالآوتە لە نێوانیاندا کۆدەبنەوە، لەژێر چینی سەرەوەدا بلّق دروست دەبن، کە پڕن لە شلەیەك کە لە شلەمەنی یان پلازمای خوێن دەچێت، نەخۆشەکە

لـەم جـۆرە سـووتانەدا ئـازارێکی یـەکجار زۆر دەچـێژێت ودەتلێتـەوە پێیـەوە وهەروەها هەستیاریشی بۆ ئازار زۆر دەبێت، ئەمانـەش بـەهۆی هـەژانی کۆتاییـە دەماریە دەرکەوتووەکانـەوە دەبێت، لێرەدا چاکبوونەوە ویەکبوونـەوەی پێسـت زیاتر لە ٢ هەفتە دەخایەنێت بـەهۆی ئـەوکرداری نـوێ بوونـەوە وجێگرتنەوەیـەی شانە فەوتاوەکان کە لە پێستدا روودەدات.

## ئەم وێنانە پلەکانی سووتانی پێست ڕووندەکەنەوە:



# ناوسك وسزاى رۆژى دوايى

هــەروەك چـۆن بێبـاوەڕان لــە دۆزەخـدا تووشــى ســزاى ئـاگر دەبـن لــەرووى دەرەوەى لەشيان ولەرێى پێستيان، بە هەمان شێوە تووشى سـزايەكى نـاوەكيش دەبن كە لە جۆرێكى ترە، ئەويش لەرێى دەرخواردانيان بە ئاوێكى ئەوەندە كـوڵاو كـە ئـەويش وەك ئـاگر وايــە، كاتێـك كـە لێيـان نزيـك دەكرێتــەوە دەم وچـاويان دەبرژێنێت وپێستى سەريان هەڵدەوەرێنێت وكە دەيخۆنەوە ناوسك وريخۆڵەكانيان پارچە پارچە دەكات ولە كۆميانەوە دێتە دەرێ، خواى پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿وَسُقُوا مَاء حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءهُمْ﴾ (محمد:١٥).

زانسـتى توێكـارى وشـانەزانى بۆيـان روون كردووينەتـەوە كـە ريخۆڵـە باريكـە درێژترين بەشى كۆئەندامى هەرسى مرۆڤە (درێژييەكەى دەگاتە نزيكەى ٦مەتر).

بۆشايى ناوسكى مرۆڤ بە گشتى ناوپۆش كراوە بـە پەردەيـەك كـە ناسـراوە بـە پريتۆن (Peritoneum)، كە قەبارەكەى دەگاتە (٢٠٤٠٠ سم سێجا) و يەكسانە بە هەمان قەبارەى پێستى دەرەوەى مرۆڤ، ئەم پريتۆنەش لە ٢ بەش پێكهـاتووە: بەشێكيان ناوپۆشى هەموو ديوارى ناوسكى كردووە وناسراوە بە پريتـۆنى ديـوارى يان دەرەوە (Parietal Peritoneum)،بەشەكەى تريش ئەندامەكانى ناوسكى داپۆشيوە وناسراوە بە پريتۆنى ناوەوە (Visceral Peritoneum)، پريتۆنى ديوارى زۆر هەستيارە چونكە پڕە لە تەنۆلكەكانى هەست كردن بە ئازار وكۆتاييـە دەمارەكان، كاتێك كە دەهەژێنرێت ئازارێكى زۆر قورس وبەهێز دروست دەكات.

بە پێچەوانەوە پريتۆنى ناوەوە زۆر كەمتر ئەم كۆتاييە دەمارييانەى تێدايە وكە دەهــەژێنرێت ئـازارێكى نەناسـراو دروسـت دەكـات، لــە نێـوان پريتـۆنى ديـوارى و رووپۆشــى ريخۆڵەكانـدا پێكهاتەيـەكى پـەردەيى تـر هەيـە كـە پێـى دەووترێـت مێــزەنترى (Mesentery) كــە لــە ناويــدا ژمارەيــەكى زۆر لــە تەنۆلكــە

هەستیارەکانی پاسینی (Pacinian corpuscles)ی تێدایە، هەروەها وەرگرەکانی ئازار (Pain Receptors) ویەکە هەستییەکان کە تەنیا لە پریتۆنی ناوپۆشی هەناودا هەیە (بە تایبەتی پریتۆنی دیواری)، هەمان ئەوانەن کە لە پێستدا هەن بەڵام لەگەڵ جیاوازی لە دابەشبوونیاندا، بە تایبەتی یەکەکانی هەستیار بۆ ئازار وگەرمیی لە پریتۆنی دیواریدا، هەر بۆیە کاتێك کە دیواری سك سڕدەکرێت بە بەنجێکی مەوزیعی و بۆشایی سك دەکرێتەوە، ئەگەر ریخۆڵەکان دەربهێنین یان تەنانەت پارچە پارچەیان بکەین یان بیانسووتێنین ئەو کەسە هیچ ئازارێك یان هەست بە ناڕەحەتی ناکات، چونکە وەك باسمان کرد هەستەوەرەکان بۆ ئازار لەناو ئەندامەکانی سکدا نین.

بەڵام کاتێك کە ریخۆڵەکان پارچە پارچە دەبن بە هۆی خواردنەوەی ئاوی لەکوڵ یان ئاوی (حەمیم)، ئەم ئاوە زۆر گەرمە لە ریخۆڵەکانەوە دەگاتە بۆشایی ناوسك وپاشان پەردەکانی پریتۆن ومێزەنتری کە دەوڵەمەندن بە کۆتاییە دەماریە هەستەوەرەکان بۆ ئازار، لێرەدا دەبنە هۆی ئاگادار کردنەوە و وروژاندیان، ودواتر دروست کردنی سکنێشە وئازارێکی ئێجگار زۆر، کە ئەو کەسە پێوەی دەتلێتەوە، کە لە دونیادا لەوانەیە ببێتەهۆی گیان لەدەستدان، بەڵام لە دوارۆژدا مردن نییە، لێرەدا ئازاری ئەو ئاوە داخبووە دەگاتە ئەوپەڕی.

## رووەکانی ئیعجازی ئایەتەکان:

١- خوای گەورە بۆی روون کردووینەتەوە کە پێست شوێنی هەستکردنە بە ئازار ئەویش بەوەی پەروەردگار پێستی بەستووەتەوە بە هەستکردن بە ئازارەوە لە ئایەتی: ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ الْعَذَابَ﴾، لێرەوە روونده‌بێتەوە کە پێست بریتییە لە هۆکاری هەستکردن بە ئازار بۆ بێباوەڕان لە دۆزەخدا، وکاتێك کە پێستیان دەبرژێت ودەسووتێت وپێکهاتنەکەی وئەرکەکەی لەدەست دەدات، سەرەنجام هەست کردن بە ئازار نامێنێت.

هەر بۆیە خوای گەورە ئەم پێستە فەوتاوەیان بۆ دەگۆڕێت بە پێستێکی نوێ لە پێکهاتن وئەرکەکانیدا، کە کۆتاییە دەمارییەکانی (کە تایبەتن بە هەستی ئازار وگەرمیی) ئەم پێستە نوێیە هەڵدەستن بە ئەرکەکانیان لە دروست کردنی ئەم ئازارە جەرگ بڕانەدا، ئەمەش هەمووی بۆ ئەوەیە کە ئەو بێباوەڕانە بەردەوام بن لە ئازار چەشتندا.

هەروەها زانستی نوێش بۆی روون کردووینەتەوە کە کۆتاییە دەمارییەکان وتەنۆلکەکانی تایبەت بە هەست کردن بە ئازاری گەرمی وسووتان تەنیا لە پێستدا بە شێوەیەکی چڕ کۆبوونەتەوە.

هیچ مرۆڤێك نەیدەتوانی پێش دۆزینەوەی ووردبین وپێشکەوتنی زانستی توێکاری لە پێش ١٤سەدە لەمەوبەر ئەم راستیانە بزانێت، لێرەوە موعجیزەکە ئاشکرا دەبێت وبەڵگەکانی پەروەردگار دەردەکەون بەروونی.

٢- قورئانی پیرۆز هەڕەشە لە کافران دەکات بە سزادانیان بە ئاوی (حەمیم) بەوەی کە ناوسك وریخۆڵەکانیان پارچە پارچە دەکات، نهێنی ئەم هەڕەشەیە لەم دواییانەدا روون بۆتەوە بە دۆزینەوەی ئەوەی کە ریخۆڵەکان هەست بە گەرمی ناکەن، بەڵام کاتێك کە پارچە دەبن ئاوە کوڵاوەکە دەڕژێتە ناوسك وبەر پریتۆنی دیواری دەکەوێت کە زۆر هەستیارە بۆ ئازاری گەرمیی وسووتان ودەبێتە هۆی دروست بوونی بەرزترین پلەی ئازار وبەردەوام بوونی، بەڵام لە پێستدا بەم شێوەیە نییە، چونکە بەردەوام بوونی هەست بە ئازار بەندە بە نوێ بوونەوەی پێست دوای برژان ولەناوچوونی.

جیاوازی ئەو وەسفەی کە قورئان کردوێتی بۆ دروستبوونی ئازار بە ئاگر، کە لە دەرەوە بەهۆی گۆڕین ونوێ بوونەوەی پێست دوای برژانی ولە ناوەوە بە پارچە پارچە کردنی ریخۆڵەکان بە ئاوی کوڵاو زۆر گونجاوە ولە شوێنی خۆیدایە، وبە تەواوەتی یەکدەگرێتەوە لەگەڵ راستییە زانستیە دۆزراوەکانی ئەم ٢ بوارە

لەمرۆدا، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە قورئان ووتەی ئەو خودا زانا وبەدەسەڵاتەیە کە هەموو نهێنیەکان و ووردەکارییەکانی دروستبوونی مرۆڤ دەزانێت، چونکە هەر ئەوە بەدیهێنەری ئەو مرۆڤەیە.

لێرەدا بە تەواوەتی ئیعجازی زانستیی قورئان لە باس کردنی هەست کردن بە ئازار بە پشتیوانی راستییە زانستیە پزیشکیەکان ئاشکرا دەبێت و وەك خۆر دەدرەوشێتەوە.

## سەرچاوەکانی ئەم بابەتە وبابەتەکەی پێشتر:


- تەفسیرەکانی: الطبري، الزمخشري، القرطبي، إبن كثير، الشوكاني.
- کتێبی: الإعجاز العلمي في الإرتفاعات العالية والإحساس بالألم: دەرکراوی (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة).
- گۆڤاری:(الإعجاز)/ ژمارە ٢ی ساڵی (١٤١٧ك - ١٩٩٦ن)/ دەرکراوی: (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة).
- الطب محراب للإيمان (١-٢): د.خالص جلبي كنجو.
- ئینتەرنێت: www.tasabeeh.com

- Bailey & Love's: Short Practice of Surgery، 21st Edition، 1991، Chapman Hall، UK.
- Andrews' Diseases of the skin، 1982، W.B. Saunders، USA.
- Encyclopedia Britannica - 2009 .

# موعجیزەی داری زەیتون و ڕۆنەکەی
# لە قورئان وسوننەتدا

خـوای گـەورە لـە قورئـانی پـیرۆزدا لەبـەر پـیرۆزی داری زەیتـوون سـوێندی پێدەخوات کە دەفـەرموێت: ﴿وَالـتِّينِ وَالزَّيْتُـونِ﴾ (الـتين:١) واتـە: سـوێندبێت بـە هەنجیر و زەیتون.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا بە ئاشکرا باسـی پیرۆزیـی داری زەیتـوون دەکـات و دەفەرموێت: ﴿شَجَرَةٍ مُّبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ﴾ (النور:٣٥) واتـە: لـە دارێکـی پـیرۆزەوە کـە داری زەیتوون.

لە ئایەتێکی تردا دەربارەی ئەم داری زەیتونە هاتووە: ﴿وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاء تَنبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ﴾ (المؤمنـون:٢٠) واتـە: هـەروەها ڕوواندومانـە جۆرە دارێك (کە زەیتوونە) کە لە تـوری سـینا دەڕوێ و ڕۆن و پێخورێـك دەگرێـت بۆ ئەوانەی دەیخۆن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ نُـورُ السَّـمَاوَاتِ وَالْـأَرْضِ مَثَـلُ نُـورِهِ كَمِشْـكَاةٍ فِيهَـا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِـي زُجَاجَـةٍ الزُّجَاجَـةُ كَأَنَّهَـا كَوْكَـبٌ دُرِّيٌّ يُوقَـدُ مِـن شَـجَرَةٍ مُّبَارَكَـةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ نُّورٌ عَلَى نُـورٍ يَهْـدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَن يَشَاءُ وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ (النـور:٣٥) واتە: خودا ڕووناککەرەوەی ئاسمان و زەویە، وێنەی ڕووناککردنـەوەی خـودا وەك تاقێك وایە کە چـرایەکی تێـدابێت و ئـەو چـرایەش لـەناو شووشـەیەکدا بێـت، ئـەو شوشەیەش وەك ئەستێرەیەکی گەش وپرشنگدار بێت، ئەو چـرایە دائەگیرسـێ بـە ڕۆنی درەختێکی زەیتوونی بەفەڕ و بەرەکەت کە نە ڕۆژهەڵاتی بێت و نە ڕۆژئاوایی بێت، ڕۆنەکەی نزیکە داگیرسێت با ئاگریشی بەرنەکـەوێت، ئەمـە ڕووناکیـە لەسـەر ڕووناکی (ڕوونـاکی زەیـت و ڕوونـاکی ئـاگر)، خـودا هەرکەسـێکی بوێـت ڕێنمـوویی

دەكات بۆلای رووناكی ئایینی خۆی وخودا چەندین نموونە دەهێنێتەوە بۆ خەڵكی و خودا زانا و ئاگادارە بە هەموو شتێك.



ووشـــەی پـــیرۆز (مبـــارك ومباركـة ومباركـا) لـە قورئـانی پـیرۆزدا لــە چــەندین شـوێندا هـاتووە، پـەروەردگار هەنـدێك شتی تایبەتمەنـد كـردووە بـەم پیرۆزیـی وبەرەكەتــە، لەوانــە قورئـــان وكتێبـــەكانی خـــودا، لەوانەیە پیرۆزیـی لـە كـات یـان شـوێنێكی دیـاریكراو یـان لـە دروســتكراوێكی خــوادا بێــت، لەكاتـدا وەك ووتـەی پـەروەردگار: ﴿إنـا أنزلنـاه في ليلـة مباركـة إنـا كنـا منـذرين﴾ (الـدخان:٣) واتــە: ئێمــە لــە شــەوێكی پــیرۆزدا قورئانمــان دابەزانــدووە بــۆ ئاگاداركردنەوەی مەردومان.

یان پیرۆزیی لەشوێندا وەك ووتەی پـەروەردگار: ﴿سبحان الـذي اسری بعبـده ليلا من المسجد الحرام إلى المسجد الأقصى الذي باركنا حوله لنريـه مـن آياتنـا إنـه هو السميع البصير﴾ (الإسراء:١) واتە: پاك وبێگەردیی بۆ ئـەو زاتـەی شـەورەویی كرد بە بەندەی خۆی لە شەوێكدا لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگـەوتی ئەقسا كـە دەوروبـەریمان پـیرۆز كـردووە بـۆ ئـەوەی هەنـدێك لـە بەڵگـە ونیشـانە روونـەكانی خۆمانی نیشان بدەین، لەوانەشە پیرۆزیی لە دروستكراوێكی خوادا بێت (واتە خێـر وسوودی زۆری هەبێت)، وەك داری زەیتون لە فەرموودەی پـەروەردگاردا: ﴿يُوقَـدُ من شَجَرَةٍ مُّبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَـوْ لَـمْ تَمْسَسْـهُ نَـارٌ نُّورٌ عَلَى نُورٍ﴾.

لێرەدا خوای گەورە ئاماژە بە دیاردەی (Flourescency) دەدات واتە دیاردەی فسفۆری و تیشکدانەوەی خۆیی رووناکی، کە دەفەرموێت ﴿يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ﴾ واتە رۆنەکە رووناکی دەداتەوە بەبێئەوەی ئاگر یان سەرچاوەی رووناکی بەریکەوێت، کەواتە لەخۆیەوە رووناکی دەردەکات وەك ماددەی فسفۆری، تۆ بڵێی رووەکی زەیتون ماددەی فسفۆریی تێدابێت؟

لە لێکۆڵینەوەیەکی هاوبەشدا لەلایەن: (أ. د. عبد المجيد بلعابد) مامۆستای زانکۆی (محمد الأول – كلية العلوم وجدة – المملكة المغربية) و(الصابوني ابراهيم) لە زانکۆی (غرناطة– إسبانيا) کە لە ساڵی (٢٠٠٤)دا ئەنجامیاندا لە هەردوو وڵاتی مەغریب و ئیسپانیادا، هەستان بەجیاکردنەوە و گەشەپێکردنی دەنکۆڵەکانی پیتاندن (حبيبات اللقاح)ی وەرگیراو لە گوڵی زەیتوون، لە ناوەندێکی گەشەپێکردنی دەستکرددا کە پێکهاتبوو لە خوێی کانزایی پێویست و ڤیتامینەکان و هۆرمۆنە رووەکیەکانی گەشەکردن، بینییان کە دەنکۆڵەکانی پیتاندن لەناو گوڵەکانی داری زەیتووندا (کە لەناو زەیتی زەیتوونیشدا هەیە) دەورەدراون بە چەند ووردیلەیەکی فۆسفۆری {**وەك لە وێنە رەنگاورەنگەکانی لاپەڕە (٤١٧-٤١٨)دا روونکراوەتەوە**} کە لە هیچ رووەکێکی تردا ئەمە نابینرێت.

بەڕاستی دەرخەرێکی جوانی راستیەکانی ئایەتە پیرۆزەکانە، کە لە بنچینەی زەیتی زەیتوون کە بەرەکەیەتی (ئەم بەرەش لە ئەنجامی پیتاندنی دەنکۆڵەکانی پیتاندنەوە بۆ هێلکۆکەی رووەکەکەوە دروست دەبێت) ئەم دیاردە سەرنجراکێشە دەبینین، کە لە هیچ دار و رووەکێکی تردا نەبینراوە.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:﴿كُلُوا الزَّيْتَ وَ أدْهِنُوا بِهِ فَإنَّهُ مِن شَجَرَةٍ مُبارَكَة﴾ (رواه أحمد والترمذي والنسائي وقال الحاكم صحيح الإسناد و وافقه الذهبي) واتە: ئێوە لە زەیتی زەیتوون بخۆن و خۆتانی پێچەور بکەن لەبەرئەوەی لە دارێکی پیرۆزەوەیە، یان دەفەرموێت: ﴿ائتدموا بالزيت وأدهنوا به فإنه من شجرة مباركة﴾

(رواه ابن ماجة والحاكم وصححه وعبدالرزاق في المصنف) واتـه: زەيتـی زەيتـوون بكەن بـە پێخـور و خۆتـانی پێچـەور بكـەن لەبەرئـەوەی لـە دارێكـی پیرۆزەوەيـە، هەروەها: ﴿كلوا الزيت فإنه مبارك وائتدموا بـه وادهنـوا بـه فإنـه يخـرج مـن شـجرة مباركـة﴾ (حـديث حسـن رواه الـدارمي) واتـە: ئێـوە ئـەو زەيتـی زەيتوونـە بخـۆن لەبەرئەوەی پیرۆزە و بیکەن بە پێخۆر و خۆتانی پێچـەور بکـەن (واتـە بیـدەن لـە پێستتان) لەبەرئەوەی لە دارێکی پیرۆزەوەیە.

داری زەیتون بریتییە لە رووەکێکی سەوز، ناوە زانستییەکەی بریتییە لە (أولیا یوروپیا Olea europaea)، زیـاتر لـە ٨٠٠ ملیـۆن داری زەیتـوون لـە جیهانـدا هەیە کە ٩٨٪ی ئەم دارانە دەکەوێتە ناوچەی دەریای ناوەراستەوە.



داری زەیتون زیاتر لە ١٤٠٠ساڵ دەژی وبەر دەگرێت، گوڵەکانی سپی و زەردن، هەر بە سەوزی بەرەکانی کۆدەکرێتەوە پێش پێگەیشتن، یـاخود وازی لێـدەهێنرێ لەسـەر رووەکەکـە هـەتاکو پێـدەگا و دەگـۆڕێ بـۆ رەنگـی (وەنەوشـەیی) پاشـان دەبێتە رەش، چاکترین جۆرەکانی زەیتی زەیتون بریتین لەزەیتی تونس وسوریا.

## زەیتوون لەرووی شیکاریی کیمیاییەوە:

٦٧٪ی پێکهـاتووە لـە ئـاو و ٢٣٪ی بریتیـە لـە چـەوری و ٥٪ی پرۆتینــە و ٣٪کاربۆهیـدرات و ١٪ی بریتیـە لـە خـوێی کانزاکـانی وەك: کالیسـیۆم و ئاسـن و پۆتاسـیۆم و صـۆدیۆم و مەگنیسـیۆم و فۆسـفۆر و مـس و گـۆگرد، هــەروەها ڤیتامینەکانی (A،B ،C ،D ،E )ی تێدایە بەرێژەی جیاواز.

زەیتـی زەیتـوون (Olive Oil) لـە گلیسـریدات و ترشـەلۆکی چـەوریی نـاتێر پێکهاتووە کە خاوەنی یەك بۆندی کاربۆنی ناتێرە لە گەردیلـەی سـێیەمی کـاربۆن (بۆیـە پێیـدەووترێت: Omega 3) ئەمـە وای لێـدەکات توانـای بـۆ ئۆکسـان زۆر کەمبێت و دەبێتە هۆی پاراستنی زەیتەکە لە تێکچوون و خراپبوون، بە رێژەیەکی زۆر بریتیە لە ترشـە چـەوری ئۆلیـك (Oleic acid) و لانۆلیـك (Lanolic) کـە نزیکەی ٨٣٪ ی رۆنی زەیتوون پێکدەهێنێت، هەروەها چەندین ماددەی تر.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کـە زەیتـی زەیتـوون خـۆراکێکی تـەواوە و هــەموو پێکهاتـە سـەرەکیەکانی تێدایـە بۆیـە پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێت وەك پێخـۆر بـەکاریبهێنن، بەتایبـەتیش سەرچـاوەیەکی دەوڵەمەنـدە بـە هـەردوو کالیسـیۆم و ڤیتامین (D) بۆ ئەو کەسانەی کە ئێسك دروسـت دەکـەن وەك: منـداڵ و ئـافرەتی دووگیانیش، دیارە ڤیتامین (D) فاکتەرێکی سـەرەکیە بـۆ نیشـتنی کالیسـیۆم لـە ئێسکدا، و کاتێـك ئـەم ڤیتامینـە دەچـێتە نـاو لەشـەوە لـە جگـەردا دەگۆڕێـت بـۆ (Hydroxy vit. D)، پاشـان دەچـێتە گورچیلەکان و لەوێـدا دەگۆڕێـت بـۆ (Dihydroxy vit. D،25،1) کە ئەمەیان هۆرمۆنێکە ودژی ئێسـکە نەرمەیـە (Rickets) چونکە فاکتەرێکی بەهێزی نیشتنی کالیسیۆمە لە ئێسکەکاندا.

لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩٩٧)دا بۆ یەکەم جار لە مێـژوودا ١٦ کـەس لـە زانـا ناسراوەکانی زانستی پزیشکی لە جیهاندا لە شاری (رۆما)ی ئیتاڵیا کۆبوونـەوە بـە مەبەستی دەرکردنـی چـەند بڕیارێك وئامۆژگاریـەکی یـەکگرتوو دەربـارەی زەیتـی

زەیتوون، ئەم زانایانە ئامۆژگارییەکانیان دەرکرد کە لە ٣٠ لاپەڕە زیاتردا بوو، تێیدا هاتووە: خواردنی زەیتی زەیتوون دەبێتە هۆی پاراستنی مرۆڤ لە نەخۆشییەکانی خوێنبەرەکانی دڵ وبەرزبوونەوەی فشاری خوێن و نەخۆشی شەکرە وقەڵەوی وڕێژەی کۆلیسترۆلیش لە خوێندا دادەبەزێنێت، هەروەها مرۆڤ لە تووش بوون بە هەندێك جۆری شێرپەنجە (سرطان) دەپارێزێت.

لە توێژینەوەیەکی نوێدا کە لە گۆڤاری (Atherosclerosis) لە ساڵی (١٩٩٥)دا بڵاوکرایەوە، ئەوەی دووپات کردەوە کە بەکارهێنانی یەکەم بڕی زەیتی گوشراو لە زەیتوونەکەوە (واتە زەیتی تازە گوشراو) نەك ئەوەی بەهۆی ماددە کیمیاییەکانەوە جیادەکرێتەوە (زيت الزيتون البكر Extra Virgin Oil) ڕێژەیەکی بەرزی لە ئاوێتە دژە ئۆکسانەکانی وەك ئاوێتەکانی چەند فینۆلی (Polyphenolic Antioxidant Compounds)ی تێدایە (کە نزیکەی ٤٠ جۆری لە زەیتی زەیتووندا هەیە).



هەروەها ئەم ئاوێتە فینۆلیانە دەبنەهۆی دابەزاندنی ڕێژەی شەکریش لە خوێندا (Hypoglycemic Agents)، وەدەبێتە هۆی ڕێگرتن لە ئۆکساندنی چەورییە زیانبەخشەکان لە لەشدا بە تایبەتی چەوری خوێن لە جۆری چڕی کەم (Low Density Lipoprotein) یان (LDL)، لێرەوە ڕێدەگرێت لە دروستبوونی نەخۆشی ڕەقبوونی خوێنبەرەکان (Atherosclerosis) کە هۆکاری سەرەکی دروستبوونی نەخۆشییەکانی دڵ و دەمارەکانی خوێن و بەرزبوونەوەی فشاری خوێنە.






لەشیش دەپارێزێت لە زیانەکانی ماددەی (پیرۆکسایدی چەوری Lipid Peroxides) کە ژەهراوییە بۆ خانەکانی لەش، ئەم زانیاریانە توێژینەوەیەکی تری هەمان گۆڤار لە ساڵی (١٩٩٦)دا دووپاتی کردەوە.

لە توێژینەوەیەکی تردا کە لە گۆڤاری (Lancet) لە دیسەمبەری (١٩٩٩)دا بڵاوکرایەوە دەریخست کە ڕێژەی مردن لە هەژارترین وڵاتی ئەورووپادا کە (ئەلبانیا)ی موسوڵمانە زۆر نزمە، کە دەگاتە ٤١ کەس لە

۱۰۰هەزار کەس لەناو پیاواندا ساڵانە،کە ڕێژەی مردن لە وولاتێکی دەوڵەمەندی وەك (بریتانیا)دا دەگاتە دوو ئەوەندە، توێژینەوەکە هۆکاری ئەم تەمەن درێژییە لە ئەلبانیای هەژاردا دەگێڕێتەوە بۆ عادەتی خواردنیان کە کەمتر گۆشت بەکاردێنن و زۆرتر سەوزە و میوە و زەیتی زەیتوون بەکاردێنن.

## زەیتی زەیتوون و تووشبوون بە شێرپەنجە (سرطان):

بینراوە کە جۆری شێرپەنجەکان لە مرۆڤدا پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ جۆری خۆراکدا هەیە، بۆ نموونە سەرەتانی مەمك و قۆلۆن لە ئەمریکادا زۆرترین ڕێژەیە لە جیهاندا و زۆر باوە، ئەویش بەهۆی بەکارهێنانی چەورییە تێرەکان (بەتایبەتی چەوری حەیوانی) لەخواردندا بەتایبەتی فاست فوودەکان، بەڵام لە یابانیش بۆ نموونە ئەم شێرپەنجانە کەمن بەڵام شێرپەنجەی گەدە زۆرە لەوێ بەهۆی بەکارهێنانی زۆری ماسی نەکوڵاو لەخۆراکدا (سوشی).



له لێکۆڵینەوەیەکی زانستیدا لەسەر ئەو ئەمریکیانەی ماوەی ١٠ساڵ زیاترە لە یابان دەژین بینرا کە شێرپەنجەی مەمك و قۆلۆن بەتەواوەتی تێیاندا کەمبۆتەوە و ڕێژەی شێرپەنجەی گەدە تێیاندا وەك یابانیەکانی لێهاتووە، هەروەها بینرا ئەو یابانیانەی کە ماوەی ١٠ ساڵ زیاترە لە ئەمریکادا دەژین ڕێژەی شێرپەنجەی گەدە تیایاندا کەمبۆتەوە و شێرپەنجەی مەمك و قۆلۆن وەکو ئەمریکاییەکانیان لێهاتووە، ئەم توێژینەوەیە گرنگی گەورەی خواردنی دەرخست لە دروستکردنی هەندێك جۆری تایبەتی شێرپەنجە.

شێرپەنجە بەرپرسە لە یەك لەسەر پێنجی حاڵەتەکانی مردن لە ئەورووپادا ساڵانە، بەڵام جیاوازییەکی سەیر هەیە لەم ڕێژەیە لە نێوان وڵاتەکانی باکوور و ڕۆژئاوای ئەورووپا کە بەرزە لەگەڵ وڵاتەکانی باشووری ئەورووپادا کە ڕێژەکە نزمترە، توێژەرەوەکان ئەم جیاوازیە دەگێڕنەوە بۆ جۆری خۆراك کە لە باشووردا زیاتر میوە و سەوزە و زەیتی زەیتوون بەکار دێنن.

لە چەند توێژینەوەیەکدا پەیوەندی بەهێزی نێوان بەکارهێنانی زەیتی زەیتوون و نزمبوونەوەی ڕێژەی تووشبوون بە شێرپەنجەی مەمك و گەدە دەرکەوت، سەبارەت بە جۆری شێرپەنجەی مەمك لە توێژینەوەیەکی زۆر نوێی بڵاوکراوە لە گۆڤاری (Archives of Internal Medicine) لە مانگی ئابی (١٩٩٨)دا دەریخست کە: خواردنی کەوچکێکی چێشت لە زەیتی زەیتوون ڕۆژانە مەترسی تووشبوون بە شێرپەنجەی مەمك دادەبەزێنێت بە ڕێژەی ٥٠٪، سەرۆکی پەیمانگای توێژینەوەی ڕەقبوونی خوێنبەرەکان لە زانکۆی (مۆنستەر) لە ئەڵمانیا دەڵێت:

خواردنی زەیتی زەیتوون دەتوانێت ڕێبگرێت لە پەیدابوونی چەندین جۆری شێرپەنجە، لەوانە: سەرەتانی قۆڵۆن و سەرەتانی منداڵدان و سەرەتانی هێلکەدانەکانی ئافرەت.

سەبارەت بە شێرپەنجەی مناڵدان لە توێژینەوەیەك لە گۆڤاری (بەریتانی بۆ شێرپەنجە) کە لە ئایاری ساڵی (١٩٩٦)دا بڵاوکرایەوە دەرکەوت کە ئەو ئافرەتانەی کە بە زۆری زەیتی زەیتوون بەکار دێنن چانس و ڕێژەی تووش بوون بە شێرپەنجەی منالّدان تێیاندا کەم دەبێتەوە بەڕێژەی ٣٠٪.

خوێنەری بەڕێزیش دەتوانێت لە سایتە زانستییەکاندا دەیان هەزار توێژینەوە کە لە هەموو جیهاندا ئەنجامدراون دەربارەی سوودەکانی زەیتون وزەیتی زەیتوون بدۆزێتەوە.




**تەنیا لەم سایتەدا زیاد لە ١٠٠٠٠ توێژینەوەی زانستی هەیە کە سوودەکانی داری زەیتون وزەیتی زەیتون بۆ تەندروستی مرۆڤ دەردەخەن**

## سەرچاوەكان:


- پوختەی تەفسیری قورئـان (مـوفرەداتی قورئـان)/ مامۆسـتا محمـد مـەلا صالح بامۆكی/ چاپی یەكەم – ٢٠٠٥.

- تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان/ م. بورهان محمد أمین.

- الطب النبـوي لإبـن القـيم/ تحقيـق و تخـريج: عبـدالغني عبـدالخالق، د. عـادل الأزهري، محمود فرج العقدة.

- موسـوعة الطـب النبـوي للحـافظ أبـي نعـيم الإصـفهاني/ دراسـة وتحقيـق: د.مصطفى خضر دونمز التركي/ دار ابن حزم/ الطبعة الأولى– ٢٠٠٦.

- الإعجـاز العلمـي في السـنة النبويـة/ دانـراوی (د. صـالح أحمـد رضـا)/ چـاپی یەكەم ٢٠٠١.

- قبسات من الطب النبوي والأدلة العلمية الحديثة – د. حسان شمسي باشا.

- إعجـاز النبـات في السـنة النبويـة الشـريفة – د.محمـد السـيد أرنـاؤوط– الـدار العربية للكتاب – ٢٠٠٧.

- من أوجه الإعجاز العلمي في عالم النبات – د.قطب عامر فرغلي– من إصدارات هيئة الإعجاز العلمي– ١٩٩٦.

- گۆڤاری (الإعجاز العلمي)/ ژمارە ٨ – ساڵی٢٠٠١ / بابەتی: (زيت الزيتـون... أسرار و إعجاز) / بڵاوكراوەی: (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن و السنة).

- شـجرة الزيتـون المباركـة/ توێژینـەوەی (أ.د.عبـد المجيـد بلعابـد والصـابوني ابـراهيم) / جامعـة محمـد الأول كليـة العلـوم وجـدة – المملكـة المغربيـة وجامعـة غرناطة– إسبانيا/ لەم پێگەیە:

- http://www.islam4m.com/thread-174.html

- عبد المجيد بلعابد – نورانية شجرة الزيتونة المباركة – مجلة حراء – السنة الخامسة، العدد ٢١، ٢٠١٠م.

- https://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/?term=olive+oil
- http://quranic-healing.net/index.php?r=page letters= 446
- https://www.maghress.com/almithaq/6417
- http://quran-m.com/quran/printarticles/2759
- http://www.3refe.com/vb/showthread.php?t=85298

# درەختی سەوز وئاگری ژیان

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئامۆژگاری بەندەکانی دەکات بە بیرکردنـەوە و وردبوونـەوە لـە ئاسمانـەکان و زەوی ولـە دروسـت کراوەکـانی بەهـەموو جۆرەکانیـەوە، ئـەوەش بۆ پتـەوکردنی ئیمـان بـە پـەروەردگارێکی تـاك وتـەنها و قوڵکردنەوەی لە ناخی مرۆڤەکاندا، تـاوەکو سـووربن لەسـەر زیـاتر بـاوەڕبوون بـە گەورەیی دەسەڵاتی پەروەردگار و دواتریش پتەو بوونی باوەڕیان بە قورئان وەکو بەرنامەی خودا بۆ مرۆڤەکان تاوەکو بیکەنە دەستووری ژیانیان.

بڵاوکـراوەی زۆر نوسـراون لـە بـارەی ئیعجـازی دروسـت کراوەکانـەوە چ لـە گیانلەبەراندا بێت یان بێگیانـەکان، لەگـەڵ زیـاد بـوونی زانیـاری نوێشـدا ئیعجـازی زیاتر ڕۆشن دەبنەوە بە جۆرێك کە وردبینی لە دروست کراوەکانـدا بـە تـەواوەتی ئاشـکرا دەبێـت کـە لەسـەرووی هـەموو بۆچـوون و ڕوانگەیەکەوەیـە، قورئـانی پیرۆزیش پڕە لەو ئاماژانەی واتای زانستیی ڕۆشنیان تێدایە کە بەوە پێش هـەموو ڕۆشنبیری مرۆڤایەتی کـەوتووە، و واتـای ئـەو ئامـاژانـە دوای پێشـکەوتنی زانسـتە تاقیکارییەکانەوە لەم سەردەمەماندا دەرکەوتوون.

لەم باسـەدا دەچینە خزمـەت ئایـەتێکی قورئـانی پـیرۆز وەکـو نموونەیـەك لـە ئیعجاز کە دەفەرموێت:

﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ﴾ (یس:٨٠)
واتە: هەر پەروەردگارە کە لە درەختی سەوزەوە ئاگری بۆ دروست کردوون، ئـیتر ئێوە ئاگری پێدەکەنەوە.

مانای ئەم ئایەتە بۆ هەموو مرۆڤێـك بەتایبـەتی لـە زەمـانی دابـەزینی قورئـانی پیرۆزدا زۆر ڕۆشن بووە چونکە تاکە سەرچاوەی سووتەمەنی لەو کاتـەدا لەهـەموو لایەکی جیهاندا بریتی بووە لـە ڕووەك ودرەختـی سـەوز و لێوەرگیراوەکانیـان، کـە

کاتێك ووشك دەبێتەوە (دەبێتە تەختە) و خەڵکیش ئەم تەختانەیان دەسووتاند بۆ گەرم کردنەوە و خواردن دروست کردن.

باشە بۆ لێرەدا خوای گەورە باسی رووەك و درەختی سەوز دەکات بۆ سووتاندن، لە کاتێکدا دەزانین کە دەیتوانی باسی تەختە و درەختی ووشکەوەبوومان بۆ بکات هاوشێوە لەگەڵ هێماکردن بۆ هەمان بابەت؟

لێرەدا با سەرەتا بچینە خزمەتی زانایانی تەفسیر و ووتەکانیان سەبارەت بەم ئایەتە بخەینەروو: زانا (إبن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا (تفسیر القرآن العظیم) دەڵێت: (واتە ئەو خوایەی کە سەرەتا ئەم رووەکەی دروست کردووە لە ئاوەوە تاوەکو سەوز و گەش دەبێت، بەردەگرێت و پێدەگات وپاشان ووشك دەبێتەوە و ئاگری پێدەکرێتەوە، هەر بەو جۆرە پەروەردگار ویستی هەرشتێکی هەبێت بە توانا و دەسەڵاتە، هیچ شتێك رێگر نابێت بۆی.

زانا (قتادة) دەڵێت: ئەو خوایەی کە ئاگر لەم درەختە دەردێنێ بە توانایە کە جارێکی تر زیندووی بکاتەوە، وە ووتراوە مەبەست لە (الشجر) رووەکی (المَرْخ و العفار)ە کە لە خاکی حیجازدا دەڕوێت، هەر کەسێك بیەوێت ئاگر بکاتەوە و ئاگر کەرەوەی پێنەبێت دوو چڵ چیلکەی سەوز لەم دارە وەردەگرێت و لەیەکیان دەخشێنێ تاوەکو ئاگریان لێوە پەیدا دەبێت.

لە (تیسیر الکریم الرحمن)دا هاتووە: ئەو پەروەردگارە ئاگری ووشك لە درەختی سەوز دروست دەکات، هەرچەند تەریش بێت کە دوو شتی دژ بەیەك و پێچەوانەن، زیندوو کردنەوەی مردووەکانیش لە گۆڕەکانیانەوە بە هەمان شێوەیە.

راڤەکار (القرطبي) لە کتێبەکەیدا (الجامع لأحکام القرآن) دەڵێت: پەروەردگار ئاگاداری داوە بە مرۆڤەکان لەسەر تاکو تەنهایی خۆی، ولەسەر ئەوپەڕی توانا و دەسەڵاتی لە زیندوو کردنەوەی مردووەکان، نموونەی بەوە هێناوەتەوە کە

مرۆڤەکان دەبینن ئاگرێکی سووتێنەر لە چڵە رووەکێکی تـەڕەوە پەیـدا دەبێت، چونکە بێباوەڕان دەیان ووت (النطفة) گەرم و تەڕە لە سروشتی ژیاندا کـە ژیـانی لێوە پەیدا دەبێت، بەڵام ئێسك سارد و ووشکە لە سروشتی مردندا چۆن جـارێکی تر ژیانی لێوە پەیدا دەبێتەوە؟ لەبەر ئەمـە خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ﴾.

کەواتە رووەکی سەوز لە ئاوە، ئاویش سارد و تەڕە، دژی ئاگرە و هەرگیز ئـەم دووانە کۆنابنەوە، بەڵام خوای گەورە لەو رووەکە سەوزە ئاگری دروست کـردووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە خوای گەورە خاوەنی ئەوپەڕی توانایە کە دژەکان لە دژەکان دروست بکـات و هـیچ شـتێك لـە دەسـەڵاتی دەرناچێت، مەبەسـتیش لـەو درەختەی ئایەتەکە رووەکی (المرخ و العفار)ە کە ئاگرکەرەوەی عەرەب بووە.



لە (زاد المسیر ٦/٢٨٥)دا زانا (ابن قتیبة) دەڵێت: مەبەست لەو چیلکانەیە کـە عـەرەب ئاگریـان پێـدەکردەوە لـە درەختـی (المـرخ و العفـار). لـە (فـتح القـدیر)دا هاتووە: خوای گـەورە بەڵگـەی هێناوەتـەوە لەسـەر توانـا و دەسـەڵاتی خـۆی لـە

زیندوو کردنەوەی مردووەکاندا بە شتێك کە بە چاوی خۆیان دەیبینن چۆن لە چیلکەیەکی تەڕ و سەوز ئاگرێکی سووتێنەر پەیدا دەکات، ئەویش کە رووەکی ناسراو بە (المرخ و العفار)ە، ئەگەر دوو چڵیان لێببڕدرێت وە یەکێکیان لەوی تر بخشێنرێت ئەوا ئاگریان لێدەبێتەوە هەرچەندە سەوزیش بن.

ئەم تەفسیرانەی باسمان کرد چەند روون کردنەوەیەکی رێك و پێکن کە بە تایبەتی بۆ شوێن و کاتی خۆی گونجاو بووە، شتیان لێوەردەگیرێت و شتیشیان لەسەر دەگیرێت، لەمڕۆدا ئەگەر تاقیکردنەوە لەسەر درەختی (المرخ) بکەیت و دوو چڵیان لێوەرگریت ولێکیان بخشێنیت بۆ ماوەیەك هیچ ئاگریان لێناکەوێتەوە وەك ئەوەی موفەسیرەکان باسیان کردووە.

ئەوەی کە زانستی ئەمڕۆ دەریخستووە لەسەر کارەکانی رووەك و درەختی سەوز —تەئکید لەسەوز دەکەینەوە— کە پێی هەڵدەستن زۆر وورد و ئاڵۆزە و لەوپەڕی داهێناندایە، بە جۆرێك کە هەموو کارگە مرۆڤ کردەکان تا ئەمڕۆش ناتوانن هاوشێوەی لاسایی بکەنەوە و بەرهەم بهێنن، ئەمەش دەرگای کردۆتەوە لەبەردەم چەند تەفسیرێکی تردا بۆ ئەم ئایەتە کە بەڵگەن لەسەر ئیعجازێکی زانستی ناوازە لە درەختی سەوزدا.



یەکێك لەو کارانەی رووەکی سەوز بریتییە لە کرداری رۆشنە پێکهاتن کە لەگەڵای سەوزدا روودەدات، بەهۆی سەوزە ماددەوە (الیخضور: کلۆرۆفیل Chlorophyll) کە کردارێکی زۆر گرنگە بۆ رووەك (هەروەها بۆ مرۆڤ و گیاندارانیش)، لەم کردارەدا رووەك ماددەی گلوکۆز یان شەکری تاکی دروست دەکات، پاشان یەکە گلوکۆزییەکان یەکدەگرن تاوەکو زنجیرەیەك لە شەکرەکان پەیدا دەبێت کە پێی دەڵێن شەکری ئاڵۆز یان (نیشاستە Starch) کە کۆ دەبێتەوە لە رووەکدا، پاشان مرۆڤ و ئاژەڵیش بەکاری دێنن وەکو سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ ووزە[٨٦].

گەڵای سەوز هەڵدەستێت بەم کرداری دروست کردنی شەکرە لەرێی زنجیرەیەك کارلێکێکی کیمیایی درێژەوە, زانایانی پسپۆڕ لەم بوارەدا دەیان ساڵ لە

---

[٨٦] لێرەدا خوێنەرانی بەڕێز سەرنجتان رادەکێشم بۆ ئایەتێکی تری قورئان کە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا﴾ (الأنعام:٩٩) واتە: وە ئەو خوایە زاتێکە کە بارانی لە ئاسمانەوە باراندووە, جا بەهۆی ئەو بارانەوە هەموو جۆرە چەکەرەیەکمان رواند ئنجا سەوزیی لێدەرهێنا ولەم سەوزەوە دانەوێڵەی کەڵەکە بوومان دەرهێناوە، ووشەی (خَضِرًا) لە ئایەتەکەدا موفەسیرەکانی قورئان دەڵێن: بریتییە لە شتێکی (ماددەیەکی) سەوز پێی دەووترێت (أخضر)، ئەمە ووتەی (ابن الجوزي، الزمخشري، الخازن، البيضاوي، القرطبي و چەندین موفەسیری تری قورئانن)، (ابن الجوزي) لەمانای ﴿فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا﴾دا دەڵێت: خوای گەورە دەفەرموێت: ئێمە لەو رووەکەوە ماددەیەکی سەوز دروست دەکەین، ﴿نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا﴾ ئەو (هـ)ـانە لە (مِنْهُ)دا دەگەڕێتەوە بۆ ماددە سەوزەکە، واتە ئێمە لەم ماددە سەوزەوە دەنکی کۆوەبوو (دانەوێڵە) دروست دەکەین و دەردەکەین، بەهەمان شێوە موفەسیرەکانی تریش وەك (الزمخشري، الخازن، النسفي، أبوالسعود)، جا خوێنەری بەڕێز تێبڕوانە لە ووتەی ئەم موفەسیرە بەڕێزانەی قورئان کە پێش سەدان ساڵ لەمەوپێش ژیاون، کە هیچ کەسێك لەو کاتەدا نەیدەزانی کە ماددەی سەوز یان (کلۆرۆفیل Chlorophyll) چییە و نەدۆزرابووەوە، بەڵام بە پشت بەستن بەئایەتەکانی قورئان ئەم قسەیەیان کردووە و ووتوویانە کە ئەو ماددە سەوزەیە کە دانەوێڵە و بەرووبوومەکانی تری لێوە پەیدا دەبێت، باشە کێ محمد (ﷺ)ی نەخوێندەواری فێری ئەم ڕاستییە زانستیانە کرد مەگەر خوای گەورە و بەدەسەڵات نەبێت.

هەوڵدابوون بۆ دەرخستن و روونكردنەوەی ئەم كرداره كه دەتوانین كورتی بكەینەوە لەم هاوكێشە كیمیاییەیخوارەوەدا:

$$6CO_2+6H_2O \rightarrow C_6H_{12}O_6+6O_2$$

ئەو ماددانەی كە بەشدارن لەم هاوكێشەیەدا ئەوپەڕی ئاسان دەستكەوتوو و زۆرن: ئاو نزیكەی ٣/٤ی گۆی زەوی داگیر كردووە، دووەم ئۆكسیدی كاربۆنیش هەمیشە لە زیندەوەرەكانەوە بە گیاندار و رووەكەوە لەرێی هەناسەدانەوە دەردەچێت كە ماددەیەكی زیان بەخشە و پێویستە خۆیانی لێ ڕزگار بكەن، لێرەدا تێبینی موعجیزەی گەورە دەكەین لەم كردارەدا، چونكە رۆژانە چەندین هەزار تۆن لە دووەم ئۆكسیدی كاربۆن لە زیندە چالاكی بوونەوەرە زیندووەكانەوە دروست دەبێت، ئەگەر بەردەوام كۆببێتەوە ئەوا رێژەكەی بە شێوەیەكی مەترسیدار بەرزدەبێتەوە و ئەم كەڵەكە بوونە ئەگەر سنوورێك ببڕێت لەوانەیە ببێتە هۆی لەناوچوونی ژیان لەسەر زەویدا[٨٧]، بەڵام گەڵای سەوز بە فەرمانی خوای گەورە رزگارمان دەكات لەم گازە زیانبەخشە و دەیگۆڕێت بۆ ماددەیەك كە سەرچاوەی سەرەكی ووزەیە بۆ هەموو زیندەوەرەكان كە ئەویش گلوكۆزە وەك لە هاوكێشەكەی سەرەوە دەردەچێت، لەمەش گرنگتر ئەو ئۆكسجینەیە كە لە هەمان هاوكێشەوە دروست دەبێت.

بابەتی سەرەكی ئەم باسەمان بریتییە لە كرداری دروست بوونی ئۆكسجین لە كرداری رۆشنەپێكهاتن لەگەڵای سەوزدا كە لەگەڵ دروست بوونی هەر گەردێگ گلوكۆز شەش گەرد لە ئۆكسجین پەیدا دەبێت ودەخرێتە بەرگە هەواوە.

---

[٨٧] وەك لەمرۆدا دیاردەی (خانووی شووشە) یان قەتیس بوونی گەرمیی لە بەرگە هەوای زەویدا روویداوە، بەهۆی كەڵەكەبوونی گازی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن بەرێژەی زۆر لە بەرگە هەوادا لە ئەنجامی سووتانی سووتەمەنی بەردینەوە، وەك نەوت وخەڵووز وپیسبوونی ژینگە لەئەنجامی دەردراوەكانی كارگەكان وئۆتۆمبیلەكان، وهەروەها كەم بوونەوەی رێژەی سەوزایی لەسەر زەوی، ئەمە بووەتە هۆی گۆڕانكاریی گەورە لە كەش وهەوای زەویدا.

گرنگی ئۆکسجینیش بۆ سووتان و دروست بوونی ئاگر لە هیچ کەسێك شاراوە نییە, هیچ ئاگرێك داناگیرسێت و ناسووتێت بەبێ بوونی ئۆکسجین، هەموو ئەو ئاگرانەی لێرە و لەوێ دەسووتێن لە سەر زەویدا، لە کارگە و ماڵەکاندا، هەموو ئەو ئاگرانە بەبێ بوونی ئۆکسجین ناتوانن لە سووتان بەردەوام بن، ئایا چی هەیە و کێ هەیە جێگەی ئەو هەموو ئۆکسجینە بگرێتەوە کە رۆژانە کاردەکرێت؟ ئەگەر کارکردنی ئۆکسجین بەو شێوەیە بەردەوام بێت بەبێ جێگرتنەوە ئەوا رۆژێك دێت کە نەتوانرێت بە هیچ شێوەیەك ئاگر بکرێتەوە !

بەڵێ ئەوە رووەکی سەوزە کە بەو کارە گرنگە هەڵدەستێت و قەرەبووی ئەو ئۆکسجینە بەکارهاتووە دەکاتەوە کە لەلایەن زیندەوەرانەوە بەکار دەهێنرێت، بەڕای من یەکێك لە تەفسیرە گرنگەکانی ئایەتەی سەرەوە ئەم کردارەیە، کە لە رووەکی سەوزەوە ئۆکسجین پەیدا دەبێت و بەبێ ئەم گازە سووتان روونادات و ئاگر پەیدا نابێت، کەواتە لە رووەکی سەوزەوە ئاگر پەیدا دەبێت، کە ئەم ئاماژەیە موعجیزەیەکی زانستیی گەورەی قورئانە.





**کلۆرۆفیل لەناو سەوزە پلاستیدی گەڵای سەوزدا مەزنترین کارگەی سەر زەوییە**

لێرەدا با باسی ئاگرێکی تر بکەین کە زۆر گرنگترە لەو ئاگرەی کە ئێمە دەیناسین و دەیبینین، ئاگرێکی شاراوە و هێواشە کە لە هەموو کات و ساتێکدا

لەناو لەشی هەموو زیندەوەرەکاندا -کەمێکیان نەبێت- داگیرساوە، لە هەموو خانەیەك لەخانەکانی لەشی زیندەوەرەکاندا بوونی هەیە.

هەڵگیرسێنەری ئەم ئاگری ژیانە گازی ئۆکسجینە، رێگرتن لە چوونی ئۆکسجین بۆ خانەکان دەبێتە هۆی کوژاندنەوەی ئەم ئاگری ژیانە لەناو خانەکاندا، زانا و نەزان و بچووك و گەورە دەزانن کە ئەگەر بتەوێت گیانلەبەرێك یان مرۆڤێك بکوژیت ئەوا دەتوانیت ئەوکارە بەئەنجام بگەیەنیت بە خنکاندنی ئەو گیانلەبەرە، ئەی خنکاندن واتای چییە؟

زۆر بەئاسانی دەتوانی ئەوە بکەیت بە قەدەغە کردنی گەیشتنی هەوا بۆ سووڕی خوێنی ئەو زیندەوەرە، ماددەی سەرەکی پێویست لەهەوادا بریتییە لە ئۆکسجین کە ماددەی زیندوێتییە، ئێستا بابزانین ئەو ئۆکسجینە بۆ کوێ دەڕوات وچی دەکات؟!

- لەهەموو خانەیەك لە خانەکانی زیندەوەراندا ئاشێك هەیە کاردەکات شەووڕۆژ بەبێ هیلاك بوون و بێتاقەت بوون، دەکرێت ناوی بنێین (ئاشی نواندنی خۆراکی) کە تیایدا گلوکۆز و ترشە چەورییەکان و پرۆتینەکان بە یارمەتی ئۆکسجین دەسووتێنرێن و دەشکێنرێن و نەختە نەختە وورد دەبن و ووزەیان لێوە وەردەگیرێت، ئەم ئاشە یان کارگەیە بریتییە لە ماڵەووزە یان (مایتۆکۆندریا Mitochondria).






لەناو ئەم کارگەیەدا و لە ئەنجامی ئەو تێك شکاندنانە چەند ماددەیەکی گرنگ دروست دەبن کە سووتەمەنی سەرەکیە بۆ هەموو کردار و چالاکی خانەکان، جا ئەو خانەیە ماسولکەیی بێت یان خانەیەك بێت لە کۆئەندامی هەرس یان هەر خانەیەکی تر، هەموو خانەیەك هەڵدەستێت بە دروست کردنی ماددەیەکی دیاریکراو لە کارگە تایبەتەکەیدا کە ووزەی پێدەدات بۆ چالاکیەکانی، ئەم ماددانەی ناو پێکهاتەی خانەکان ناسراون بە ماددە دەوڵەمەندەکان بە ووزە (Energy Rich Compounds)، لە بەناوبانگترینیان و زۆرترینیان لە بەکارهێناندا ئەو ماددە گرنگەیە کە پێی دەووترێت (ئەدینۆسینی سێ فۆسفاتی Adenosine TriPhosphate) کە کورتکراوەکەی (ATP)یە.

تێکشکاندنی ئەو ماددانەی کە باسمان کرد لەناو مایتۆکۆندریادا (بەهۆی چەند ئەنزیمێك) لەسووڕێکدا ڕوودەدات کە پێی دەوترێت سووڕی کرێپس ( Creps Cycle) وە دەبێتە هۆی جیابوونەوەی هایدرۆجین، ئەم سووڕە بەناوی ئەو زانایەوە ناونراوە کە کارلێکەکانی ئەم سووڕەی دۆزیەوە ئەویش بەرهەمی چەندین لێکۆڵینەوەی گرنگ بوو لەماوەی دە ساڵدا.



گەردە هایدرۆجینییە جیابووەکان لە ماددە ناوکییەکانی سووڕی کرێپس دەڕوات بە زنجیرەیەکی تر لە کارلێك کە پێی دەوترێت سووڕی هەوایی یان سووڕی ئۆکسیدی فۆسفۆری.

گەردە هایدرۆجینیەکان لە ئاستێکی ووزە بەرزەوە دادەبەزێنرێن بۆ ئاستێکی ووزە نزم، جیاوازی ئەم ووزەیە بەکاردێت لە بەیەکەوە بەستنی چەندین گەردی فۆسفات لەگەڵ ماددەی ئەدینۆسینی دوو فۆسفاتی (ADP) بۆ ئەوەی ماددەی ئەدینۆسینی سێ فۆسفاتی (ATP) لێپەیدا ببێت کە ووزە لە بەندە سیانیەکەیدا (ADP ~ P) هەڵدەگرێت، لەکۆتایی ئەم سووڕەشدا لە بەیەك گەیشتنی گەردەکانی هایدرۆجین و ئۆکسجین گەردی ئاو پەیدا دەبێت دوای ئەوەی ووزەیان لێپەیدا دەبێت کە ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕینی چەند گەردێکی تر لە (ADP) بۆ (ATP).

ئەم ئەدینۆسینی ٣ فۆسفاتیە (ATP) دەبنە سووتەمەنی بۆ خانەکان کە بەکاری دەهێنن بۆ چالاکیەکانیان یان هەر کاتێك پێویستیان پێی بوو، ئەم کردارە بە شکاندنی بەندی فۆسفاتی سێیەم و دەرپەڕینی ووزەی کۆکراوە تێیدا بە ئەنجام دەگات، وەك باسمان کرد ئۆکسجین لێرەدا دەوری سەرەکی هەیە، کاتێك ئۆکسجین دەگات بە گەردە هایدرۆجینیەکان گەردی ئاوی لێوە دروست دەبێت، ئەگەر هەوای ئۆکسجیناوی نەگات بە خانەکان ئەوا دەبێتە هۆی وەستانی ئەم سووڕە هەواییە و پاشان کەم بوونەوەی (ATP) و بە پچڕانی گەیشتنی ئۆکسجین بۆ خانەکان دەبێتە هۆی مردنیان.

خانەکانی مێشك لەپێش هەموو خانەکانی تر لە چەند چرکەیەکدا دەست دەکەن بە لەناو چوون، خۆ ئەگەر ئەم نەمانی ئۆکسجینە چەند دەقیقەیەك بەردەوام بێت زوربەی خانەکانی مێشك لەناو دەچن، خانەکانی لەش لەچەند ماوەیەکی جیاوازدا لەناو دەچن.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئۆکسجین بنەمای مانەوەی ژیانە، بلیۆنەها بوونەوەری زیندوو بەکاریدەهێنن, وچارەنووسیشی بەرەو نەمانە ئەگەر بێتوو جێگەی نەگیرێتەوە، کێ هەیە ئەم ئۆکسجینە بەکارهاتووەمان بۆ قەرەبوو بکاتەوە ئەگەر رووەکی سەوز نەبێت، هەروەها لەو کارلێکە کیمیاییەی کە باسمان کرد رووەکی سەوز لە دووەم ئۆکسیدی کاربۆنیش رزگارمان دەکات و دەیگۆرێت بۆ گلوکۆز کە وەکو سەرچاوەی ووزە بۆ زیندەوەران بەکاردێت، لێرەوە بە تەواوەتی مانای ئایەتە پیرۆزەکەی سەرەوە دەردەکەوێت کە لە رووەکی سەوزەوە بنەمای ئاگری ژیان پەیدا دەبێت کە ئۆکسجینە.

لە کۆتاییدا خوێنەری بەرێز داوات لێدەکەین کە هاوبەشیمان بکەیت لە بیرکردنەوە لە دروست کراوەکانی خوای گەورە و لە وورد بوونەوە لە ووشەی (الأخضر)ی ئایەتە پیرۆزەکە: ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ﴾، ئایا واتایەکی زۆر قووڵ نابینیت؟! لێرەوە ئیعجازێکی زانستی رۆشن و ئاشکرات بۆ روون دەبێتەوە.

## سەرچاوەکان:


- بابەتی (الشجر الأخضر و نار الحياة) – گۆڤاری (الإعجاز العلمي) – (ژمارە٦) – ساڵی ٢٠٠١، لەبڵاوکراوەکانی: (هيئة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة) بەم ناونیشانە:

-https://www.eajaz.org/index.php/component/content/article/64-Sixth-Issue/353-Green-tree-and-fire-life

- http://www.quran-m.com/quran/article/2817/%D9%85%D9%91%D9%90%D9%86%D9%8E-%D8%A7%D9%84%D8%B4% D9%91%D9%8E%D8%AC%D9%8E%D8%B1%D9%90-%D8%A7%D9%84%D9%92%D8%A3%D9%8E%D8%AE%D9%92%D8%B6%D9%8E%D8%B1%D9%90-%D9%86%D9%8E%D8%A7%D8%B1%D8%A7%D9%8B-%D9%85%D8%B9%D8%AC%D8%B2%D8%A9-%D9%82%D8%B1%D8%A2%D9%86%D9%8A%D8%A9

- http://www.kaheel7.com/ar/index.php/2010-02-02-22-17-58/339-2011-01-06-23-18-17
- http://www.jameataleman.org/main/articles.aspx?article_no=1726
- https://www.nazme.net/ar/index.php?p=show_articles&id=534

- ئینتەرنێت: بابەتی (الإعجاز العلمي في القرآن و السنة: اليخضور)، سایتی:
- www.tasabeeh.com.



# ڕێکبوونەوە وشێوەپێدانی کۆرپەلە لە قورئان وسوننەتدا

لە چەند فەرموودەیەکی قورئان و سوننەتدا ئاماژە بۆ ئەوە هاتووە کە کۆرپەلە لەسکی دایکیدا لەشی ڕێکدەبێتەوە و شێوەکەی دەگۆڕێت بۆ شێوەی مرۆڤ, وەك لەم ئایەتانەدا:

- ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى, ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى﴾ (القيامة: ٣٧-٣٨) واتە: ئایا کاتی خۆی ئادەمیزاد نوتفەیەك نەبووە لە بەشێکی مەنیەوە کە دەڕژێنرایە شوێنی خۆی (واتە ئایا ئەو لەسەرەتاوە کە دروستمان کرد بەشێکی تنۆکێك ئاو نەبووە)؟! پاشان بوو بە خۆهەڵواسێنەر (علقة) کە دوایی دروستمان کرد, و ئینجا ئەندازەمان بۆ دانا و ڕێکمان کردەوە.

- ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى, الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى﴾ (الأعلى: ١-٢)، واتە: خوای پەروەردگاری پایە بەرزی خۆت یادبکە و بەرز رایگرە، ئەو خودایەی کە زیندەوەرەکان دروست دەکات و پاشان ڕێکیان دەکاتەوە و لەشیان ڕێك وپێك دەکات (هەر زیندەوەرە و بە شێوەی خۆی).

- ﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ﴾ (الإنفطار:٧)، واتە: ئەو پەروەردگارەیە کە دروستی کردوویت، و ڕێك و پێکی کردوویت و لەشتی ڕێك کردەوە.

- ﴿هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاء ...﴾ (آل عمران:٦)، واتە: هەر پەروەردگارە کە وێنەتان دەکێشێت لە مناڵدانەکاندا بەو شێوەیەی کە وویستی لێبێت ...

- لە فەرموودەیەکی پێغەمبەریشدا (ﷺ) هاتووە: ﴿إذا مَرَّ بالنُّطْفَة ثِنْتان وَأَرْبَعونَ لَيْلَة، بَعَث اللهُ إِلَيْها مَلَكاً فَصَوَّرَها وَخَلَقَ سَمْعَها وبَصَرَها وَجِلْدَها ولَحْمَها وَعظامَها﴾ (أخرجه مسلم والطبراني وأبو داود) واتە: کاتێك کە (نطفة) دەگاتە ٤٢ڕۆژ پەروەردگار فریشتەیەکی بۆدەنێرێت بۆ ئەوەی شێوەی مرۆڤی پێبدات وبیستن وبینین وپێست وگۆشت و ئێسکی بۆ دروست بکات.

لەم ئایەت و فەرموودە پیرۆزانەی سەرەوەدا ئاماژەیەکی سەرسوڕهێنەر هەیە کە: ئادەمی لەناو سکی دایکیدا شێوەی مرۆڤی پێدەدرێت، واتە دەبێت پێشتر ئەو شێوەیەی نەبێت؟ و دوایی پێی ببەخشرێت؟ لێرەدا باسی چەند ڕووداوێك کراوە کە لە کاتی گەشەکردنی کۆرپەلە لە سکی دایکیدا ڕوودەدەن، ئەویش پاش ئەوەی کە کۆرپەلەکە لە دروستبووندایە، ڕێك دەکرێتەوە (تسوية و تعديل) دەکرێت و وێنەی مرۆڤی پێدەبەخشرێت (تەصویر دەکرێت)، کۆی ماناکانی (سَوّى) لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا بریتین لە:

١- بەمانای ئەوەی کە شتێك ڕێك وڕەوان ببێت (أن یکونَ الشيء مستقیماً).

٢- هەروەها بە مانای ئەوە دێت کە شتێك ڕێك بێت بێ بەرزی و نزمی.

٣- واتە شتێك ڕێك وپێك بکرێت، وەکو چۆن دانایی و حیکمەت وادەخوازێت.

قۆناغی ڕێکبوونە (تەسویە) لە بۆچوونی قورئانیدا هەردوو قۆناغی (کردنی گۆشتپارەی کۆرپەلەکە بە ئێسك، و داپۆشینی ئەم ئێسکانە بە ماسولکە) دەگرێتەوە، ئەویش لەبەرئەوەی ئەم کردارانە بریتین لە جۆرێك لە تەصویر و وێنەدان بە کۆرپەلەکە، بە مانایەکی تر ڕێکبوونەوەی ئەندامەکانی لەشێتی، کە خۆی لەخۆیدا خالّی نییە لە کرداری دروستبوون،




وێنەکانی لای ڕاست وێنەی ڕاستەقینەی کۆرپەلەن و ئەوانەی لای چەپ هێلکارین، کە هەموویان ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە دوای دروستبوونی ئێسکەکان و لە هەفتەی حەوتەم بەرەو سەر کۆرپەلەکە لەشی ڕێکدەبێتەوە و شێوەی مرۆڤ وەردەگرێت

رێكبوونی ئەندامـەكانی و وەرگرتنـی وێنـەی مرۆیـی تـەنها لـە هەفتـەی هەشـتەمدا دەبێت (واتە لە كۆتایی ماوەی رێكبوون و تەسویەدا).

ئێستا بابچینە سەر باسكردنی ماناكـانی (سَوَّى) و روون كردنـەوەیان لـە رووی راستییەكانی كۆرپەلەزانییەوە:

١– سەبارەت بە مانای یەكەم (بە مانای ئەوەی كە شتێك رێـك ورِەوان ببێـت): بەكارهێنانی ئەم ووشەیە لەم ئایەتەدا دەلالـەتێكی تایبـەتی خـۆی هەیـە، ئـەویش لەبەرئەوەیە كە ئەوە دەگەیەنێت كۆرپەلە پێش ئـەم قۆناغـە لەشـی رێـك نـەبووە (واتە چەماوە بووە) و لێرەوە رێك دەبێتەوە، كە ئەمە خـۆی لەخۆیـدا ئیعجـازێكی هەواڵدانـە، ئـەم قۆنـاغی رێكبوونەوەیـە هـەردوو دیـاردەی دروسـتبوونی ئێسـك و داپۆشینیان بە ماسـولكە دەگرێتـەوە، كـە لەگـەڵ دروسـت بـوونی ئێسـكدا لەشـی كۆرپەلەكـە رێـك و بـەهێز دەبێـت و ئـیتر شـێوە چـەماوەییەكەی (كـە پێشـتر لـە قۆناغی گۆشتپارەدا لە شێوەی پیتـی C ی ئینگلیزیـدا بـووە) لەدەسـت دەدات و رێكدەبێتەوە. (وەك لەم وێنەیەی خوارەوەدا بەروونی دیارە)




٢– مانای دووەم: ئەوەی كە شتێك رووەكەی رێك ببێت بێ بەرزیی و نزمی، كە وەك باسمان كرد لەم كاتەدا بە هێواشی بەرزی و نزمی و ئاوساوی و چاڵایی لەشی كۆرپەلەكـە نامێنێـت بـەهۆی رەقبـوونی ئەندامـەكان و دروسـت بـوونی ئێسـك و

داپۆشینیان بە ماسولکە، ئیتر بەهۆی ئەمانەوە رووی لەشی کۆرپەلەکە تەواو رێک ورەوان دەبێتەوە.

٣- مانای سێیەم: واتە شتێك رێك وپێك بکرێت، وەکو چۆن دانایی و حیکمەت وا دەخوازێت، بەواتای ئەوەی کە مرۆڤەکە بخرێتە سەر شێوەی تەواو رێك و کامڵی مرۆڤانە، بینراوە کە لە کۆتایی هەفتەی هەشتەمدا کۆرپەلەکە دەبێتە بارستەیەکی مرۆیی تەواو و کامڵ، (د. لارس هامبێرگەر) دەڵێت: دوای ٨ هەفتە درێژی کۆرپەلەکە تەنها ٤ سانتیمەتر دەبێت، بەڵام لەناو ئەم لەشە بچووکەیدا هەموو ئەندامەکان لە شوێنی خۆیاندان، و هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بوونیان هەبێت لە مرۆڤێکی کامڵدا دروست بوون [88].

لەم قۆناغەدا کلکی کۆرپەلەکە نامێنێت و گوێ ی دەرەوە شکڵی خۆی وەردەگرێت لە ئەنجامی کامڵ بوونی پێچەکانی گوێ ی ناوەوە، و گوێ ی ناوەوە بە تەواوەتی دروست دەبێت، چاوەکانیش بەهۆی پەیدابوونی پێڵووەکانەوە وێنەی ئاسایی خۆیان لە رووخساردا وەردەگرن، پەنجەکانی دەست و پێ بە ئاشکرا پەیدادەبن، و لووت دەردەکەوێت، لێرەوە وێنەی کۆرپەلەکە لە وێنەی مرۆییەوە نزیك دەبێتەوە و بە شێوەیەك رێکدەبێتەوە کە مرۆڤی لێ جیابکرێتەوە ئەویش بەهۆی جیاوازبوونی ئەندامەکانیەوە، بەمەش مانای سێیەمی رێکبوون و ووشەی (سَوَّى)ی ئایەتە پیرۆزەکە دەردەکەوێت، و هەروەها راستیی زاراوەی (فَصَوَّرَها) واتە وەرگرتنی وێنەی مرۆڤ کە لە فەرموودەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە بە تەواوەتی ئاشکرا دەبێت.

ووشەی (فَسَوَّاكَ) لە ئایەتەکەدا ﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ﴾ بە مانای (رێك کردنەوە و راست کردنەوەی شتێك) دێت بۆ ئەوەی ئامادە بێت بۆ بەجێ هێنانی ئەرکەکانی، ووشەی (فَعَدَلَكَ) بەمانای (گۆرینی شێوە و پێکهاتەی بۆ پێکهێنانی

---

[88] لە کتێبی مامانی A Child is Born ی (د. لارس هامبێرگەر) وەرگێراوە/ لاپەرە ٩١.

شتێکی دیاری کراو) دێت، کرداری ڕێك بوونەوە (تسوية) لە کاتی قۆناغی دروست بوونی ئێسك و لە کۆتاییەکەیدا دەبێت، بەکارهێنانی پیتی (فـ) پێش ووشەی (عَدَلَكَ) مانای بەدوای یەکدا هاتنی ڕاستەوخۆی ئەم کردارانە دەگەیەنێت.







**لە قۆناغە سەرەتاییەکانیاندا کۆرپەلەی مرۆڤ و زۆرێك لە زیندەوەران هەمان شێوەیان هەیە, و پاشان هەریەکە و بۆ شێوەی تایبەتی خۆی جیاواز دەبێت, لەم وێنانەدا بڕوانە لێکچوونی نێوان کۆرپەلەی مرۆڤ و کۆرپەلەی هەندێك زیندەوەری تر لە قۆناغەکانی سەرەتای دروستبوون و گەشە کردنیاندا, تەنها لە کۆتاییدا نەبێت شێوەیان جیاواز نابێت**

واتە مانای ئایەتی (الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ) بەم شێوەیەی لێدێت: ئەو خودایە کە دروستی کردیت و ڕێکی کردیت و لەدوای ڕێك بوونەوەی لەشت شێوەشتی ڕێك کردەوە، ئەم مانایە ئایەتەکەی دواتری بە تەواوەتی ڕوونی

دەکاتــەوە: (فـِي أيِّ صُـورَةٍ مَّـا شَـاءَ رَكَّبَـكَ) واتــە: شێوەشـت لەسـەر چ وێنەیـەك بیەوێت ئاوای لێدەکات و دایدەمەزرێنێت.




ئەم هێلكاریە گۆڕانكاری لە بەشەكانی لەشدا لە قۆناغی گەشەكردندا روون دەكاتەوە, دەبینین لە هەفتەی نۆیەمدا چێوەی سەر بەقەدەر چێوەی سك دەبێت و لە دواییدا چێوەی سك زیاد دەكات, قورئانی پیرۆز زاراوەی (تعدیل-رێك كردنەوە)ی بۆ ئەم كردارە بەكارهێناوە, كە زۆر بەجوانی لەم وێنانەدا بۆمان روون دەبێتەوە

زانایانی کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکەن کە لە قۆنـاغی (النشـأة)دا پێوانـەکانی لەش دەگۆڕێن و شێوەی دەم وچاو سیمای مرۆڤی بۆ دروست دەبێـت، بـۆ نموونـە گوێکان لە ملەوە دەجوڵێن بۆ ئەملاولای سەر، لووت لە دەم جیادەبێتەوە و لێـوی سـەرەوە بـە ئاشـکرا دەردەکـەوێت، و چـاوەکان دێنـە پێشـەوەی دەم وچـاو و پەلەکانی خوارەوە درێژ تر دەبن بە بەراورد بە لەشی کۆرپەلەکە، ئەم کردارانە بە رێکبوونەوەی شێوە (تعدیل) ناو دەبرێت یان (تَقْویم)، هـەروەها ووشـەی (صـورة) کە لە ئایەتی دووەمدا هاتووە مانای شکڵ و شێوە دەگەیەنێت.

کەواتە بە کورتی ئایەتەکان ئەمە دەگەیەنن: {دوای دەست پـێکردنی کـرداری رێك بوونەوە(تسـویة) راسـتەوخۆ گۆڕانکـاری بەسـەر کۆرپەلەکـەدا دێـت و پێوانـە ئاساییەکانی مـرۆڤ وەردەگرێـت و رێـك دەبێتـەوە (التَّعـدیل أو التَّقْـویم)، هـەروەها وەرگرتنی شکڵ و شێوەی مرۆڤ و وێنەی کەسێتی (الصورة الشخصـیة) روو دەدات

(التصوير)}، ئەم كرداری ڕێك بوونەوە وشێوە وەرگرتنە تا كاتی لەدایك بوون و تەنانەت دوای لەدایك بوونی كۆرپەلەكەش هەر بەردەوام دەبێت.




**لەم وێنانەدا ڕێکبوونەوەی ڕوخساری کۆرپەلە دەبینین تاوەکو هاوسەنگی خۆی وەردەگرێت و شکڵی مرۆڤ بە ئاشکرا دەردەکەوێت. هەروەها گۆڕانکارییەکانی ڕوخسار بە پێی تەمەنیش دەردەخات**

ووشەی (عدل) مانای ڕێكبوونەوە و گونجاویی و هاوسەنگیی لە نێوان چەند شتێكدا دەگرێتەوە، لە تەفسیری (النسفي)دا دەربارەی (فَعَدَلَكَ) هاتووە: واتە ڕێكی كردیتەوە و دروست كردنتی موناسیب و گونجاو كرد بەبێ جیاوازی لە بەشەكانیدا (دەستێكی درێژ نەكردیت و دەستەكەی تر كورت، یان چاوێك فراوانتر بێت لەوی تر)، كەواتە قۆناغی (التعديل) بریتییە لە حاڵەتێكی گونجاویی و هاوسەنگی بۆ هەموو ئەندامەكانی لەش بەشێوەیەك كە هەموو ئەندامێك گونجاوبێت لەگەڵ پاشماوە و بەشەكانی تری لەشدا.

پرۆسەی تەعدیل زۆر بە ووردیی دەبینرێت لە پاش قۆناغی (تەسویە) كە لێرەدا ئەندامەكان ناهاوسەنگن، بۆ نموونە قەبارەی سەر زۆر گەورەتر دەبێت لەچاو قەبارەی لەشدا، كە لەم قۆناغی تەعدیلەدا پێوانەكانی لەش دەگۆڕێن

بەشێوەیەك كە هەردوو پەلی خوارەوە درێژتر دەبن لەچاو لەشدا، و گەشەی سەر خاودەبێتەوە لەچاو گەشەی لەشدا، وقەبارەی سەر و پەلەكان هاوسەنگیی خۆیان وەردەگرن، و پێوانەكانی لەشی كۆرپەلەكە گونجاو دەبێت بەپێی شێوە و وێنەی مرۆیی، بەمەش مانای هاوسەنگیی و گونجاویی كە لە ووشەی (عدل)دایە دێتەدی.




دوو وێنەی راستەقینە بۆ بەراورد كردنی كۆرپەلە پێش و لەدوای 40 رۆژی.
دەبینین بە ئاشكرا شكڵ و روخساری مرۆڤ وەردەگرێت لە دوای 6 هەفتە.




**لەگەڵ بەرەوپێش چوونی تەمەنی كۆرپەلەدا چەماوەیی لەشی رێكدەبێتەوە و شكڵی مرۆڤ وەردەگرێت.**

بەڕاستی سەرسوڕهێنەرن ئەم ئایەتانە کە تاوەکو سەدەی هەژدەیەمی زایینیش زانایان و کۆرپەلەزانان وایان دەزانی کە کۆرپەلە بە کامڵی و بە شێوەی مرۆڤ بەتەواوەتی لەناو تۆو یان هێلکەدایە هەر لە سەرەتاوە، و لە منداڵداندا تەنها لە قەبارەدا زیاد دەکات، بەڵام قورئان بە پێچەوانەی ئەمەوە پێش ١٤٠٠ ساڵ راستییەکانی دەرخستووە و زانستی کۆرپەلەزانی نوێش ئەم زانیاریانەی قورئانی پشتڕاست کردۆتەوە و شایەتی بۆ راستیان داوە.

## سەرچاوەکان:


- قورئانی پیرۆز.
- تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان.
- ئاماژەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا/ د.کاوە فەرەج سەعدون/ چاپی یەکەم - ٢٠٠٦.
- إعجاز القرآن فيما تخفيه الأرحام/ كريم نجيب الأغر/ دار المعرفة - ٢٠٠٤.
- گۆڤاری (الإعجاز العلمي)/ ژمارە (١٦)ی رەجەبی (١٤٢٤ك - ٢٠٠٣ز)/ کە لەلایەن (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة)وە دەردەچێت.
- گۆڤاری (الإعجاز)/ ژمارە (٣)ی رەبیعی دووەمی (١٤١٨ك).
- گۆڤاری (الإعجاز العلمي)/ ژمارە (٤)/ ١٤٢٠ك -١٩٩٩ز.
- گۆڤاری (الإعجاز العلمي)/ ژمارە (٥)ی رەمەزانی (١٤٢١ك) - کانوونی یەکەمی (٢٠٠٠).

# موعجیزەی بۆچوونە ئیسلامییەکان
# لە زانستی بۆماوەزانیدا

بۆمـاوەزانی (علـم الوراثـة Genetics) ئـەو زانسـتەیە گرنگـی دەدات بـە لێکۆڵینەوەی دیاردەی بۆماوە، کە بریتیە لەو ڕێگەیەی کـە بەهۆیـەوە هەنـدێك لـە سیفەتەکانی بـاوان بـۆ نـەوەکان دەگوێزرێتـەوە، بۆمـاوەزانی تـەنها لـە سـەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا وەك زانستێك هاتە کایەوە لەسەر دەستی زانا (یۆهـان مەنـدل Mendel)، کە لە ساڵی (١٨٦٦ز)دا یەکەم بنەماکانی بۆماوەزانی دۆزیەوە.

ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە قورئان و سوننەتی پیرۆز ئاماژەیان داوە بە زۆرێـك لە بنەماکانی بۆماوەزانی، و هەندێك ڕاستی زانستی وردیان باس کردووە کە پێش (١٨٦٦ز) لەلای مرۆڤەکان نەزانراوە، لوتکەی ئـەم ئیعجـازە لەوەدایـە کـە لەسـەر زەمانی کەسێکی نەخوێندەوار کە (محمـد)ە (ﷺ) باسـکراوە، لـەناو دەوروبـەرێکی نەزانیی و تاریکاییدا لەڕووی زانستیەوە.

لەشی هەموو زیندەوەرەکان لە خانە پێکهاتووە، کە لەناو ئەم خانانەدا ناووکی خانە هەیە کە گرنگترین بەشێتی و کۆنترۆڵی هـەموو چالاکیەکانی دەکـات، لـەناو نـاوکی خانـەدا ئـەو پێکهاتانـە هـەن کـە فاکتـەری ئـەم بۆماوەیـە و گواسـتنەوەی سیفەتەکانن کە بریتین لـە کرۆمۆسـۆمەکان، لـە مرۆڤدا ژمـارەی کرۆمۆسـۆمەکانی هەر خانەیەکی لەشی بریتییە لە (٤٦) کرۆمۆسۆم.

کرۆمۆسۆمەکانیش بریتین لەو دروسـتکراوە سـەمەرە و عەجیبانـەی کـە نهێنـی دروست بوونی مرۆڤ و هەموو سیفەتەکانی تێدایە، و لە چەند یەکەیەکی بۆمـاوەیی پێکهـاتوون کـە پێیـان دەووترێـت جینـەکان، و لـە هـەموو ٤٦ کرۆمۆسـۆمەکەی پێکهێنەری خانەکانی لەشدا نزیکەی (١٠٠٠٠٠) جین هەیە کە هەر یەکەیان تایبەتـە بە سیفەتێك و وردەکارییەکی لەش یان نەخۆشیەکی دیاری کراوەوە.

وەك ووتمان لە هەموو خانەیەکی لەشدا ٤٦ کرۆمۆسـۆم هەیـە، زانایـان دەڵـێن ئەگەر بێتو پێچاوپێچی و لوول خواردنی دوو پەیژەی ئـەم کرۆمۆسـۆمانەی هـەموو خانـەکانی لـەش بکەینـەوە و بیانـدەین لەیـەك، ئـەوا درێژییەکـەیان دەگاتـە ٦ × ١.٠٠٠.٠٠٠.٠٠٠.٠٠٠ مەتر، کە دەکاتە مـاوەی ٨.٠٠٠ جـار چـوون و هـاتن لـە نێـوان زەوی و مانگدا!!

ئـەم کرۆمۆسـۆمانە ئەوەنـدەیان زانیـاریی تێدایـە کـە لـە هـەزاران بەرگـدا کۆناکرێنەوە، بابشزانین کە قـەبارەی خانـە تـەنها لـە بەشـێك لـە ١٠ملیـۆن بەشـی میللیمەترێك سێجا تێناپەڕێت و دووریی نێوان تەنەکانی ناوی بە نانۆمەتر (کە یەك بەشە لە بلیۆن بەشی مەترێك) دەپێورێت.



کرۆمۆسۆمەکان کە هەڵگری هەموو سیفاتەکانی ئادەمیزادن. ئەگەر یەکێکیان بکەینەوە دەبینین لە لوولپێچێک لە دوو ڕیز ترشی ناووکی پێهاتووە




ماددەی بۆماوەیی (کرۆمۆسۆمەکان)
لە نێرینە و مێینەی مرۆڤدا

بـا ئێسـتاش چـەند نموونەیـەك لـە ئاماژەکـانی قورئـان و سـوننەت لـەبواری بۆماوەزانیدا باس بکەین:

## نموونەی یەکەم: ئەندازە بۆدانانی نوتفەی مرۆڤ

لە ئایەتێکی قورئاندا هاتووە: ﴿قُتِلَ الْإِنسَانُ مَا أَكْفَرَهُ، مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ، مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ﴾ (عبس: ١٧-١٩)، واتە: تیا چوون بۆ مرۆڤ بێت کە ئەوەندە بێباوەڕی دەکات!، ئەی باشە بۆ سەیر ناکات کە لە چییەوە دروست بووە، ئەو سەرەتا لە تنۆکێك ئاوەوە دروستمان کرد کە یەکسەر ئەندازەمان بۆ دانا، واتە: پەروەردگار مرۆڤی لە (نطفة)وە دروست کردووە و ئەندازەی هەموو شتێکی بۆ دیاری کردووە.

کۆرپەلەی مرۆڤ لە ئەنجامی یەکگرتنی خانەکانی زاووزێی پیاو و ئافرەتەوە (کە بریتین لە یەك سپێرم و یەك هێلکۆکە) دروست دەبێت، کە یەکی تەنها نیوەی ژمارەی کرۆمۆسۆمەکانی خانەکانی مرۆڤیان تێدایە (واتە ٢٣ کرۆمۆسۆم)، ئەم قۆناغە بریتییە لە سەرەتای راستەقینەی پەیدابوونی مرۆڤ، چونکە لە ئەنجامی یەکگرتنی ٢٣ کرۆمۆسۆمی تۆوی پیاو و ٢٣ کرۆمۆسۆمی هێلکەی ئافرەت، ژمارەی تەواوی کرمۆسۆمەکانی لەشی مرۆڤ دروست دەبێت، کە بریتییە لە ٤٦ کرۆمۆسۆم، و هەموو هەنگاوەکانی گەشەکردنی کۆرپەلەکە لە داهاتوودا لەسەر ئەم بناغە راستە سەرچاوە دەگرێت.

کەواتە ئەم کردارە بریتییە لە هەنگاوی یەکەم بۆ پەیدابوونی زیندەوەرێکی نوێ و ناوازە، کۆرپەلەزانان بۆمان باس دەکەن کە دوای چەند سەعاتێکی کەم لە دروست بوونی خانەی یەکەمی کۆرپەلە کردارێکی تر دەست پێدەکات کە سەرەنجامەکەی بریتییە لە ئەندازە بۆدانان و دیاری کردنی سیفاتەکانی داهاتووی کۆرپەلەکە لە:

دەرکەوتنی سیفەتە بەهێز و زاڵەکان (Dominant Characters)، و دەرنەکەوتنی سیفەتە لاواز و بەزیوەکان (Recessive Characters)، کەواتە لێرەوە ئەندازە بۆ سیفەتەکانی کۆرپەلەکە دیاری دەکرێت.

ئەمانەش هەر لە دیاری کردنی رەگەزی کۆرپەلەکەوە دەست پێدەکات، پاشان ئەندازە بۆدانان و دیاری کردنی رەنگی قژ، رەنگی پێست، درێژی بالای، جۆری خوێن، زیرەکی، هەموو سیفەتەکانی دیکەش هەر لە تۆی پیاو و هێلکەی ئافرەتەکەوە (کە ئەو نطفەیە و پاشانیش کۆرپەلەکە دروست دەکەن) بۆ منداڵەکە دەگوێزرێتەوە بەهۆی کرۆمۆسۆمەکانەوە، کە وەك باسمان کرد ئەم کرۆمۆسۆمانە و جینەکانی سەریان بەهۆی ترشەلۆکە ناووکیەکانەوە (DNA) شیفرەی دروست کردنی ئەو سیفەتانەیان تێدایە، ولە دوارۆژدا ئەو سیفەتانە بۆ منداڵەکە دروست دەکەن، کەواتە هەر لەگەڵ دروست بوونی نوتفەدا کە بناغەی یەکەمی مرۆڤە ئەندازەی سیفەتەکانی بۆ دادەنرێت.

## نموونەی دووەم: سیفەتی زاڵ و سیفەتی بەزیو

بە گەڕانەوە بۆ راستییە زانستییەکان بە تایبەتی راستیەکانی زانستی کۆرپەلەزانی و بە تایبەتی تر بۆماوەزانی (علم الوراثة Genetics)، ئەم بابەتەمان بۆ روون دەبێتەوە، ئەم زانستە بۆی سەلماندووین لە زیندەوەرەکاندا ٢ جۆر سیفەتی بۆماوەیی هەیە:

١- سیفەتی زاڵ (Dominant): ئەوەیە کە ئەگەر تەنها لە یەکێك لە باوانەوە (دایك یان باوکی زیندەوەرەکەوە) بۆی بمێنێتەوە ئەوا بەمسۆگەری لە داهاتوودا لە کۆرپەلەکەدا دەردەکەوێت. بەڵام

٢- سیفەتی بەزیوو (Recessive): ئەوەیە کە ئەگەر لە دایك یان لە باوکیەوە بە تەنها بۆی بمێنێتەوە، ئەوا لە کۆرپەلەکەدا ئەو سیفەتە دەرناکەوێت، بەڵکو پێویستە ئەو سیفەتە بەزیوە لە هەردوو دایك و باوکەکەدا هەبێت و بۆ منداڵەکە بگوێزرێتەوە بۆ ئەوەی لە داهاتوودا لە کۆرپەلەکەدا بە مسۆگەری دەرکەوێت.

پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگار و پێغەمبەرە بەڕێزەکەی، دەبینین ئەم ڕاستییە لە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاماژەی پێدراوە، ئەوەتا دەبینین کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە پەروەردگار دەپاڕایەوە، لە یەکێك لە نزاکانیدا دەیفەرموو: ﴿مَتِّعْنا اللّهم بِأَسْماعِنا وَأَبْصارِنا وَقُوَّتِنا أَبَداً ما أَحْيَيْتَنا، وَاجْعَلْهُ الوارِثَ مِنّا﴾ (حديث حسن رواه الترمذي و النسائي) واتە: ئەی پەروەردگار خۆشیمان پێ ببەخشە بە گوێکانمان و بە چاوەکانمان، و بە هێز و قووەتمان هەتا لە ژیاندا ماوین، و کە مردین ئەمە بکە بە سیفەتێکی زاڵ بۆ نەوەکانی پاش خۆمان، بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە کە دەفەرموێت: (وَاجْعَلْهُ الوارِثَ مِنّا) کە بە (إسم فاعل) هێناویەتی، واتە مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەیە: ئەو سیفەتانە خۆیان بکەر(فاعل) بن و سیفەتەکان لە نەوەکانی داهاتوودا بە دڵنیاییەوە دروست بکەن، کە وەك ووتمان ئەم بۆچوونە بە ووشەی زانستی بۆماوەزانی ئەمڕۆ پێی دەڵێین سیفەتی زاڵ.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلَاماً أَسْوَدَ وَإِنِّي أَنْكَرْتُهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): « هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ »، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «مَا أَلْوَانُهَا»، قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: « فَهَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ »، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): « فَأَنَّى هُوَ »، قَالَ: لَعَلَّهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ لَهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): « وَهَذَا لَعَلَّهُ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ لَهُ»﴾ (رواه مسلم) واتە: پیاوێکی دەشتەکی هات بۆلای پێغەمبەر و پێی ووت: خێزانەکەم منداڵێکی ڕەشی بووە کە من ڕەش نیم و لە من ناچێت! پێغەمبەر(ﷺ) (بۆ ئەوەی تێگەیشتنی ئەم بابەتەی لا ئاسان بکات) لێی پرسی: تۆ ووشترت هەیە؟ ئەویش ووتی: بەڵێ، پاشان پێی ووت: ڕەنگیان چۆنە؟ ئەویش ووتی: سوورن، ووتی: باشە سپی ڕەنگیان تێدا نییە؟ ووتی: بەڵێ سپی تێدایە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی ووت: ئەوە تۆ چۆن دەیبینیت (ئاوا ووشترێکی

سپی له نێوان ئەو ووشترە سوورانەدا لەدایك بووه)؟ کابرا ووتی: لەوانەیە ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ڕەگێکی پێشتر بێت و بۆ ئەم مابێتەوە ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: دەبزانە لەوانەیە ڕەنگی منداڵەکەشت هەر بریتی بێت لە ڕەگێکی بۆماوەیی پێشترتان و بۆ ئەم ماوەتەوە، زاراوەی فەرموودەکە بەم شێوەیە هاتووە.

ئەم فەرموودە پیرۆزە ٢ ئاماژەی بۆماوەیی گرنگی تێدایە کە زۆر تازە دۆزراونەتەوە لەم ڕۆژگارەدا، ئەوانیش ئەوەیە کە:

١- زۆر سیفەت هەیە بەزیوە.

٢- زۆر سیفەتی تریش هەیە کە لە وەچەیەکدا دەردەکەوێت بەڵام پاشان چەند وەچەیەکی تر دەپەڕێنێت و لە وەچەکانی داهاتوودا دەردەکەوێت، ئەمە دەیسەلمێنێت کە بەڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) لەخۆیەوە قسەی نەکردووە: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هەمان ئەو بۆچوونە هاتووە کە زۆر سیفەت هەیە لە باوك و دایکەوە بۆ نەوەکانیان دەگوێزرێنەوە کە دەفەرموێت: ﴿تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُم فَإِنَّ العِرْقَ دَسَّاس ...﴾، واتە: بزانن کە کێ هەڵدەبژێرن ببێت بە هاوسەرتان و شوێنی نوتفەکانتان لەبەر ئەوەی کە ڕەگی خراپ هەروەك ڕەگی چاك بۆ نەوەکان دەگوێزرێتەوە، کەواتە ئەو سیفەتانەی کە مرۆڤ هەیەتی زۆری بەهۆی بۆماوەوە لە باو و باپیرانیەوە بۆی دەگوێزرێتەوە بەهۆی جینەکانی سەر کرۆمۆسۆمەکان.

## نموونەی سێیەم: دروست کردنی ژیان و مردن

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١) الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ (٢)﴾

(سورة الملك)، هەروەها لە سوورەتی (الواقعة)دا دەفەرموێت: ﴿نَحْنُ خَلَقْنَاكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ{٥٧} أَفَرَأَيْتُم مَّا تُمْنُونَ{٥٨} أَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ{٥٩} نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ{٦٠}﴾.

وەك لەپێشتریشدا باسمان کرد لەم ئایەتە پیرۆزانەدا ئاماژە بۆ ئەوە هاتووە کە خوای گەورە هەر لەگەڵ دروست کردنی مرۆڤدا مردن و هۆکارەکانیشی لەگەڵ دروست کردووە، دەرکەوتووە لەرووی بۆماوەییەوە هۆکارێکی سەرەکی پیر بوون و پاشان مردن لەناو کرۆمۆسۆمەکان خۆیاندا هەیە، کە ساڵانە سەلماوە لە درێژی ئەم کرۆمۆسۆمانە کەم دەبێتەوە، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە توانای خانەکانی لەش بۆ نویێ بوونەوە ساڵانە کەم ببێت و سەرەنجام پیربوون روودەدات، چونکە گرنگترین شتێك کە پارێزگاری لە بوونی مرۆڤ دەکات بریتییە لەم نوێ بوونەوەیە (هەموو ٧ ساڵ جارێك زوربەی خانەکانی لەش نوێ دەبنەوە و تۆ دەبیت بە مرۆڤێکی نوێ)، ئەگەر ئەم کردارە پەکی بکەوێت سەرەنجام پیربوون و مردن روودەدات.

هەروەها زانستی نوێ بۆی سەلماندووین کە مرۆڤ تۆو و هۆکاری مردنی خۆی هەر لە کاتی دروست بوونیەوە هەڵگرتووە لەناو کرۆمۆسۆمەکان و جینەکانیدا، سەلماوە کە زۆر جین هەن رۆڵی سەرەکی دەبینن لە تووش بوونی مرۆڤ بە نەخۆشیە شێرپەنجەییەکان، و هەندێکی تر دەبنە هۆی دابەزاندنی بەرگریی مرۆڤ دژی نەخۆشیەکان و لاوازی دەکەن، وەك ئەوەی کە لە نەخۆشی (ئەیدز)دا روودەدات، و هەندێکی تر پەیوەندیی راستەوخۆیان هەیە بە پەیدابوونی نەخۆشیەکانی خوێنبەرەکان و نەخۆشی شەکرە.

ئەم جینانە لەو جۆرانە نین کە یاساکانی بۆماوەزانی (مەندل)یان بەسەردا دەچەسپێت، بەڵکو تایبەتن بە کارلێکە بایۆلۆجی و کیمیایی ژینگەیی و زیندە چالاکیەکانەوە، زوربەی نەخۆشیەکان لە یەك هۆکارەوە پەیدانابن بەڵکو فرە

فاکتەرن، لەوانە: فاکتەرە ژینگەییەکانی وەك ماددە کیمیاییەکان و پیسبوونی ژینگە و دەرمانەکان و تیشکدان و خۆراك و زیندەوەرە وردەکانی وەك ڤایرۆس و میکرۆبەکان، هەروەها چەندین فاکتەریش هەیە کە لەناو لەشی مرۆڤ خۆیدایە، کە گرنگترینیان ئەو جینە بۆماوەییانەن کە هەڵیاندەگرێت، ئەم فاکتەرانەن کە لە کۆتاییدا دەبنە هۆی لەناوبردنی مرۆڤەکان.

## نموونەی چوارەم: جیاوازی رەنگ و شێوەی زیندەوەران و مرۆڤەکان

لە ئایەتێکدا هاتووە: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ، وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاء إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ (فاطر:٢٧-٢٨) واتە: ئایا سەرنجت نەداوە کە بەڕاستی خوا لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، جا ئێمە بەو بارانە جۆرەها بەروبوومی جیاوازمان دەرهێنا (کە ڕەنگیان، قەبارەیان، تامیان، بۆنیان، شێوەیان، شوێنیان، وەرزیان) جیاوازە، هەروەها هەندێ لە کەژ و کێوەکانمان بە زنجیرە ڕێڕەوێك کێشاوە، هەیانە چین و هێڵ و نەخشی سپی و سوورە و ئەوانیش ڕەنگیان جیاوازە، هەشیانە ڕەشێکی تاریك و تۆخە، هەروەها بەو شێوەیەش لە خەڵکیش، لە گیانداران و ماڵاتیش جۆرەها ڕەنگ و شێوە و قەبارەی جیاواز هەیە، بەڕاستی هەر زاناکان پەی بەو نهێنیانە دەبەن و لەناو بەندەکانی خوادا ئەوان زۆر بەچاکی لەخوا دەترسن .......

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِن مَّاء فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاء إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (النور:٤٥)، واتە: هەروەها خودا هەموو زیندەوەرێکی لە ئاوێکی تایبەت دروست کردووە، جا هەیانە لەسەر سکی دەڕوات، هەیشە لەسەر

دوو قاچ، هەیشە لەسەر چوار پێ دەڕوات، خودا هەرچی بوێت دروستی دەکات، بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

زیندەوەرزانی نوێ ئەو ڕاستیەی بۆ دەرخستووین کە لەگەڵ ئەوەی هەندێك لێکچوون هەیە لەنێوان زیندەوەران لە شێوەی دەرە و گەشەکردنیاندا، بەڵام هەر لە سەرەتای دروست بوونیانەوە لەیەکتر جیاوازن و پێکهاتەی تایبەت بەخۆیان هەیە لەرووی بۆماوەییەوە، ئەم ڕاستیە جیاوازی ژمارەی کرۆمۆسۆمەکان لە زیندەوەراندا بۆمان دەسەلمێنێت، بڕوانە ئەم خشتەیەی خوارەوە:

| زیندەوەر | ژمارەی کرۆمۆسۆمەکان |
|---|---|
| مرۆڤ | ٤٦ |
| مەیموون | ٤٨ |
| کەروێشك | ٤٤ |
| بەراز | ٤٠ |
| مەڕ | ٥٤ |
| ئەسپ | ٦٦ |
| سەگ | ٧٨ |

لەلایەکی ترەوە بیردۆزی نوێی جیاوازبوونی خانەکان باسی ئەوە دەکات کە لە هەموو خانەیەکی مرۆڤدا هەموو سیفەتەکانی ئادەمیزادی تێدایە، بەڵام لە هەر خانەیەکدا کردارێکی جیاواز بوون روودەدات کە تەنها چەند سیفەتێکی لەهەر خانەیەکدا دەردەکەون و سیفەتەکانی تر سەرکوت دەکرێن، واتە هەموو جینەکان

خامۆش دەبن تەنها ئەوانە نەبن کە بەرپرسیارن لە سیفەتە جیاکەرەوەکانی هەر خانەیەکی مرۆڤ.

کەواتە هەر خانەیەك هەموو سیفەتەکانی ئادەمیزادی تێدایە، بەڵام ئەوەیە لە هەندێك کەسدا هەندێك سیفەتی تایبەتی دەردەکەون کە لە کەسانی تردا نییە، ئەمە بریتی لە هۆکاری جیاوازیی زیندەواران و جیاوازیی خەڵکی لە سیفەتەکانیان و رەنگیان و راددەی ژیریی و توانا لاشەییەکانیان و شتەکانی تریشدا، کەواتە هەر لە دروست بوونی مرۆڤەکانەوە ئەم جیاوازییانە هەیە بە تەواوەتی وەك ئایەتە پیرۆزەکان ئاماژەیان پێداوە.

یەکگرتنەوەی ئەم دەقانە لەگەڵ راستیە زانستیەکاندا دووپاتی گەورەیی سەرچاوەکەیمان بۆ دەکاتەوە، ئێمە ئەگەر ئەمانەمان زانی و قەناعەتمان پێکرد دەبێت قەناعەت بەوەش بکەین کە ئەو کەسەی ئەم ووتانەی ناردووە شایەنی ئەوەیە کە بیپەرستین، و هەر ئەویشە باسی زیندوو بوونەوە و رۆژی دوایی بۆ کردووین، و پێویستە لەسەرمان پابەندی فەرمانەکانی ببین و شوێن پەیامە نێردراوەکەی بکەوین.

هیوادارم خوای گەورە یارمەتیدەری هەموو لایەکمان بێت بۆ ئەوەی پابەند بین بە بەرنامە پیرۆزەکەیەوە، خوای گەورە لە تاوانی هەموو لایەکمان ببورێت و لە کەسە سەرفراز و سەرکەوتووەکان حیسابمان بکات.

**سەرچاوەکان:**


- قورئانی پیرۆز.

- تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان.

- ئاماژەکانی کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەتدا/ د.کاوە فەرەج سەعدون/ چاپی یەکەم - ٢٠٠٦.

- إعجاز القرآن فيما تخفيه الأرحام/ كريم نجيب الأغر/ دار المعرفة - ٢٠٠٤.

- گۆڤاری (الإعجاز العلمي)/ ژمارە (١٦)ی رەجەبی (١٤٢٤ك - ٢٠٠٣ز)/ کە لەلایەن (الهيئة العالمية للإعجاز العلمي في القرآن والسنة)وە دەردەچێت.

- گۆڤاری (الإعجاز)/ ژمارە (٣)ی رەبیعی دووەمی (١٤١٨ك).

- گۆڤاری (الإعجاز العلمي)/ ژمارە (٤)/ ١٤٢٠ك -١٩٩٩ز.

- گۆڤاری (الإعجاز العلمي)/ ژمارە (٥)ی رەمەزانی (١٤٢١ك) - کانوونی یەکەمی (٢٠٠٠).

# ئیسلام وئازادییه گشتییه‌كان
# ئازادی بیروباوه‌ڕ وه‌ك نموونه

تویژینه‌وه‌یه‌كه پیشكه‌ش به كۆنگره‌ی:

(ئازادی وشه‌ریعه‌ت – دژایه‌تی یان ته‌واوكاری) كراوه

له سازدانی:

(سه‌نته‌ری زه‌هاوی بۆ لێكۆڵینه‌وه‌ی فیكری)

(١٤٣٦ك – ٢٠١٥ز)

﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾

{البقرة:٢٦٥}

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾

{الحديد:٢٥}

## پێشەکی

هەر لەوکاتەوەی پەروەردگار مرۆڤی دروستکرد ولەسەر زەوی نیشتەجێی کرد ئینسانەکان عاشقی ئازادین، ئیسلامیش کە ئاینی سروشت وفیترەتی مرۆڤە بۆ ئەوە هاتووە کە ئارەزوو وپێویستیەکانی مرۆڤەکان تێربکات، ئازادیش بەکۆی دەنگی هەموو مرۆڤەکان بەجیاوازی نەتەوە وئایینەکانیان بریتیە لە یەکێك لە وویست وئارەزووە سەرەکیی وسروشتیەکان لەناخی هەموومرۆڤێکدا.

مافەکانی مرۆڤ وئازادییەکانی بەشێکن لە کەسایەتی مرۆڤ، کاملبوونی مرۆڤایەتی ئادەمیزاد بەندە بەراددەی ئەو مافانەی کە بۆی دەستەبەر دەکرێت وئەو ئازادییەی کە پێی دەبەخشرێت، هەربۆیە ووتراوە مرۆڤ کاتێك مرۆڤە کە ماف وئازادیی هەبێت، هەربۆیە باوەڕهێنان بە ئازادیی وشانازی پێوەکردنی کاری زۆر لە بیرمەندان وسیستمە سیاسیەکانی جیهان بووە، زۆر لەبیرمەندان ئازادیی بەبنەمای هەموو بەهاکان دادەنێن هەروەك (مۆنتسکیۆ) دەڵێت: ئازادیی بریتیە لەو باشەی هەمووباشەکانی تری لێوە هەڵدەقوڵێت [٨٩].

مێژوو فێری کردووین لەو سەردەمانەی تاکەکانی کۆمەڵگا بوار بۆ خۆدەرخستن ودەربڕینی رەخنە وبۆچوونەکانیان ونەیاربوونیان کرابووەوە، هەر ئەو سەردەمانە بووە کە مرۆڤایەتی بەرەوپێش چووە وهەرکاتێك ستەم وچەوسانەوە وداماڵینی ماف وئازادییەکان زاڵبووە نە شارستانییەت هەبووە ونە پێشکەوتن، کەواتە شارستانییەتەکان کەسە ئازادەکان بنیاتی دەنێن کە خاوەنی عیززەت وڕێز وشکۆ ومتمانە بەخۆ بوونن.

بابەتی ئازادییە گشتییەکان شوێنێکی گرنگی داگیرکردووە لە فیکری یاسایی سیستمە سیاسیە جۆراوجۆرەکانی جیهاندا، لە وولاتانی رۆژئاوادا چەسپاندنی

---

[٨٩] بڕوانە: د. مصطفى أبوزيد: الحرية في الحرية والإشتراكية والوحدة، لاپەڕە: ١٧.

ئازادییە گشتییەکان لە یاساکاندا بەروبومی ئەوهەوڵ وکۆششە دوور ودرێژ وشۆڕشانە بووکە میللەتانی رۆژئاوا دژی کاربەدەستە ستەمکارەکان بەرپایانکرد وتوانیان ئازادییان ومافیان لەژیانێکی سەربەست وئاسایشدا وەرگرن.

ئازادییە گشتییەکان یەکێکە لە گرنگترین بابەتەکانی یاسای دەستووری، کە ئەمیش بریتییە لە باوکی یاساکان، ئەم بابەتە گرنگی دەدات بەو ئازادییە گشتیانەی کە دەستوور بۆ هاولاتیانی دەستەبەر دەکات، وخۆی دەبینێتەوە لەکۆی مافە بنەڕەتی وتاکەکەسی وبەکۆمەڵی مرۆڤ وهاوولاتیان لە دەولەتدا.

لێکۆڵینەوە لە ئازادییە گشتییەکان لە ئیسلامدا بەشێکی دانەبڕاوی لێکۆڵینەوەیە لە سیستەمی سیاسی لە ئیسلامدا، ئەم لێکۆڵینەوەیە پێش هەمووشتێك بڕیاری ئەوە دەدات کە ئیسلام یاسایەکی گشتگیرە بۆ ژیانی مرۆڤەکان بەتاك وکۆمەڵیانەوە، وهەموبەشەکانی لە بیروباوەڕ وشەریعەت وپەرستشەکان ویاسا رەووشتیەکان ومەبەستەکانی پێکەوە گرێدراون وبواری لێکترازاندیان نییە.

ئیسلام لە بابەتی رێکخستنی دەولەتدا بەدانانی چەند بنەمایەکی گشتی ودیاریکردنی مەقاصدەکان ونەچوونە ناو ووردەکاریی زۆر لەم بابەتانەوە بوارێکی گەورەی هێشتۆتەوە بۆ فیکری مرۆڤی موسوڵمان کە بەردەوام لەکار وکۆششدابێت وسوود وەرگرێت لە هەوڵەکانی مرۆڤایەتی لەم بوارانەدا بۆ دامەزراندنی سیستمێکی سیاسی بەردەوام تازەبووەوە کە خزمەتی هەموو مرۆڤایەتی بکات.

سیاسەتی شەرعی مەبەستێتی دادپەروەری بەرپابکات ودژایەتی ستەم بکات لەسەر زەویدا، کاتێکیش ئیسلام لەبابەتی حوکمڕانیدا تەنها بنەماکانی داڕشتووە ئەمەی لە متمانەیەوە بە ژیریی مرۆڤەکان داناوە، ومەبەستێتی ئازادیی بەردەوامیان پێبدات وبەکردەوە نەمریی ئیسلام وگونجانی بۆ هەموو کات وسەردەمێك بچەسپێنێت، لێرەوە زۆر سروشتییە کە سیاسەتی شەرعی کراوەبێت

بەرامبەر هەمووکەلەپووری مرۆڤایەتی لە فیکری سیاسیدا وسوودی هەمەجۆریان لێوەرگرێت بەمەرجێك گونجاوبێت لەگەڵ مەبەستەکانی ئیسلام وبەهاکانیدا ودژنەبێت لەگەڵ مەبەستە هەرە گەورەکەی لە چەسپاندنی دادپەروەریدا.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿الذين يستمعون القول فيتبعون أحسنه، أولئك الذين هداهم الله وأولئك هم أولوا الألباب﴾ (الزمر:١٨) واتە: ئەوانەی گوێ دەگرن بۆ قسە وگوتار، ئینجا شوێن چاکترینی ئەو قسانە دەکەون، ئەوانە کەسانێکن خودا رێنموونی کردوون وهەر ئەوانەن خاوەنانی ژیر وهۆش.

ئیمامی (ابن القيم) دەڵێت: (السياسة الشرعية مدارها العدل ولولم ينص عليه وحي، ذلك أن الله أرسل رسله وأنزل كتبه ليقوم الناس بالقسط وهو العدل الذي قامت به السماوات والأرض، فإذا ظهرت إمارات الحق وأسفر وجهه بأي طريق كان فثم شرع الله ودينه) [٩٠]، واتە: سیاسەتی شەرعی لەسەر دادپەروەری دامەزراوە وبەدەوری دەسوڕێتەوە ئەگەر دەقی وەحیشی لەسەر نەهاتبێت، ئەویش لەبەرئەوەیە کە خودا پەیامبەرانی ناردووە وکتێبە ئاسمانییەکانی دابەزاندووە بۆ ئەوەی خەڵکی دادپەروەری بەرپابکەن کە یاسایەکە ئاسمانەکان وزەوی لەسەر دامەزراوە، هەرکاتێکیش نیشانەکانی راستیی ودادپەروەری دەرکەوتن وخۆیان نیشاندا جا بەهەر شێوەیەك بێت ئیتر ئەوە جێبەجێ کردنی شەرعی خودا وئاینەکەیەتی.

هەروەها دەڵێت: (السياسة ماكان فعلاً يكون معه الناس أقرب الى الصلاح وأبعد عن الفساد، وإن لم يضعه الرسول ولانزل به وحي، فأي طريق استخرج بها العدل فهي من الدين) [٩١] واتە: سیاسەت بریتییە لە کارێك کە بەهۆیەوە خەڵك نزیکتر دەبن لە چاکەکاریی ودوور دەبن لە خراپەکاریی، تەنانەت ئەگەر

---

[٩٠] بڕوانە: الطرق الحكمية في السياسة الشرعية لإبن القيم الجوزية، لاپەڕە (١٥-١٦).

[٩١] هەمان سەرچاوە.

پێغەمبەریش داینەنابێت یان بەوەحی دانەبەزیبێت، هەر ڕێگایەکیش بەهۆیەوە دادپەروەریی بەرپابکرێت بریتییە لە بەشێك لە دین.

لەلایەکی ترەوە ئازادیی بیروباوەڕ لەئیسلامدا بریتییە لە بناغەی ماف وئازادییەکان، بنەمای گشتی لەم بابەتەدا بریتییە لەو ئازادی بیروباوەڕەی کە ئایەتی:﴿لا إكراهَ في الدين﴾ (البقرة:٢٥٥) واتە: بەهیچ جۆرێك زۆر لێکردن لەدیندا نییە (بۆ هاتنەناو ئیسلام)، بەشێوەیەکی قەتعی بڕیاری لێداوە، لەسەر ئەم بنەمایەیە کە کۆمەڵگەی ئیسلامی جیاوازی ئاینی وڕۆشنبیریی وسیاسی قبوڵ دەکات، دەوڵەتی ئیسلامی بەدرێژایی مێژووی موسوڵمانان وهەر لە سەرەتای دەوڵەتی مەدینەوە جیاوازی ئایینی ناسیوە ودانیپێداناوە وپارێزگاریشی لێکردووە، لەکاتێکدا ڕۆژئاوا لە تاریکی ڕەگەزپەرستیدا چەندین سەدەی تاریکی پێپەڕاند کەتێیدا جەنگی ئایینی بەرپادەکرد تا ئەو کاتەی لێبوردەیی ئایینی لە موسوڵمانانەوە فێربوو [٩٢].

لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵدەدەم بابەتی ئازادییە گشتییەکان لەئیسلامدا شیبکەمەوە وبەتایبەتیش ئازادی بیروباوەڕ وەك نموونەیەکی ئەم ئازادییە گشتیانە باس بکەم، لێکۆڵینەوەکە لە ٣ بەش پێکدێت:

بەشی یەکەم باسێکی شیکەرەوەیە بۆ چەمکی ئازادی وپاشان ئازادییە گشتییەکان لە چەند تەوەرەیەکدا.

بەشی دووەم دەربارەی ئازادییە گشتییەکانە لە فیکر وسیستمی سیاسی ئیسلامیدا.

بەشی سێیەم تەرخان دەبێت بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتی ئازادیی بیروباوەڕ لەئیسلامدا، بیروباوەڕ بناغەی ئازادیی ومافەکانی مرۆڤە لە ئیسلامدا، وچەندین تەوەری تر.

---

[٩٢] بڕوانە: الحريات العامة في الدولة الإسلامية: الشيخ راشد الغنوشي، لاپەڕە ٤٤-٥٢.

# بەشی یەکەم
# ئازادییە گشتییەکان

## تەوەرەی یەکەم: چەمکی ئازادی

لەراستیدا ئازادی شتێکی ناسراو وروونە لای زوربەی مرۆڤەکان، ووشەی (ئازادی- الحرية) لە زمانەوانیدا لە (ئازاد- الحر)ەوە هاتووە واتە ئەو کەسەی واز لە کردارە نزمەکان دێنێت ودەست دەگرێت بە کردار ورەوشتە بەرزەکانەوە، لەرووی پێناسەی زاراوە وچەمکیشەوە یەکێکە لەو بابەتانەی جیاوازییەکی زۆر هەیە لە پێناسەکردن وناساندنی لە رووی یاسایی وسیاسیەوە، تەنانەت هەندێك باوەڕیان وایە کە ووشەی ئازادی مانا ونرخێکی زیاتری پێدراوە وەك لەوەی خۆی شایەنێتی.

بۆ نموونە بیرمەندی فەرەنسی (ڤۆڵتێر) دەربارەی ئازادی دەڵێت: (کاتێك بتوانم هەر شتێك بمەوێت بیکەم ئەوە ئازادی منە)، بەڵام فەیلەسوفی فەرەنسی (جۆن لوك) دەڵێت: (ئازادی بریتییە لە مافی ئەنجامدانی هەمووکارێك کە یاسا ڕێی پێدەدات) [٩٣].

لەرابوردوودا ئازادی تەنها مەبەست پێی پاراستنی تاکەکان بوو لە ستەمکاری دەسەڵاتداران وکۆتکردنی دەسەڵاتەکانی فەرمانڕەوایان، ئەم کۆتکردنەش بە ٢ ڕێگا ئەنجامدەدرا:

یەکەم: ناچارکردنی دەسەڵاتداران بۆ بەخشینی چەندین زەمانەت وپەیمان کەبە (مافە سیاسیەکان) دەناسرا ودەستدرێژی کردنە سەریان شەرعیەتی دەسەڵاتی نەدەهێشت.

---

[٩٣] بڕوانە (محاضرات في الحريات العامة والديمقراطية) ئامادەکرنی: (د. مجيد حميد الحدراوي) لە کۆلیجی ئاداب- زانکۆی کوفە- لاپەڕە (٢).

دووەم: دیاریکردنی سنووریکی دەستووری کە بەپێی ئەمە رەزامەندی گەل یان نوێنەرەکانی مەرج بوون بۆ تێپەراندنی کارەکانی دەسەلات [٩٤].

پاشان ئەم بابەتە ووردە ووردە گەشەی کرد وئەم گەشە کردنە خۆی بینیەوە لە کۆمەلێك لە پەیماننامەی ناسراو لە وولاتە جیاوازەکاندا وەك (پەیماننامەی گەورە) لە ئینگلتەرا کە سالی ١٢١٥ز دەرچوو، و(راگەیاندنی مافەکان) کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لەسالی ١٧٧٦ز دەرچوو [٩٥].

لە راگەیاندراوی شۆرشی فەرەنسی بۆ مافەکانی مرۆڤ وهاوولاتیان لە فەرەنسا کە سالی (١٧٨٩ز) دەرچوو ئەم چەمکە زیاتر گەشەی کرد وئازادیی بەوە پێناسەکرا کە:

توانای مرۆڤە بۆ ئەنجامدانی هەرکارێك کە زیان بە خەلکانی تر نەگەیەنێت، هەروەها تێیدا بریاردرا کە مرۆڤەکان هەموویان بە ئازادی لەدایك دەبن، دوایش هەمان بریار لە راگەیاندراوی جیهانی مافەکانی مرۆڤ کە لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەرچوو لە سالی (١٩٤٨)دا جێگیرکرا، ئەمەش بە مایەی سەرکەوتنێکی گەورە ودەستپێشخەری دانرا لەبواری مافەکان وئازادییە گشتییەکان، بەبێ ئەوەی ئاگاداری ئەوەبن کە ئەم ئازادییە لە شەریعەتی ئیسلامیدا پێش ١٤٠٠ سال جێگیرکراوە وچەندین دەقی لەسەرهاتووە.

لێرەوە دەگەینە ئەو راستییەی کە هەموو لایەك بریاری ئەوەیانداوە کە مرۆڤەکان ئازادن ویەکسانن لە ئەرك ومافەکاندا وپێویستە لەسەر دەستوور ویاساکان پارێزگاریی لێبکەن وئەو هۆکارانە دەستەبەربکەن کە دەبێتە هۆی پاراستنیان لە ستەم ولادانی دەسەلات.

---

[٩٤] الحرية – جون ستيوارت ميل – ترجمة: طه السباعي – ص ٧.

[٩٥] الحقوق والحريات العامة في الدساتير العربية والفقه والقضاء والشريعة الإسلامية– د.عبدالعزيز محمد سلمان– ص ٤٧.

چەندین بەکارهێنان بۆ چەمکی ئازادییە گشتییەکان ئەنجامدراوە، کە مەبەست پێی ئەو ئازادییانەن کە دانیان پێدانراوە بەرامبەر بە دەسەڵاتی دەوڵەت ولێرەوە دەوڵەت لەسەری پێویستە کە دەستێوەردان بکات بۆ پارێزگاریی کردنی یاساییانە لەو ئازادییانە، بەمەش ئازادییە گشتییەکان دەبنە کۆمەڵێك مافی یاسایی کە دەوڵەت پێویستە لەسەری دابینیان بکات وبرەویان پێبدات.

## تەوەرەی دووەم:
## کێشەی ئازادییە گشتییەکان وچۆنێتی گەشەکردنی

چەمکی ئازادییە گشتییەکان گەشەکردنێکی گەورەی بەخۆوە بینیوە لەچاوپێشتردا، ئازادی بە لێکدانەوەی ئەم سەردەمە لە پێشتردا نەناسراوە، ئازادییە گشتییەکان لە سەدەی بیستەمدا بەتایبەتی پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە ووەك سەدەی پێشتر تەنها وەك هۆکارێك بۆ بەرپەرچدانەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت ودانانی کۆت بۆ دەسەڵاتداران سەیر نەکراوە، چونکە لەمڕۆدا ئەو باوەڕە چەسپاوە کە دەستێوەردانی دەوڵەت لە چالاکییە کۆمەڵایەتی وئابورییەکاندا کارێکی پێویستە بۆ رێگریکردن لە روودانی قەیرانە ئابورییەکانی وەك: هەڵاوسان وبێکاری وهەڵسان بەوکارانەی کە بەرژەوەندی گشتی دەیخوازێت.

هەر لێرەوە دانانی کۆت بۆ دەسەڵاتداران وەك دانانی یاسای ئازادییە گشتییەکان ولێپرسینەوەی نوێنەرانی گەل، رێگری دەکات لە زیادەڕۆیی دەسەڵات وچەوساندنەوەی هاووڵاتیان.

چەمکی ئازادی لەسەدەی بیستەمدا جیاوازییەکی زۆری هەبوو لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر ئەویش بەهۆی جیاوازی ئەوسیستمە سیاسییەی کە دەوڵەتەکان پەیڕەوی دەکەن [٩٦].

---

[٩٦] النظم السياسية في العالم المعاصر- د.سعاد الشرقاوي- ص ٢٨٤.

## تەوەرەی سێیەم:
## دەربارەی چەمکەکانی ئازادیی لەرۆژئاوادا

ئەم باسەمان لێرەدا باسێکی فەلسەفی نییە دەربارەی چەمکی ئازادی، چونکە بەردەوام ئەم لێکدانەوە عەقلانییە لە رۆژئاوادا بەنەفی کردنی ئەم بابەتە کۆتایی هاتووە وئازادیی بەخەیاڵ ووەهمێك ناساندووە، تەنانەت لەو حاڵەتانەشدا کە هەندێك لە رەوتە فەلسەفیەکان وایان نیشانداوە کە گەشتوونەتە دەرەنجامی پۆزەتیڤانە لە لێکۆڵینەوەیان بۆ ئازادی گیانێکی عەدەمی زاڵبووە بەسەریاندا، ومرۆڤی ئازادیان وا وێناکردووە کە بوونەوەرێکی خۆپەرستی گۆشەگیری تێکشکاوە کە هیچ رێگایەك نییە بۆ ئازادبوونی تەنها لە تێکشکاندنی هەموو بەهاکان وگرێکان نەبێت کە بە کەسانی ترەوە دەیبەستێتەوە، بەشێوەیەك کە هیچ مانایەك بۆ بوونە ئازادەکەی نامێنێتەوە تەنها لە خۆکوشتن وبێسنووریدا (العبثية) نەبێت [٩٧].

پاشتر ئەم لێکۆڵینەوەیە لە ئازادیی چڕبووەوە لە لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی تاکەکان بە دەزگا سیاسی وکۆمەڵایەتی وئابووریەکانەوە، واتە لە لێکدانەوەی کۆی گشتی مافەکانیان، لێرەوە ئازادی بووە مەبەستی تێکۆشانی گەلانی چەوساوە وچینە مافخوراوەکان وخاوەن ویژدانە زیندووەکان.

هەروەها بیرمەندە سیاسی ویاساییەکانیش هەوڵیاندا ئەم بوارانەی ئازادی رێکبخەن لە راگەیاندراوەکانیان بۆ مافەکانی مرۆڤ ولە دەستوورەکاندا، کە

---

[٩٧] رەوتی بوونگەرایی (الوجودية) بەڕابەرایەتی (سارتەر وکامۆ) دیارترین نموونەیە بۆ ئەم ئازادییە عەدەمیە، فەیلەسوفی ناودار (روجیە گارودی) ئەم گۆشەگیریەی مرۆڤی ئەم سەردەمە لێکدەداتەوە ودەڵێت: (مرۆڤ لە کۆمەڵگا ئەوروپیەکاندا حوکم دراوە بە گۆشەگیریی دوور لەخەڵکانی تر کە بەردەوام لە گەورەبووندا بووە هەر لەکۆنەوە تا ئەم سەردەمە ودوایین دارمانی جەماوەرە گۆشەگیرەکە بەهۆی فراوانبوونی کێبڕکێکانەوە). بڕوانە: وعود الإسلام– رۆجیە گارودی (بیروت– الدار العلمية).

پێویستبوو لەسەریان کۆی ئەو ئازادیانە دەستەبەر بکەن بۆ هاوڵاتیان کە مایەی چەسپاندنی کەسایەتی ماددی ومەعنەویان بێت، وبتوانن بەشداری بکەن لە بەڕێوەبردنی کاروبارە گشتییەکان، وچارەنووسی خۆیان دیاری بکەن دوور لە هەموو زۆردارییەك، ئەویش بەهۆی بەدەستهێنانی کۆمەڵێك لە ماف وئازادی، وەك مافی بیرکردنەوە وبیروباوەڕ ودەربڕین وکۆبوونەوە وکارکردن وهاتووچۆ وپەرستن وخاوەنداریێتی، بەڵام ئەوەی مایەی رەخنەبوو بۆ ئەم ئازادییانە ئەوەبوو کە ئەمانە ئازادی رووکەشی ونێگەتیڤانە بوون کە تەنها بە تیۆری ئەم توانایانە بەمرۆڤ دەدات ونەیدەپاراست لە چەوسانەوە، مافی ئەوەی هەیە کە بیربکاتەوە وخۆی دەربڕێت وهاتوچۆ بکات، بەڵام چۆن دەیتوانی ئەمە بکات لە کاتێکدا رۆشنبیریی وسامان ودەسەڵات لەلایەن دەستەیەکەوە قۆرخ دەکران کە بەتیۆری هەموان یەکسانن لەگەڵیان لە مافەکانیاندا.

لێرەوە رەخنەی ئەوە لەم ئازادیانە دەگیرا کە بۆرجوازییە بەهۆی ئەو بارودۆخەی کە تێیدا راگەیاندنەکانی مافەکانی مرۆڤ تێیاندا لەدایکبوون، کە پەیوەندی بەو ململانێیەوە هەبوو لەنێوان چینی نوێی بازرگان وسەرانی پیشەسازی لەگەڵ پاشاکان وسەرانی دەرەبەگایەتی وکلێسکان، بەرژەوەندی ئەم چینە نوێیە لە جاڕدانی مافەکانی مرۆڤدابوو بۆ نەمانی دەسەڵاتی پاشا وپیاوانی ئاینی بەسەریانەوە.

ئەمانە هەمووی بۆ لابردنی ئەو بەربەست وکۆتانە بوو کە سەرانی چینی کۆن دایاننابوو لەسەر کارە بازرگانی وپیشەسازییەکان، هەربۆیە فەیلەسوفی بەناوبانگ (برتراند راسل) پێناسەی ئازادی بەوە دەکات کە نەمانی بەربەستەکانە لە بەرامبەر هێنانەدی ئاواتەکان [٩٨].

---

[٩٨] بڕوانە (موسوعە السیاسة) – دانانی: د. عبدالوهاب الکیالی وچەند کەسێکی تر– المؤسسة العربیة للدراسات والنشر – ج٢ ص٢٤٤.

لەلایەکی ترەوە لەگەڵ بوونی راگەیاندنەکانی مافەکانی مرۆڤ لە رۆژئاوا بەڵام چەندین بەربەست لەبەردەم بەجێگەیاندنیاندا بوونی هەیە، تەنانەت هەندێك جار بەزۆرەملێیی بیروبۆچوونێکی دیاریکراو دەسەپێنرێت بەسەر جەماوەردا بەهۆی قۆرخ کردنی هۆکارەکانی پەیوەندی وراگەیاندنەکان وفێرکردن لەدەستی دەوڵەت وکۆمەڵێکی دیاریکراودا، وەك چەسپاندنی ئەوبیروبۆچونەی کە ئیسلام سەرچاوەی تیرۆر ومەترسییە بۆ سەر شارستانییەت.

مارکسییەتیش لەگەڵ بانگەوازی بۆ ئازادی ونەمانی کۆت وبەندەکان وتەنانەت لەکۆتاییدا نەمانی دەوڵەتیش، خۆی لەخۆیدا بووە هۆکارێکی داپڵۆسێنەر بۆ جەماوەر وسەرەنجام نەك دەوڵەت بوونی نەما بەڵکو رۆژ بەرۆژ بەهێزتر دەبوو وهەموو هۆکارەکانی ژیانی لای خۆی قۆرخ کرد وئەوەی بیویستایە بە دیکتاتۆریانە بەسەر جەماوەریدا دەسەپاند، لێرەوە ئەوەمان بۆ روون‌دەبێتەوە کە پاڵپشتی بانگەوازی ئازادییەکان لەرۆژئاوادا بەتەنها بریتی نییە لە باوەڕهێنان بەمرۆڤ چ تاك یان کۆمەڵ بێت وەك بەهایەکی رەها کە سەرچاوەی ماف وئازادییەکان بێت[٩٩].

## تەوەرەی چوارەم:

## جۆرەکانی ئازادییە گشتییەکان

هەوڵدان بۆ دابەشکاریی ئازادییە گشتیەکان مەبەست پێی تیشك خستنەسەر ناوەرۆکی ئەم ئازادییانە ودیاریکردنی چەمك ومەوداکانیانە، ونابێت لەمەوە ئەوە تێبگەین کە ئازادییە گشتییەکان دەتوانرێت لەیەکتری جودابکرێنەوە یان هەندێکیان دەستەبەر بکرێن وهەندێکیان فەرامۆش بکرێن، چونکە ئەم ئازادییانە لەراستیدا یەکتری تەواودەکەن وپشت بەیەکتری دەبەستن، وزۆرجار بۆ مومارەسە

---

[٩٩] بڕوانە: الحريات العامة في الدولة الإسلامية: الشيخ راشد الغنوشي، لاپەڕە ٣١-٣٥.

کردنی ئازادییەك پێویست بە دەستەبەرکردنی چەندین ئازادی تر دەکات، دەتوانرێت ئازادییە گشتییەکان بۆ ٣ بەشی سەرەکی دابەش بکرێن:

**یەکەم: ئازادییە کەسییەکان**: کە ٥ جۆر لەخۆدەگرێت:

١- ئازادیی هاتووچۆکردن (حرية التنقل).

٢- ئازادیی ئاساییش (حرية الأمن).

٣- ئازادیی نیشتەجێبوون (حرية المسكن).

٤- ئازادیی پەیوەندی کردن ونامە گۆڕینەوە (حرية المراسلات).

٤- ڕێزگرتنی سەلامەتی ژیریی مرۆڤەکان (إحترام السلامة الذهنية للإنسان).

**دووەم: ئازادییە فیکرییەکان**: کە ئەمانە دەگرێتەوە:

١- ئازادی بیروڕا (حرية الرأي).

٢- ئازادیی بیروباوەڕ یان ئازادیی ئاینی (حرية العقيدة أوالحرية الدينية).

٣- ئازادیی فێرکردن (حرية التعليم).

٤- ئازادیی ڕۆژنامەگەریی (حرية الصحافة).

٥- ئازادیی کۆبوونەوە (حرية الإجتماع).

٥- ئازادیی پێکهێنانی حیزب وکۆمەڵەکان (حرية تكوين الأحزاب والجمعيات).

**سێیەم: ئازادییە ئابوورییەکان**:

١- ئازادیی خاوەنداریی موڵك (حرية التملك).

٢- ئازادیی بازرگانی (حرية التجارة).

٣- ئازادیی پیشەسازی (حرية الصناعة) [١٠٠].

---

[١٠٠] الحقوق والحريات العامة في الدساتير العربية والفقه والقضاء والشريعة الإسلامية - د.عبدالعزيز محمد سلمان - ص ٤٨.

## تەوەرەی پێنجەم:
## ڕێژەیی ئازادییە گشتییەکان

چەمکی ئازادیی بەپێی کات وشوێن دەگۆڕێت، تەنانەت بەشوێنی کەسەکانیش لەکۆمەڵگادا دەگۆڕێت، بەشێوەیەکی گشتیش ئازادییەکان ناتوانرێت مومارەسە بکرێن تەنها لە کۆمەڵگایەکی سەقامگیر وئاسایشدا نەبێت، ناتوانرێت دانبنرێت بە ئازادییەکی گشتی رەها لە کۆمەڵگادا بەڵکو ئەم ئازادییانە ڕێژەیین و وەستاون لەسەر راددەی دژایەتیان لەگەڵ پێویستییەکانی کۆمەڵگادا، بۆیە پێویستە هەماهەنگی بکرێت لەنێوان پێویستیەکانی کۆمەڵگا وئازادی تاکەکان ولەنێوان ئازادییە گشتییەکان وسیستمی گشتیشدا، ناشکرێت دەستبەرداری یاسا وئەو دەسەڵاتەش ببین کە جێبەجێی دەکات بەبیانوی ئەوەی یاسا فشار لەسەر ئازادییەکان دروست دەکات [101].

ئەم ڕێژەییەش لە چەند شتێکدا خۆی دەبینێتەوە:

١- ئازادییە گشتییەکان کۆمەڵێك ماف نین کە رەهابن وسنووریان نەبێت، ونابێت لەپێناوی مومارەسە کردنیاندا قوربانی بە ماف وئازادی تر بدرێت، لە هەموو حاڵەتێکیشدا دەبێت سنووری مومارەسە کردنی ئازادییەکان بەرروونی شیبکرێنەوە.

٢- نابێت لە دەقە دستوورییەکاندا هیچ جۆرە دژبەیەکیەك هەبێت لەنێوان ماف وئازادییە گشتییەکاندا، وهەر دژبەیەکیەکی رووکەشیش دەبێت چارەسەر بکرێت بەهۆی ئەو سیستەمە یاساییە گشتییەی دامەزراوە لەسەر بنەمای یەکانگیریی دەستوور ویەکانگیریی کۆمەڵگا [102].

---

[101] النظم السياسية في العالم المعاصر- د.سعاد الشرقاوي- ص ٣٦١.

[102] الحقوق والحريات العامة في الدساتير العربية والفقه والقضاء والشريعة الإسلامية - ص ٥١.

## تەوەرەی شەشەم:
## هاوسەنگی نێوان ئازادییە گشتییەکان وبەرژەوەندییە گشتییەکان

دەستوور تەعبیر لەو بەها دەستوورییانە دەکات کە پارێزگاریی لە بەرژەوەندی گشتی دەکات وبەئاشکرا ئەم پارێزگارییەی لەو دەقانەدا دەبینرێت کە ئەرکەکانی دەوڵەت ودەسەڵاتەکانی رێکدەخەن، هەروەها دەستوور پارێزگاریی لە ماف وئازادییە جۆراوجۆرەکانیش دەکات، لەکاتی دیاریکردنی سنوری ئازادییەکانیش کارێك ناکات کە قوربانی بە بەرژەوەندی گشتی بدات، دەبێت ئاگاداری ئەوەش بین کە نابێت مافەکانی مرۆڤ وئازادییەکانی بەشێوەیەکی گشتی قوربانیان پێبدرێت لەغەیری زەرورەتێکی گرنگی وەهادا نەبێت کە بەرژەوەندیەکی گشتی موعتەبەر نەیخوازێت.

لەلایەنی کۆمەڵایەتی وئابووریدا پێویستە لەسەر دەوڵەت یاساکانی بازاڕ دیاری بکات، وپارێزگاریی لە ئازادیی مونافەسە و وەبەرهێنانی ناوخۆیی ودەرەکی وپاراستنی بەرهەمە ناوخۆییەکان لە بێبەها کردنیان بکات، ودەبێت بەشداری بکات لە بەرەوپێش بردنی ئەو پرۆژە گەورانەی کە تاکەکان ناتوانن بەتەنها بیگرنە ئەستۆیان، هەروەها دەبێت یاسایەکی کۆمەڵایەتی وەها دابنێت کە مایەی پارێزگاری کردنی هاوڵاتیان بێت دژی مەترسییەکان، وزەمانەتی هاوچانسی بکات بۆ هەموو کەسەکان ودژایەتی واستە وجیاکارییەکان بێت، ودەبێت هانی کارکردن بدات وگیانی هەستان بەپرۆژەکان بەهێزبکات.

لەبواری سیستمی دادوەریشدا هەروەك چۆن پاراستنی دادوەرییانەی مافەکان وئازادییەکان لەرێی تەجریم وسزادان دەبێت، وهەستان بە کردارە دادوەرییەکان مەبەست پێی دەرخستنی دەسەڵاتی دەوڵەتە لە سزادانی سەرپێچیکەراندا، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە قوربانی بدرێت بە ماف وئازادیی ئەو تاکانەی کە تەجریم دەکرێن وکردارە دادوەریی وسزاکان یاساییانە لەسەریان جێبەجێ دەکرێن.

لەژێر رۆشنایی شەرعییەتی دەستووریدا دەبێت هاوسەنگی بکرێت لەنێوان:

مەبەستی یەکەم لەپشت تەجریم وسزادان وجێبەجێ کردنی رێورەسمە دادوەرییەکان کە خۆی لە پاراستنی بەرژەوەندی گشتیدا دەبینێتەوە.

ومەبەستی دووەم کە خۆی لە پاراستنی ماف وئازادییە گشتییەکاندا دەبینێتەوە.

بەبێ ئەم هاوسەنگییەش هەردوو دەسەڵاتی تەجریم وسزادان ودەسەڵاتی رێورەسمە دادوەرییەکان راستگۆیی وکاریگەریی خۆیان لەدەست دەدەن لە دەوڵەتی قانوندا.

هەربۆیە پێویستە ئەم دەسەڵاتانە پابەندبن بەپێویستیەکانی پاراستنی مافەکان وئازادییەکان بەهەموو شێوەکانیەوە،بەبێ پاراستنی ماف وئازادییەکانیش ئەم دەسەڵاتانە دەبنە هۆکاری ستەمکاری وخۆسەپاندن، هەرلێرەوە ماف وئازادییەکان مانا ومەبەستی خۆیان لەدەست دەدەن [١٠٣].

---

[١٠٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو- لاپەرە (٥١-٥٢).

# بەشی دووەم
# ئازادییە گشتییەکان لە ئیسلامدا

## تەوەرەی یەکەم:
## بۆچوونی ئیسلامی بۆ ئازادی ومافەکانی مرۆڤ

ئەگەر راگەیاندنەکانی مافەکانی مرۆڤ بۆ ئازادییەکان لە رۆژئاوادا تەنها کۆنترۆڵێکی بورجوازییەت بووبێت بۆ دەرەبەگایەتی وکڵێسا، ورەوتە سۆشیالیستیەکانیش کە هاتن مەبەستیان بوو رووکەشی ئەم راگەیاندنانە دەربخەن وتەئکید بکەن لەسەر مافە کۆمەڵایەتیەکان، کە ئەمانیش سەرەنجام کۆمەڵێك دیکتاتۆریان سەپاند بەسەر مرۆڤەکاندا.

بۆچوونی ئیسلام بۆ ئازادی لە سروشت وبۆچوونێکی مرۆڤانەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو باوەڕی وایە کە مادام پەروەردگار دروستکەری گەردوون وخاوەنێتی، هەرئەو باشتر ئاگادارە بە دروستکراوەکانی وهەر ئەویش یاسادانەر وخاوەن فەرمانە، مرۆڤیش کراوە بە جێنشین لە زەویدا بەهۆی پێدانی ئەمانەتەکانی ژیریی و وویست وئازادی وبەرپرسیارێتی، لێرەوە ئیسلام دەبێتە شورشێکی هەمەلایەن دژی تاغوتەکان وستەمکاران بۆ ئازادکردنی وویستی مرۆڤەکان لە هەموو بەندایەتیەك بۆ غەیری خودا.

ئەوەی لە مانای باوی ئازادیەوە خەڵکی لێی تێدەگات کە تەنها بریتی بێت لە بێسنووری وبەرەڵایی، بەهیچ شێوەیەك قبوڵ ناکرێت لە مەنتیقی پەیامی راستی پەروەردگاردا، وئەم پەیامە پیرۆزە هیچ کات بە مرۆڤەکان ناڵێت کە خودا رێی داون چیتان دەوێت بیکەن! بەڵکودروشمی ئەم پەیامە بەپێچەوانەوەیە وپێیان رادەگەیەنێت کە پەروەردگارتان بەرگریتان لێدەکات کە شوێن ئارەزووەکان

ونەفامیەکانتان بکەون، وداواتـان لێدەکات (بەوپەڕی قەناعەتەوە) شوێن ئەو پەیامە بکەون کە رازی بووە پرۆگرامی ژیانتان بێت، ومایەی خۆشگوزەرانیتانە لە دونیا وپاشەڕۆژدا.

لێرەوە جێگیر دەبێت کە ئازادی لە ئیسلامدا ئەمانەت وبەرپرسیارێتیە، لە هەستان بەبەرپرسیارێتیەکان بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە ودوورکەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکان.

کۆمەڵێك لە بیرمەندانی ئیسلام لە سەدەی بیستەمدا هەستان بە روونکردنەوەی چەمکەکانی ئازادی لە ئیسلامدا لەم چوارچێوەیەدا لەوانە: زانای مەغریبی (علال الفاسي ود.حەسەن تورابی ومحمد ئیقبال ومالك بن نەبی).

(علال الفاسی) دەڵێت: مرۆڤ ناتوانێت بگات بەئازادی راستەقینە بەبێ شوێنکەوتنی نیگای خودایی، ئازادی بریتیە لە تێکۆشان ورەنجدان لەرێی بەندایەتی خوادا وبریتی نییە لە رەووشتێکی ئاژەڵیانە، سەری سوڕدەمێنێت لەوەی زانایانی پێشووی ئیسلام لە ئایەتی ١ی سورەتی (البيّنة): ﴿لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّى تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ﴾ ئەو مانا جوانە تێنەگەیشتوون کە:

هیچ رێگایەك نییە بۆ رزگاربوون وئازادبوون تەنها بە پرۆگرامی بەندایەتی بۆ خودا نەبێت، ئەو مرۆڤەی شایەنی ئەوەیە سیفەتی ئازادی لێبنێیت ئەوەیە کە باوەڕی بە پەروەردگاری هەیە وگوێڕایەڵە بۆی [١٠٤].

(تورابی)یش دەڵێت:

ئازادی بریتیە لە قەدەری مرۆڤ کە جیای دەکاتەوە لە دروستکراوەکانی تر، مرۆڤ بە ویستی خۆی کڕنووشی بۆ پەروەردگار برد، وخوداش لە پێکهاتەیدا زۆری لێنەکردووە بۆ باوەڕهێنان ورێشی نەداوە زۆر لەکەس بکات بۆ باوەڕهێنان،

---

[١٠٤] بڕوانە: مقاصد الشريعة الإسلامية ومكارمها: علال الفاسي، لاپەڕە ٢٤٧.

ئـازادی خـۆی لەخۆیـدا مەبەسـت نییـە بـەڵكو هۆكارێكـە بـۆ بەندایـەتی خـودا وبەدەستهێنانی پلە بەرزەكانی كامڵبوونی مرۆڤایەتی.

ئەگـەر بـەرەومانا تەشـریعیەكان بـڕۆین بـە مەبەسـتی دانـانی چوارچـێوەیەكی یاسـایی بـۆ ئازادیـەكانی مـرۆڤ وئەركـەكانی دەبیـنین بیرمەنـدانی ئیسـلامی ئـەم سـەردەمە زۆربــەیان لەگــەڵ ئــەو چوارچــێوە ئوصــولیەن كــە زانــای پایەبــەرز (الشاطبي) لە كتێبی (الموافقات) [105]دا دایناوە.

كـە دەتـوانین بـەوە كـورتی بكەینـەوە كـە مەبەسـتی شـەریعەت بریتیـە لـە هێنانەدی بەرژەوەندییە گەورەكانی مرۆڤایەتی، كە جیای كردۆتەوە بۆ: گرنگەكان وپێویستەكان وتەواوكەرەكان.

گرنگەكان یان زەرورەتەكان بریتین لە پاراستنی دین ونـەفس وعـەقڵ ونەسـەب وماڵ، بەو ئیعتیبارەی كە دین بۆ ئەوە هاتووە ئەم مەبەستانە بێنێتـەدی، ئەمانـە بریتین لە چوارچێوەی گشتی مافەكانی مرۆڤ وئازادیەكان لە بیروباوەڕ وپاراسـتنی ژیان وئـەو هۆكارانـەی پێـی جێبـەجێ دەبن، وپاراسـتنی عـەقڵ وئـەوەی پێـوەی بەندە لە فێركـردن وئـازادی بیركردنـەوە ودەربـڕین، وپاراسـتنی نەسـەب وئـەوەی پێوەی بەنـدە لـە مـافی دروسـتكردنی خێـزان، وپاراسـتنی مـاڵ وسـامان وئـەوەی لەسەری بونیاد دەنرێت لە مافە ئابووری وكۆمەڵایەتیەكان.

هـەروەها ئەوەشـی پێویسـتە بـۆ جێبـەجێ كردنـی مەقاصـیدە پێویسـتەكان وتەواوكاریـەكان (المقاصد الحاجيـة والتحسـينية) وەك: مافـەكانی مـرۆڤ، وئـەوەی پێویستە بۆ بەجێهانی هەموو ئەمانە كە خۆی لە داڕشتنی یاسایەك بـۆ كۆمـەڵگای موسوڵمان دەبینێتەوە.

ئەمەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە كە هەرشتێك پێویسـت بێـت بـۆ بەئـەنجام گەیاندنی واجبێك ئـەوا ئـەو شـتە خۆشـی واجـب دەبێـت، لێـرەوە كۆمـەڵێك ئـەرك

---

[105] بڕوانە: الموافقات في أصول الشريعة: أبوإسحاق إبراهيم بن موسى الشاطبي، ج٢ – ص٥.

وماف بۆ مرۆڤی موسوڵمان دەستەبەر دەبێت کە لە فیقهی دەستووریدا پێی دەووترێت: ئازادییە سیاسیەکان [106].

## تەوەرەی دووەم:
## چوارچێوەی گشتی مافەکانی مرۆڤ وئازادییەکان لە ئیسلامدا

### یەکەم: بیروباوەڕ بنەمای ئازادی ومافەکانی مرۆڤە لە ئیسلامدا:

ئەگەر دیموکراتی ومافەکانی مرۆڤ لە ڕۆژئاوادا پشت بەستوویێت بە تاکی مرۆڤ وبەسترابێتەوە بە ململانێ دژی کڵێسا وحوکمی رەهای پاشاکان وسنووردار کردنی دەسەڵاتیان وگێڕانەوەی بۆ میللەت، ئەمە وای کردووە کە رووکەش بوویێت بە تاکپەرستی وگیانی نەتەوەیی وبێدینی، بەڵام ئەمە جیاوازە بۆ وولاتە موسوڵمانەکان کە ئەم دژایەتی وململانێیەی نەناسیوە لەنێوان حوکم وگەلدا تەنانەت لە سەردەمەکانی ستەمکاریشدا، ئەویش بەهۆی ئەوکۆتانەی شەریعەت دایدەنێت بۆ دەسەڵاتی کاربەدەستان لە ٢ بابەتی گرنگدا کە ئەوانیش:دەسەڵاتی یاسادانان ودانانی باجەکانن، چونکە هیچ کاربەدەستێك ناتوانێت یاسایەك دابنێت کە پێچەوانەی دین بێت، لەوانەش ناتوانێت ئەو برانە تێپەڕێنێت کە زەکات لەسەر ماڵی خەڵکی دایناوە.

لەهەمان کاتدا تێڕوانینی تاك وکۆمەڵ بۆ چاکسازی وتەنانەت شۆڕشیش سنووری شەریعەتی تێنەدەپەڕاند، ونموونەی باڵای خۆی لە سەردەمی پێغەمبەر وجێنشینەکانیدا دەبینیەوە وداوای گەڕانەوەی بۆ بەهاکانی ئەوسەردەمە دەکرد، کەواتە بەهاکانی چاکسازی لە ئیسلامەوە خۆی وەردەگیرا، وچاکخوازانیش تەنها ئەوەیان دەویست کە گەڕانەوە رووبدات بۆ سەرچاوە پاکەکانی ئیسلام وتۆزیان

---

[106] بڕوانە: الحريات العامة في الدولة الإسلامية: الشيخ راشد الغنوشي، لاپەڕە ٣٧-٣٩.

لەسەر لابدرێت، وهیچ پێویستیان بەدانانی پەیماننامەکانی مافەکانی مرۆڤ وهاوولآتیان نەبووە لەبەرئەوەی باوەڕی تەواویان هەبووە کە وێنای نموونەیی مرۆڤ بەتاك وکۆمەڵەوە لە کتێبی پیرۆزی پەروەردگاردا دارێژراوە.

لەدوای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمەوە ودوای خەستبوونەوەی هێرشی سەربازی ڕفیکری بۆ سەر جیهانی ئیسلامی ئیتر موسوڵمانان وورده وورده روویان وەردەگێڕا بەرەو ڕۆژئاوا ولە هۆکاری هێز وپێشکەوتنی ئەوانیان دەڕواند ولێرەوە هەندێك ڕەگەزی نوێبوونەوەی جەستەی ماندووی ئیسلامیان وەرگرت، ئیتر لێرەوە بانگەواز دەستی پێکرد بۆ وەرگرتن وداخڵکردنی بەشێك لە یاسای دەستووری وکارگێڕی ودادوەری ڕۆژئاوایی لە وولآتەکانی میسر وتونس وتورکیا، ئەویش بەو ئیعتیبارەی کە خەبات دژی داگیرکەر پێویستی بە بەکارهێنانی هۆکارەکانی خۆی هەیە، وبەشێك لە هۆکاری دواکەوتنی موسوڵمانانیان بۆ خودی ئیسلام وپارێزگاری نەکردنی لە مافەکان گەڕاندەوە.

لێرەوە بەتایبەتی سەرانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی هانایان برد بۆ دەستوورە ڕۆژئاواییەکان ولەسەر ڕێڕەوی ئەوان دەستوور ویاسای نوێیان دانا کە لە بواری کرداریيەوە هیچ جۆرە بەهایەکی نەبوو چونکە دیکتاتۆرییەتی دروستکرد وبووە ڕێڕەوێك بۆ زاڵبوونی بیری ڕۆژئاوایی لە جیهانی ئیسلامیدا.

پاشان کۆمەڵێك بیرمەندی موسوڵمان پەیدابوون کە داوای بەیاسا کردنی شەریعەتیان دەکرد وبەڕێکخستنێکی شکڵییان دەزانی بۆ بابەتەکانی، هەر لەم ڕێکخستنەوە کۆمەڵێك دارشتن پەیدابوو بۆ مافەکانی مرۆڤ وئازادییە گشتی وتایبەتیەکانی.

لەهەمان کاتدا خاڵەکانی بەیەك گەیشتن ولێکترازانیان لەنێوان ئیسلام وپەیماننامەکانی مافی مرۆڤ روونکردەوە، لەکاتێکدا بیرمەندانی موسوڵمان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە باوەڕبوون بە پەروەردگار بنەما وکانیاوی ماف وئەرکەکانە،

ئەویش بەوەی مافەکانی مرۆڤ وئازادییەکانی بریتیە لە لقێك لە بۆچوونی گەردوونی ئیسلام بۆ پلەوپایە ومەبەستی بوونی مرۆڤ، بەڵام ڕۆژئاواییەکان بنەمای ئەم ماف وئازادییانە بۆ سروشت دەگەڕێننەوە.

بۆچوونی ئیسلامی هەموو بەهایەك دەبەستێتەوە بەو سەرچاوەیەی هەموو بوونەوران وجودی خۆیانی لێوەوەردەگرن کە پەروەردگاری دروستکەریانە، ورێنیشاندەریش پەیام وشەریعەتەکەیەتی، مرۆڤیش جێنشین کراوە لەسەر زەویدا ودروستکەرەکەی رێزی لێناوە بەپێدانی ژیریی و وویست وئازادی وناردنی پەیامبەران بۆ رۆشنکردنەوەی رێگای راست بۆیان وبەرز بوونەوە بەپلەکانی کامڵبووندا، ئەویش بە پابەندبوونی بە شەریعەتی خودا بەشێوە کۆتاییەکەی کە بۆ پێغەمبەر محمد (ﷺ) هاتووە وچوارچێوەی گشتی ژیانی مرۆڤەکان بە تاك وکۆمەڵەوە دیاری کردووە، لەناو ئەم چواچێوەیەدا بواری فراوانی بەتاڵی بۆ بەجێهێڵاوە کە مرۆڤ داوای لێکراوە هەستێت بە کاری جێنشینیەکەی وپڕیان بکاتەوە، ئیتر لێرەوە کۆبوونەوە روودەدات لەنێوان ئازادی وپابەندبوون ویەکپارچەیی وفرەلایەنیدا.

مرۆڤ لەم بۆچوونەدا بوونەوەرێکی باڵا وئەرك پێسپێردراوە، بەندەی خودایە، بەئەندازەی هەستانی باشتری بە ئەرکی بەندایەتی وجێبەجێ کردنی شەرع زیاتر دەبێتە خاوەن ئازادی بۆ خۆی وسروشت وبوونەوەرانی تر لە دەوروبەری، هەربۆیە پارێزگاری کردنی مرۆڤ لە ژیانی ودەستەبەر کردنی هۆکارەکانی مانەوە وگەشە کردن وخۆش گوزەرانی دەبێتە مافێك لەسەری کە ناتوانێت دەستبەرداری ببێت بە خۆکوشتن یان گوێنەدان یان برسی کردن، بەڵکوئەمە دەبێتە واجبێکی شەرعی.

هەروا رەتکردنەوەی ستەمکاری وبەرەنگاربوونەوەی دیکتاتۆرەکان وتێکۆشان لەپێناوی ئازادی ودادپەروەری وخۆشگوزەرانی مرۆڤایەتیش نەك تەنها مافن،

بەڵکو واجباتێکن ئەوەی پێی هەستێت پاداشت وەردەگرێت وئەوەی پشتگوێی بخات سزا وەردەگرێت، هەر لێرەوە مافەکان بەرگێکی پیرۆزییان لەبەر دەکرێت ورێگری دەکرێت لە یاری پێکردنیان لەلایەن هەر حیزبێك یان پەرلەمان یان کاربەدەستێك بە هەڵوەشانەوەیان یان کەمکرنەوەیان لەبەرئەوەی سەرچاوەکەی لەلایەن خوداوەیە [107].

**دووەم:**

مرۆڤ لە ئیسلامدا جێنشینە وبەهۆی ئەوشەریعەتەی بۆی نێردراوە ماف وئەرکەکانی بۆ دیاریکراوە، بەڵام گونجاندن دەکرێت لەنێوان مافە تاکە کەسیەکان ومافە گشتیەکاندا، کە مافە گشتیەکان لەپێشتر دەبن لەکاتی بەریەککەوتنی مافەکاندا.

لەبەرئەوەش کە ئیسلام هاتووە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی مرۆڤەکان لە دونیا وپاشەرۆژدا، شتێکی ئاساییە کە ئەم بەرژەوەندیانە چوارچێوەیەکی گشتی بن کە لەناویاندا هەڵسوکەوتی تاکەکان وئازادییە گشتی وتایبەتیەکان رێکبخرێن، جوانترین رێکخستنیش بۆ بەرژەوەندیەکان (وەك پێشتر باسمان کرد) لە دانانی زانای ناودار (الشاطبي)یە لە کتێبی (الموافقات)دا، ئەم بیردۆزە تەرازوویەك بۆ مرۆڤی موسوڵمان دروستدەکات کە کەس ناتوانێت دەستی بۆ بەرێت مادەم هەڵس وکەوتەکانی لە چوارچێوەی مافەکانیدا بێت وزەرەر لە بەرژەوەندی گشتی نەدات، لێرەوە بیردۆزی ئازادییەکان لەئیسلامدا لەسەر بنەمای پێدانی ئازادییە بەتاکەکان لە هەموو شتێکدا ئەویش بەمەرجێك پێکدادانی نەبێت لەگەڵ حەق یان بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگادا [108].

---

[107] الحريات العامة في الدولة الإسلامية: الشيخ راشد الغنوشي، لاپەڕە ٣٩.

[108] هەمان سەرچاوە – لاپەڕە ٤٢.

## تەوەرەی سێیەم:

## سەرچاوەکانی ئازادیی لە ئیسلامدا

ئیسلام هات بۆ ڕێزدارکردنی ئادەمیزاد، کەرامەتی دزراوی گێڕایەوە بۆ تاکەکان، وڕۆژی بۆ دەستەبەر کردن، ئەوەبوو جاڕنامەی پیرۆزی خۆی ڕاگەیاند:

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾ {الإسراء:٧٠} واتە: سوێند بەخودا بێگومان ڕێزمان لەنەوەی ئادەم گرت ولە ووشکانی و دەریادا هەڵمانگرتن (بەسواری) وڕۆزی پاك وخاوێنمان پێداون وپێشمان خستوون بەسەر زۆرێك لەوانەی دروستمان کردوون بەپێشخستنێکی گەورە.

ئەو بنەمایانەی دارشت کە سیستمی کۆیلەیی پێدارماند ورایگەیاند کە بەندایەتی مرۆڤ تەنها بۆ پەروەردگاری تاك وتەنهایە: ﴿وَإِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ﴾ {المؤمنون:٥٢} واتە: وە بێگومان هەر ئەمەیە ئاین ودینی ئێوە کە یەك ئاین وبەرنامە وئوممەتە، وە منیش پەروەردگارتانم کەواتە خۆتان بپارێزن.

سیستمی چینایەتی رووخاند لە بناغەیەوە ورایگەیاند کە مرۆڤەکان یەکسانن وەك دانەکانی شانەیەك وتەنها بە خۆپارێزی وچاکە پلەیان بەرزتر دەبێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (الحجرات:١٣) واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە دروستمان کردوون لە نێر ومێیەك وکردوومانن بە چەند گەل و هۆزەوە تا یەکتری بناسن، بەراستی بەرێزترینتان لای خوا پارێزگار ترینتانە.

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء﴾ (النساء:١) واتە: ئەی خەڵکینە خۆتان بپارێزن لە سزای پەروەردگارتان ئەوەی کە دروستی کردوون لە یەك کەسەوە (کە ئادەمە)، وە هەر

لەویش هاوسەرەکەی دروست کردووە، وبڵاوی کردۆتەوە لەو دووانە پیاوانی زۆر وهەروەها ئافرەتان، لێرەوە بڕیاری یەك سەرچاوەیی بنچینەی مرۆڤی داوە کە ڕێگری دەکات لە جیاوازی ڕەگەزی یان چینایەتی.

ئیسلام شیرکی داروخاند وبناغەی یەکتاپەرستی دامەزراند، بنەماکانی ئازادی سیاسی دانا وەك نێوەندێك لەنێوان بەرەڵایی وداپڵۆسیندا، لەراستیدا ئەوەی بووە قووڵکردنەوەی ئەم بنەمایانە لە ویژدانەکاندا هەڵسوکەوتی پەروەردەییانەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو لە ڕزگار کردنی ئوممەت لە سەرگەردانی، سەرەتا بە ئازادکردنی بیروباوەڕیان بوولە هاوەڵدانان کە بناغەی هەموو ئازادیەکانی ترە، دوای ئەمە مرۆڤەکان دەتوانن چاك لە خراپ، دادپەروەر لە ستەمکار، پاك لە پیس جیابکەنەوە، ئیسلامیش هەربۆ ئەم مەبەستە هاتووە، دەربارەی ئەم بابەتە ئیمامی (ابن القيم) دەڵێت: (إن الله أرسل رسله وأنزل كتبه ليقوم الناس بالقسط وهوالعدل الذي قامت به السماوات والأرض، فإذا ظهرت أمارات الحق وقامت أدلة العدل وأسفر وجهه بأي طريق كان فثم شرع الله ودينه) [١٠٩] واتە: خودا پەیامبەرانی ناردووە وکتێبە ئاسمانییەکانی دابەزاندووە بۆ ئەوەی خەڵکی دادپەروەری بەرپابکەن کە یاسایەکە ئاسمانەکان وزەوی لەسەر دامەزراوە، هەرکاتێکیش نیشانەکانی ڕاستیی ودادپەروەری دەرکەوتن وخۆیان نیشاندا جا بەهەر شێوەیەك بێت ئیتر ئەوە جێبەجێ کردنی شەرعی خودا وئاینەکەیەتی.

بەگەڕانەوەمان بۆ حوکمە شەرعیەکان دەبینین مەبەست لێیان بەدیهێنانی بەرژەوەندی خەڵکی وچەسپاندنی دادوەرییە، وەك پێشتریش باسی بەرژەوەندیە گرنگەکان وپێویستەکان وتەواوکەرەکانمان کرد، کەواتە ئەحکامەکانی شەریعەت تەنها بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی بۆ خەڵکی دانراون، هەمووئەم بنەمایانە زانایانی ئیسلام لە سەرچاوە سەرەکیەکانی ئیسلامەوە دەریانهێناون کە قورئان

---

[١٠٩] بڕوانە: الطرق الحكمية في السياسة الشرعية، لاپەڕە (١٥-١٦).

وسوننەتە، کە ئەگەر بگەڕێین تێیاندا دەبینین کە هەموو حوکمەکان مەبەستیان بەدیهێنانی ئەو بەرژەوەندیە بالآیانەیە، کە هەر ئەم بەرژەوەندیانە بریتین لەو بنەمایانەی کە ئیسلام ئیعتیباری بۆ داناوە لە داڕشتنی بۆ ئازادیە گشتییەکان ومەودایان وسنووریان [110].

## تەوەرەی چوارەم:

## ڕێڕەوی ئیسلام بۆ دیاریکردنی ئازادیەکان

لەبەرئەوەی ئیسلام ئاینی فیترەت وسروشتی مرۆڤە بۆیە گونجێنراوە لەگەڵ کاروبارەکانی ژیان بەجیاوازی سەردەمەکان وشوێنەکان: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ {الروم:٣٠} واتە: کەواتە رووی خۆت ڕێك بکەرە ئاینی ئیسلام پاك وڕاست بۆ خوا، شوێن ئاینی خودا بکەوە کە سروشتێکە خودا خەڵکی لەسەر دروست کردووە، داهێنراوانی خودا هیچ جۆر گۆڕانکاریی بۆ نییە، هەر ئەوە ئایینی ڕێك وڕاستە بەڵام زۆربەی ئادەمی نازانن.

هەربۆیە ڕێنماییە بالآکانی قورئان هیچ کاتێك دژایەتی نەبووە ونابێت لەگەڵ عادەت وعورفەکان، بەڵام بابەتە فەرعیە وردەکان کە لەگەڵ کات وشوێندا دەگۆڕێت ئەمانە وازیان لێهێنراوە بۆ خەڵکانی شارەزا وموجتەهید لە هەموو میللەتێك ولە هەموو سەردەمەکاندا، بەهۆی ئەمەوە قورئان یەکانگیرە لەگەڵ ژیریی، وپشت هەڵناکات لە سروشتی مرۆڤەکان.

لەبەرئەوەی مرۆڤ بەسروشتی خۆی حەزدەکان هۆکار وسوودی شتەکانی دەوروبەری بزانێت، بۆیە قورئان وەڵامی ئەم ئارەزووەی مرۆڤەکانی داوەتەوە

---

[110] بڕوانە: (الحريات العامة في الفكر والنظام السياسي في الإسلام) – د. عبدالحكيم حسن العيلي– لاپەڕە ١٦٢–١٦٨.

ئەویش بەدیاریکردنی هۆکار ونهێنی پشت ئەحکامە شەرعیەکان، لێرەوە هانی مرۆڤەکانی داوە بۆ بەزیندوو راگرتنی ئەم غەریزەتە وداوای لێدەکات کە بەردەوام تێبروانێت وتێبفکرێت: ﴿أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللّهُ مِن شَيْءٍ﴾ (الأعراف:١٨٥) واتە: ئایا بۆ ئەوانە ناڕوانن لەو موڵکە فراوانەی لە ئاسمنەکان وزەوی هەیە، وە لەو شتانەی خوای گەورە دروستی کردوون.

بەعەیبە ونوقسانی زانیوە بۆ ئەوکەسانەی کە مێشکیان پەکدەخەن وژیرییان لەکاردەخەن کاتێك دەڵێن: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلاَ يَهْتَدُونَ﴾ {المائدة:١٠٤} واتە: وە کاتێ بووترێ پێیان وەرن بۆ لای ئەو قورئانەی کە خودا ناردوویەتیە خوارەوە، وبۆلای پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێن بەسمانە ئەو ئاینەی کە باوك وباپیرانمان لەسەری بوون، ئایا بۆ چاویان لێدەکەن ئەگەر لە حاڵەتێکدا باوباپیرانیشیان هیچ شتێکیان نەزانیبێ وگومڕا بووبن ، ﴿إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ﴾ {الزخرف:٢٣} واتە: بەڕاستی ئێمە باووباپیرانی خۆمان لەسەر ئاینێك بووە، وە بەڕاستی ئێمە لەسەر ئاینی ئەوان دەڕۆین.

قورئان ئاسانترین رێگەی داناوە بۆ رێنمویی مرۆڤەکان، ودوورخستنەوەی زیان لێیان وپاراستنیان لە تیاچوون، ئەویش بەشێوازێکی نەرمی فێرکاریی، بەڵگەش لەسەر ئەمە زۆرە وەك شێوازی قەدەغە کردنی مەی.

ئازادی بیرکردنەوە وئازادی بڵاوکردنەوە، ومافی خێزانەکان، وئازادی تاکەکان هەموویان قورئان بڕیاری لێداون بە شێوازێکی هێمنانەی هاوسەنگ کە بە تەواوەتی جیاوازە لەو رێگایانەی ئەم ئازادیانە بڕیاریان لێدرا لە شوێنەکانی تر لەرێی شۆرشی ئاینی وسیاسی کە بوونە مایەی خوێن رشتن ومالوێرانی، لەم بارەیەوە شێخ (عبدالعزیز جاویش) [١١١] دەڵێت: قورئانی پیرۆز لە هەموو

---

[١١١] بڕوانە: (الإسلام دين الفطرة والحرية) – الشيخ عبدالعزيز جاويش – لاپەڕە ١٣١.

داواكاریەكانیـدا ئـەو هەڵوێسـتەی وەرگرتـووە كـە سروشـتی دینەكـەی هێنـاویەتی ودەیخوازێت، كاتێك بانگـەواز بـۆ بیروبـاوەڕ یـان كۆڵەكەیـەكی دیـن دەكـات وازی هێناوە لـەو ئیلتیزاماتانـەی كـە ژێرییـەكان وبیرەكـان لێـی حـاڵی نـابن، كـاتێكیش دەیەوێت بنەمایەك لە بنەماكان فێری خەڵكی بكـات سـەرەتا پێشـەكیەكی تیـۆری دەهێنێـت، تـا دوایـی كۆتـایی دێنێـت بـە ئاگـادار كردنـەوە لـە بـاوەڕ پێنـەهێنانی ورەتكردنەوەی، هەروەك ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئاماژەیان پێداوە: ﴿لِيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَى مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ وَإِنَّ اللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ {الأنفال:٤٢} واتـە: بـۆ ئەوەی لەناوبچێ ئەو كەسەی بەلای خواوە لەناو چووە بە بەڵگەوە، وەبـۆ ئـەوەی بژی ئەوەی بەلای خواوە دەژی بە بەڵگەوە، (لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا {النساء:١٦٥} واتە: بۆ ئەوەی بۆ خەڵكی نەبێت بە بەڵگە بەسەر خواوە دوای ناردنی پێغەمبەران وە خوا هەمیشە زاڵی كاردروستە.

لـە ژیـانی پێغەمبـەردا (ﷺ) بنـەما وئەحكامـە گشـتییەكان دانـران، لـەدوای وەفاتیشی هاوەڵەكانی ئیجتیهادیان كرد بۆ دەرهێنانی حوكمە نوێیـەكان، ئـەویش بۆ رۆشتن لەگەڵ رووداوە نوێیە ووردەكان ودۆزینەوەی حوكمی شەرعی بۆیان، كە ئەم كارە پێویستە بەردەوامی هەبێت بەپێی سەردەم وشوێنە جیاوازەكان [١١٢].

ئازادییە گشتییەكان كە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا باسـیان لێوەدەكرێـت یـان ئـەوەتا هەندێكیان دەقیان لەسەر هاتووە وجێگیر كـراون، ئەوانـەی تریشـیان دەچـنە ژێـر چەتری بەرژەوەندیـەوە، چـونكە حوكمـە شـەرعیەكان لەبـەر بەرژەوەنـدی خـەڵك ومورارعاتی عورف وعادەتیـان دانـراون، بەمـەرجێك ئەمانـە پێچـەوانە نـەبن لەگـەڵ بنچـینەیەكی گشـتی وبگونجێـت لەگـەڵ بنـەماكانی شـەریعەت ویاسـاكانیدا، بـە مانایەكی تر بنچینە لە هەموو شتەكاندا بریتیـە لـە رێپێـدراوی (الأصـل في الأشـیاء

---

[١١٢] بڕوانە: نشأة الفقه الإجتهادي وتطوره– الشيخ محمد علي السايس– لاپەڕە ١٢، هەروەها: الحريات العامة في الفكر والنظام السياسي في الإسلام – د. عبدالحكيم حسن العيلي – لاپەڕە: ١٦٨– ١٧٠.

الإباحة)، وقەدەغە كردن پێویستی بە دەقێك هەیە لەسەری یان پێچەوانە بوون لەگەڵ حوكمێكی تردا، ئیمامی (ابن القیم) موناقشەی ئەوقسەیەی ئیمامی (شافیعی) دەكات كە دەڵێت: (لا سیاسە إلا ما وافق الشرع) واتە: هیچ سیاسەتێك دروست نییە ئەوە نەبێت كە لەگەڵ شەرعدا یەكانگیربێت، ودەڵێت:

(السياسة ماكان فعلاً يكون معه الناس أقرب الى الصلاح وأبعد عن الفساد، وإن لم يضعه الرسول ولانزل به الوحي، فإن أردت بقولك : ما وافق الشرع أنه لم يخالف ما نطق به الشرع، فصحيح، وإن أردت: لا سياسة إلا ما نطق به الشرع فغلط وتغليط للصحابة، فقد جرى من الخلفاء الراشدين من القتل والتمثيل ما لم يجحده عالم بالسنن، ولولم يكن إلا تحريق المصاحف ونفي عمر لنصر بن الحجاج لكفى).

واتە: سیاسەت بریتییە لە كارێك كە بەهۆیەوە خەڵك نزیكتر دەبن لە چاكەكاریی ودوور دەبن لە خراپەكاریی، تەنانەت ئەگەر پێغەمبەریش داینەنابێت یان بەوەحی دانەبەزیبێت، هەر رێگایەكیش بەهۆیەوە دادپەروەریی بەرپابكرێت بریتییە لە بەشێك لە دین، ئەگەر مەبەستیشت لەوەی لەگەڵ شەرعدا یەكانگیربێت ئەوەبێت كە پێچەوانەی شتێك نەبێت كە شەرع ووتبێتی ئەم قسەیە راستە، ئەگەر مەبەستیشت ئەوەبێت هیچ سیاسەتێك نابێت هەبێت تەنها ئەوە نەبێت كە شەرع ووتوویەتی، ئەم قسەیە هەڵەیە وبە هەڵەدانانی هاوەڵانیشە، چونكە ئەوەی روویدا لەسەر دەستی خەلیفە راشیدەكان لە كوشتن وشكاندن بەعیبرەت كردن هیچ زانایەكی سوننەت رەتی ناكاتەوە، كە ئەگەر تەنها سوتاندنی موصحەفەكان لەلایەن عوسمان و نەفی كردنی نەصری كوڕی حەجاج لەلایەن عومەرەوە بكرێن بەنموونە بەسمانە [١١٣].

هەرلەبەرئەوەی هەندێك حوكمی شەرعی لە قورئان وسوننەتدا بەدەق نەهاتوون مانای ئەوە نیە كە شەرعی نین، بەڵكوتەنها دژایەتی نەكردنی بۆ

[١١٣] بڕوانە: الطرق الحكمية في السياسة الشرعية، لاپەڕە (١٥-١٦).

بنچینەیەکی ئاین، ولەگەڵ گیانی گشتی شەریعەت وبنەماکانیدا بڕوات ئەوە دەبێت بە یاسایەکی ئیسلام وسیاسەتێکی شەرعی [114].

ئیمامی (ابن حزم) دەڵێت: (والشريعة كلها إما فرض يعصي من تركه، وإما حرام يعصي من فعله، وإما مباح لايعصي من فعله ولامن تركه، وهذا المباح ينقسم ثلاثة أقسام: إما مندوب إليه يؤجر من فعله ولايعصي من تركه، وإما مكروه يؤجر من تركه ولا يعصي من فعله، وإما مطلق لايؤجر من فعله ولامن تركه، ولايعصي من فعله ولا من تركه) [115] واتە: شەریعەت هەمووی بریتییە لە: یان فەرزێك ئەوەی نەیکات تاوانبار دەبێت، یان حەرامێك ئەوەی بیکات تاوانبار دەبێت، یان ڕێگە پێدراوێکە ئەوەی بیکات یان نەیکات تاوانبار نابێت، ئەم ڕێگە پێدراوە دەبێت بە ٣ بەشەوە: هاندراوێك ئەوەی بیکات پاداشت وەردەگرێت ونەیکات تاوانبار نابێت، ڕێلێگیراوێك ئەوەی نەیکات پاداشت وەردەگرێت وئەوەی بیکات تاوانبار نابێت، یان ڕەهایەك کە ئەوەی بیکات ونەیکات نە پاداشت وەردەگرێت ونەسزای دەبێت.

هەر ئەم زانایە وەڵامی ئەوکەسانە دەداتەوە کە ژێرییان پەکدەخەن وهەموو شتێك بە حەرام دەزانن کە ئەگەر شەرع بەدەق باسی نەکردبێت، ودەڵێت: (إنه لم يحرم الإقدام على ما ملك غيرنا بنفس العقل، وإنما حرم ما حرم بورود الشرع بتحريمه) واتە: شەرع حەرامی نەکردووە لەسەرمان ئەو شتانەی غەیری ئێمە بەهەمان ژیریی ئێمە بەدەستی هێناوە، بەڵکو تەنها چەند شتێکی بەدەق حەرام کردووە [116].

بەڵگەشمان لەسە ئەم بابەتە ئەمانەیە: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ {الحشر:٧} واتە: وە ئەوەی

---

[114] بڕوانە: السياسة الشرعية والفقه الإسلامي – الشيخ عبدالرحمن تاج – ص ١٠.

[115] بڕوانە: الإحكام في أصول الأحكام – ابن حزم الظاهري – ج١ ص٥٢.

[116] هەمان سەرچاوە – لاپەڕە ٥٨.

پێغەمبەر (ﷺ) پێیدان وەربیگرن وئەوەی لێتانی قەدەغە کرد وازی لێبهێنن وە لەخوا بترسن بێگومان خوای گەورە سزای سەختە، هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): ﴿ذروني ماتركتكم، فإنما هلك من كان قبلكم بكثرة سؤالهم واختلافهم على أنبيائهم، فإذا أمرتكم بشيء فأتوا منه مااستطعتم واذا نهيتكم عن شيء فدعوه﴾ (متفق عليه) واتە: وازم لێبێنن هاتاکو من وازم لێهێناون، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە بەوە لەناو چوون کە زۆر پرسیاریان دەکرد وگوێڕایەڵی پێغەمبەرەکانیان نەدەکرد، هەر فەرمانێکیشم پێکردن چەند دەتوانن ئەوەندەی لێبکەن وهەر شتێکیشم لێقەدەغە کردن وازی لێبێنن [117] ١١٤.

بۆ موسوڵمانیش هەیە هەرچی شتی باشە لە خەڵکی تر وەربگرێت لەژێر رۆشنایی ئەو مەرجانەی پێشوتردا (الحكمة ضالة المؤمن أنى وجدها فهوأحق بها).

## تەوەرەی پێنجەم:

## جۆرەکانی ئازادییە گشتییەکان لە ئیسلامدا

**یەکەم**: ئازادییە کەسییەکان، کە: ئازادیی کەسیی ومافی رێزلێنانی مرۆیی (حرية الذات وحق الكرامة البشرية)، وئازادیی ئاسایش (حرية الأمن)، وئازادیی هاتووچۆکردن (حرية التنقل)، وئازادیی نیشتەجێبوون (حرية المسكن) وئازادیی پەیوەندیەکان (حرية المراسلات)، وڕێزگرتنی سەلامەتی ژیریی مرۆڤەکان (إحترام السلامة الذهنية للإنسان) دەگرێتەوە.

**دووەم**: ئازادییە فیکریی وسیاسیەکان، کە: ئازادیی بیروباوەڕ یان ئازادیی ئاینی (حرية العقيدة أوالحرية الدينية)، وئازادی بیروڕا ودەربڕین (حرية الرأي والتعبير)، ئازادی کۆبوونەوە (حرية الإجتماع)، وئازادیی فێرکردن (حرية التعليم)،

---

[117] بڕوانە: الحريات العامة في الفكر والنظام السياسي في الإسلام – د. عبدالحكيم حسن العيلي – لاپەڕە: ١٧٠ – ١٧٥.

وئازادیی رۆژنامەگەریی وراگەیاندن (حرية الصحافة والإعلام)، وئـازادیی پێکهێنـانی حیزب وکۆمەڵەکان (حرية تكوين الأحزاب والجمعيات)، وئازادی بەشداریی سیاسـی (حرية المشاركة السياسية) دەگرێتەوە.

**سێیەم**: ئازادییە ئابووری وکۆمەڵایەتیەکان، کە: ئـازادیی خاوەنـداریی موڵـك (حرية التملك)، ومافی کارکردن (حرية العمـل)، ومـافی خزمـەتگوزاری تەندروسـتی وهاوکاری کۆمەڵایەتی (حق الرعاية الصحية والتكافل الإجتمـاعي)، ومـافی دروسـت کردنی خێزان (حق تكـوين الأسـرة)، وئـازادیی بازرگـانی (حريـة التجـارة)، ئـازادیی پیشەسازی (حرية الصناعة) دەگرێتەوە [118].

## تەوەرەی شەشەم:
## فەلسەفەی ئازادیی لەئیسلامدا

ئـەوەی زانـراوە لـە فیقهـی قانونیـدا ئەوەیـە کـە ئـازادی بریتیـە لـە توانـای ئەنجامدانی هەر کارێك کە زیان بە خەڵکی تر نەگەیەنێت [119]، ئەگەر سەیری فیقهی ئیسـلامیش بکـەین دەبیـنین ئـەو ئەرکـە شـەرعیانەی لـە حوکمـە شـەرعیەکاندا داواکـراون مەبەسـت پێیـان پاراسـتنی بەرژەوەنـدی دروسـتکراوەکانە، مەبەسـتی گشتی یاسادانەریش لە ئیسلامدا بریتیە لە پاراستنی بەرژەوەندی خەڵکی.

وەك پێشتریش باسمانکرد زانایانی ئوصـول ئـەم مەبەسـتانە (مەقاصـدانە)یـان دابەش کردووە بۆ ٣ بەش کە هەموو بەرژەوەندیەکانی مرۆڤەکان کۆدەکاتەوە:

---

[118] الحقوق والحريات العامة في الدساتير العربية والفقه والقضاء والشريعة الإسلامية – د.عبدالعزيز محمد سلمان– ص ٤٨، هەروەها: محاضرات في الحريـات العامـة والديمقراطيـة، ئامـادەکرنی (د. مجيـد حميـد الحدراوي) لە کۆلیجی ئاداب– زانکۆی کوفە– لاپەڕە (٣)، هەروەها: الحريات العامة في الدولة الإسـلامية: الشيخ راشد الغنوشي، لاپەڕە: ٤٣–٦٨.

[119] مـاددەی چـوارەم لـە جارنامـەی فەرەنسـی مافـەکانی مـرۆڤ وهاوولاتيـان، کـە لـە سـاڵی ١٧٨٩ز دەرچوو.

١- مەقاصد ومەبەستە زەرورەکان کە پێنجن: پاراستنی دین، ونەفس، ونەسل، ومالّ، وعەقلّ.

٢- مەبەستە پێویستەکان (المقاصد الحاجية): وەك روخصەتەکان، وحەلاڵ کراوەکان، یان لابردنی حەددەکان بە گومان، وچەندینی تر.

٣- مەبەستە تەواوکاریی وجوانکەرەکان (المقاصد التحسينيه): بریتین لە رەووشتە جوان وبەرزەکان، ودوورکەوتنەوە لە عادەت ورەووشتە نزمەکان کە ژیرییەکان لێی دەسڵەمێتەوە.

مرۆڤ بەحوکمی دروستبوونی ٢ هێز تێیدا لە ململانێدان: غەریزەت وژیریی، کە غەریزەت مرۆڤ بەرەو لادان دەبات وژیریش جڵەوگیریی دەکات، حیکمەتی پەروەردگاریش لەوەدا بووە کە مرۆڤ ئازاد بێت چونکە زەوتکردنی ئەم ئازادییەی پێچەوانەیە لەگەڵ مانای تەکلیف کە خودا فەرمانی بەمرۆڤ کردووە، هەربۆیە مرۆڤیش لەدونیادا لەژێر تاقیکردنەوەدایە: ﴿وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ {الأنبياء:٣٥} واتە: بە خێر وبەشەڕ ئێمە ئێوە تاقی دەکەینەوە وسەرەنجامیش بۆلای ئێمە دەگەڕێنرێنەوە، ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَالْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾ {الملك:٢} واتە: ئەو پەروەردگارە مردن وژیانی دروستکردووە بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کە کامتان کردەوەی باشتر ئەنجامدەدات وهەر ئەویش بەعیززەت ولێبوردەیە.

ژیریی وغەریزەت لە ململانێی بەردەوامدان ولەسەر ئەنجامی ئەم ململانێیە ئەنجامی کردارەکانی مرۆڤ دەوەستێت کە ئایا بەرژەوەندی تێدایە یان زیان، هەر لێرەشەوە حوکمی شەرعی بەسەر ئەو کردارانەدا دەدرێن کە ئایا رێپێدراون یان قەدەغەکراون.

حیکمەتی یاسادانەریش لە ئیسلامدا لەوەدایە کە لەکاتی رەچاوکردنی مەقاصیدە شەرعیەکاندا مەبەستێتی کە تەوفیق بکات لەنێوان بڕیاری غەریزە

وژیریدا، واته گونجاندنی نێوان ئازادی تاکەکان کە پێویستە ومافی کۆمەڵگا کە دەبێت رەچاوبکرێت، بۆیە ئیسلام بنەمایەکی ئاشکرای داناوە کە مایەی بەختەوەری وئاشتیە بۆ تاك وکۆمەڵگا کە فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ): ﴿لاضرر ولا ضرار﴾ [120] واتە: نابێت زیان لە کەس بدرێت وزیانیش قبوڵ بکرێت.

هەرکاتێك ولەهەر شتێکدا مرۆڤ بەشێوەیەك هەڵس وکەوتی کرد کە مایەی بەجێگەیاندنی مەقاصدە شەرعیەکان بوو ئەوە لەچوارچێوەی مافی خۆیدایە وسەربەستی تەواوی تێیدا هەیە [121].

هەرکاتێکیش سنووری خۆی بەزاند ومەبەستی زیان گەیاندن بوو ئەوا ئازادی سنووردار دەکرێت لەم بابەتەدا، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بڕدۆزی ئازادی لەئیسلامدا لەسەر بنەمای رەها کردنی ئازادی تاکەکاندایە لە هەموو کارێکدا کە پێچەوانە یان تێکگیرانی نەبێت لەگەڵ حەق وچاکە وبەرژەوەندی گشتیدا یان هی کەسانی تردا، کە ئەگەر ئەم سنوورە ببەزێنێت دەبێت ئەو ئازادیە سنووردار بکرێت.

کەواتە ئەو کۆتانەی کە ئیسلام لەسەر ئازادییە کەسییەکان دایناوە بەهەموو جۆرەکانیەوە لە سیاسی وئابووری وکۆمەڵایەتی، مەبەست پێیان تەنها جێبەجێکردنی بەرژەوەندی گشتییە، ئەمە بریتیە لە فەلسەفەی ئازادی لە ئیسلامدا، ئەوەی لەبواری حەق وچاکە وبەرژەوەندی گشتیدا بێت ئەوا ئازادی تێیدا زەمانەت کراوە، ئەوەشی سەربکێشێت بۆ زەرەر وزیانگەیاندن ئەوە سنووردار دەکرێت [122].

---

[120] ئەم فەرموودەیە ئیمامی مالك لە (الموطأ) والحاكم لە (المستدرك) گێڕاویانەتەوە.

[121] الحق ومدى سلطان الدولة في تقييده – د. فتحي الدريني– ص ٢٣.

[122] الحريات العامة في الفكر والنظام السياسي في الإسلام– د. عبدالحكيم حسن العيلي– لاپەڕە: ١٩٠–٢٠٠، الحريات العامة في الدولة الإسلامية: الشيخ راشد الغنوشي، لاپەڕە: ٤٣–٦٨.

## تەوەرەی حەوتەم:
## زەمانەتەکانی پاراستنی ئازادییە گشتییەکان لەئیسلامدا

تەنها نووسینەوەی دەقێك دەربارەی مافەکان وئازادییە گشتییەکان لە دەستووردا کافی نییە بۆ ئەوەی بووترێت لە راستیدا بوونیان هەیە وبۆ تاکەکان دەستەبەر کراوە، بەڵکو بۆ ئەوەی ئەم دەقانە تەنها حیبری سەر کاغەز نەبن دەبێت دەوڵەت کۆمەڵێك زەمانەتی راستەقینە دەستەبەر بکات بۆ پراکتیزە کردنی ئەم ماف وئازادییانە ورەنگدانەوەی لەژیانی تاکەکاندا.

زەمانەتەکانی ماف وئازادییەکان زۆرن، هەندێکیان زەمانەتی واقیعین کە خۆی لە گۆڕینی واقیعی بەردەست بۆ باشتر دەبینێتەوە کە بەهۆیەوە تاکەکان بتوانن مومارەسەی ئازادییەکانیان بکەن، هەروەها باشترکردنی بەرهەم هێنان ودەستەبەرکردنی کەمترین رادەی گونجاوی خۆشگوزەرانی، وکاتی بەتاڵی، ورادەیەکی باش لە رۆشنبیریی.

بەشێکی تری زەمانەتەکان بریتین لە زەمانەتی یاسایی کە خۆی لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، وچاودێری هەردوو دەسەڵاتی یاسادانان وجێبەجێکردن بۆ یەکتری، لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە سەربەخۆیی سیستمی دادوەریی لە دەوڵەتدا، دیارە سەربەخۆیی سیستمی دادوەریی گرنگترین زەمانەتە بۆ جێبەجێکردنی یاساکان وپاراستنی ئازادییەکان لە زیادەڕۆیی دەسەڵات، کە قازی کەسێکە لەژێر کاریگەریی هیچ کەسێکی تردا نییە وبەدوای رەزامەندی کەسەوە نییە، تەنها پەروەردگاری نەبێت وپاشان جێبەجێ کردنی یاساکان.

بۆ ئەوەی دادوەر سەربەخۆ بێت دەبێت چەند مەرجێکی بۆ دابین بکرێت، لەوانە: دەستێوەرنەدانی هەردوو دەسەڵاتی یاسادانان وجێبەجێکردن لە کاروباری دادوەریدا، ودابینکردنی ژیانێکی سەربەرزانەی گونجاو بۆ قازی وپاشان دەستەبەر کردن وپێشخستنی توانای پیشەیی دادوەرەکان [١٢٣].

---

[١٢٣] الحقوق والحريات العامة في الدساتير العربية والفقه والقضاء والشريعة الإسلامية– د.عبدالعزيز محمد سلمان– ص ١٦٢.

# بەشی سێیەم
# ئازادیی بیروباوەڕ لەئیسلامدا

واتە مافی مرۆڤ بۆ هەڵبژاردنی عەقیدەی خۆی دوور لەهەموو زۆر لێکردنێك، شەریعەتی ئیسلامی زەمانەتی ئەم مافەی بۆ هەموو مرۆڤەکان کردووە وهەموو هۆکارەکانی زۆر لێکردنی قەدەغە کردووە.

کتێبەکانی تەفسیر زۆربەیان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئایەتی: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ (البقرة:٢٥٦) واتە: (بەهیچ جۆرێك زۆر لێکردن لە دیندا نییە بۆ هاتنەناو ئیسلام، چونکە بەڕاستی لەیەك جیابۆتەوە ڕێنموونی وشارەزایی لە گومڕایی وسەر لێشێواویی)، بریتیە لە بناغەیەکی هەرە گەورەی ئیسلام، ویەکێکە لە کۆڵەکە گەورەکانی چاوپۆشی، کە ڕێ بەکەس نادات زۆر لە خەڵکی بکات بۆ هاتنە ناوئیسلام.

تەنانەت بۆ دڵنیابوون لە سەربەستی مرۆڤەکان وزۆر لێنەکردن پێویستی کردووە لەسەر موسوڵمانان کە هۆکارەکانی هێز بەکاربهێنن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوانەی دەیانەوێت لە ئاینەکەیان بەزۆر وەریانگەڕێنن، هەروەها هەستان بەکاری بانگەواز بۆ ئیسلام دەبێت بە بەکارهێنانی شێوازی حیکمەت وئامۆژگاری جوان بێت بۆ ڕوونکردنەوەی ڕاستی وگومڕایی لەسەر بنەمای بیرکردنەوە وژیریی وتێڕوانین لە بەڵگەکانی دەسەڵاتی پەروەردگار.

خوای پەروەردگار باوەڕهێنانی لەسەر زۆر لێکردن دانەمەزراندوە، بەڵکو لەسەر بنەمای توانا وهەڵبژاردن داناوە، زۆر لێکردن وسەپاندن لەسەر ئاین مانا بۆ تاقیکردنەوە وهەڵسەنگاندن ناهێڵێتەوە، هاوشێوەی ئەمە بریتیە لە ووتەی پەروەردگار: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ﴾ (الكهف:٢٩) واتە: بڵێ حەق (ئەم قورئانە) لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتووە، جا

هەر کەسێ دەیەوێت با باوەڕ بهێنێ وهەر کەسێکیش دەیەوێت با کافربێت وباوەڕ نەهێنێ.

هەروەها ئایەتی: ﴿أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾ {یونس:٩٩} واتە: دەی ئایا تۆ (ئەی محمد ﷺ) زۆر لە خەڵکی دەکەیت هەتا ببنە باوەڕدار، ئەمە وچەندین دەق ورووداوی تر کە بەرپرسیارێتی ومافی هەڵبژاردن وئازادی بۆ مرۆڤ دەسەلمێنن وزۆر لێکردن لە بیروباوەڕدا رەتدەکەنەوە، پاشانیش هیچ پاساوێك بۆ پاداشت وسزا نامێنێت ئەگەر هەڵبژاردن وتاقیکردنەوە بوونی نەبێت.

ئایەتی ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ گەورەترین بەڵگەیە لەسەرئەوەی ئاینی ئیسلام بە زەبری شمشێر وخوێن ڕشتن وزۆرلێکردن وسەپاندن بڵاونەبووەتەوە، ئەویش بە پێچەوانەی ئەوەی لێکۆڵەرەوانی ناحەز وتەنانەت هەندێك موسوڵمانیش هەڵیانبەستووە کە ئیسلام ئاینی شمشێرە [١٢٤].

(سید قطب) رایەکی روونکەرەوە ویەکلاکەرەوەی هەیە لە تەفسیری ئایەتی ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾دا کە دەڵێت: هیچ لۆجیکی نیە کە بانگەوازی ئیسلام خۆی کۆششێکی گەورەی کرد بۆ جێگیر کردنی ئازادی بیروباوەڕ، وشوێنکەوتوانی دووچاری نەهامەتی گەورە بوون کە خۆیان کەمینەیەکی چەوساوە بوون لە مەککەدا لەلایەن سەرانی شیرك وگومڕایی، کە تانەیان لە موسوڵمانان دەگرت کە وازیان لە ئاینی باوباپیرانیان هێناوە، وهیچ کۆششێك نەمابوو نەیکەن لەپێناو چەوسانەوەی موسوڵمانان وزەوتکردنی مافیان لە هەڵبژاردنی ئاینیاندا، هیچ دروست نیە لە لۆجیکی عەقڵ ورەووشتدا کە ئەمانە خۆیان لە دوارۆژدا کاتێك دەسەڵات پەیدا دەکەن هەستن وببن بە دیکتاتۆرێکی خوێنرێژ ومایەی چەوساندنەوەی خاوەن بیروباوەڕانی تر وزۆر لێکردنیان بۆ چوونە سەرشتێك کە پێچەوانەی ئەوەیە کە خۆیان باوەڕیان پێیەتی، کەی ئەمە مەعقول ودروستە،

---

[١٢٤] الحريات العامة في الدولة الإسلامية: الشيخ راشد الغنوشي، لاپەڕە ٤٤-٤٥.

بەڵکونموونەکانی مێژوو دوای بەڵگە عەقڵی وگێڕدراوەکان هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی کە گرنگترین مەبەستەکانی جیهادی ئیسلامی بریتی بووە لە شکاندنی هەیبەتی دیکتاتۆرەکان وبەتاڵ کردنەوەی جادوو وداپڵۆسینیان، ئیتر دوای ئەوە واز لە خەڵکی دەهێنرێت بۆ باوەڕهێنان بەوەی کە دەیانەوێت... مایەی شانازیە کە زەوی ئیسلام زەوی ئازادی ئاینی بووە کە نەوەکانی هەموو کۆمەڵە وئاینە چەوساوەکان هانایان بۆ ژێر سێبەری بردووە، تەنانەت ئەوانەش کە لەلایەن هاوئاینەکانی خۆیانەوە دەچەوسێنرانەوە تەنها لەژێر سایەی ئیسلامدا جێگیربوون وبوژانەوە، وەك زۆرێك لە دەستەی مەسیحی وجولەکە کە هانایان بۆ زەوی ئیسلام برد، زۆرێك لەم دەستانە هیچ شوێنەوارێکیان لەشوێنی تردا نەماوە تەنها لە زەوی موسوڵماناندا نەبێت چونکە کڵێسا گەورەکان لەڕیشەیان دەرهێناون، ئیتر مایەی سەرسوڕمان نییە کە بیرمەندانی موسوڵمان ئازادی بیروباوەڕیان بە لەپێشترین ئازادی داناوە چونکە بریتیە لە بناغە وئەساس، وبریتیە لە یەکەم مافی مرۆڤ [١٢٥].

ڕۆژهەڵاتناسی بریتانی (ئارنۆڵد توینبی) دەڵێت: ئەگەر سەیری ئەو چاوپۆشیە ئاینییە بکەین کە مەسیحیەکانی ژێر دەسەڵاتی موسوڵمانان تێیدا دەژیان لەسەردەمی حوکمی ئیسلامدا بەتەواوەتی بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو بۆچوونەی دەڵێت شمشێر بووە مایەی چوونە ناوەوەی خەڵکی بۆ ئیسلام زۆر دوورە لەراستییەوە [١٢٦].

---

[١٢٥] بڕوانە: في ظلال القرآن – سید قطب – بەرگی یەکەم.

[١٢٦] بڕوانە چەندین نموونەی تر لە کتێبی: مبادیء نظام الجکم في الإسلام – د.عبدالحمید متولي– لاپەڕە: ٣٨٨–٣٨٩.

## تەوەرەی یەکەم:
## شوێنەوارە یاساییەکانی ئازادی بیروباوەڕ لە کۆمەڵگای موسوڵماندا

### یەکەم: یەکسانی بنەمای هەڵس وکەوتە لە کۆمەڵگای موسوڵماندا:

ئەو دەقانەی کە فەرمان بەجەنگ دەکەن لە قورئاندا دەقی گشتین کە مەبەستی تایبەتیان هەیە کە جەنگ کردنە لەگەڵ دیکتاتۆرەکان وئەوانەی دەست درێژی دەکەنە سەر ئیسلام وشوێنکەوتووانی بۆ ئەوەی بوار بۆ زۆرلێکردن لە بیروباوەڕدا نەهێڵێت، ئەوەشی لە ژیاننامەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) پێمان گەیشتووە پشتگیریی تەواوی ئەم بۆچوونە دەکات، پێغەمبەر (ﷺ) ئاشتەوایی راگەیاند لەگەڵ شوێنکەوتووانی ئاینەکاتی تری وەك گاور وجولەکە وتەنانەت موشریکەکانی شاری مەدینەش، کە هەموویان لەکاتی دروستبوونی دەوڵەتی مەدینەدا یەك ئوممەتی سیاسییان پێکدەهێنا، هەمووشیان مافی هاولاتی بوونیان هەبوو کە دەیخوازی بە چەند ئەرکێك هەستن وەك بەرگری کردن لە مەدینە ودەست تێکەڵ نەکردن لەگەڵ دوژمنان لەبەرامبەر فەراهەم بوونی ئازادی بۆیان وپاراستنیان.

هەروەها چەندین پەیماننامە وهاوپەیمانی بەسترا لەنێوان دەوڵەتی مەدینە وچەندین تیرەی موشریکی عەرەبدا، کە سیفەتی موسوڵمان نییە غەدر بکات، هەربۆیە زانایانی فیقە کۆکن لەسەر ئەوەی مافی زیممەت (واتە مافی هاولاتی بوون) دەدرێت بە غەیری موسوڵمان وەك: گاور وجولەکە وصابیئە وئاگر پەرست، تەنانەت هەندێك زانا وا فراوانیان کردووە کە هەموداواکارێك بۆ ئەم مافە دەگرێتەوە تەنانەت ئەگەر بتپەرستیش بێت وەك زانا مالیکیەکان دەڵێن [١٢٧].

---

[١٢٧] بڕوانە: هەڵوێستی مالیکیەکان لەکتێبی: الكافي في فقه أهل المدينة المالكي– أبوعمر يوسف ابن عبدالبر– ج١ ص ٤٧٩.

نابێت هیچ ناموسوڵمانێك زۆری لێبكرێت بۆ موسوڵمان بوون وەك لە دەقە قورئانیەكانی پێشوو بۆمان روونبووەوە، لە ژیانی پێغەمبەریشدا (ﷺ) گەورەترین سەلماندن بۆ ئەم بۆچوونە دەبینین، چونكە لە هەموو ژیانیدا تەنانەت یەك حاڵەتی زۆرلێكردن نابینین بۆ موسوڵمان بوون، لە فەتحی مەككەش نموونەیەكی پرشنگدار لەم چاوپۆشیەی پێغەمبەر (ﷺ) دەبینین، كە هەموو خەڵكە موشریكەكەی ئەمین كرد (من دخل الكعبة فهوآمن، ومن دخل داره وأغلقها عليه فهوآمن، ومن دخل دار أبوسفيان فهوآمن)، زۆری لە كەس نەكرد كە موسوڵمان ببێت لەكاتێكدا ئەو دەسەڵاتی رەهای بەسەریاندا هەبوو، تەنانەت دوای فەتحیش ٨٠ كەس زیاتر مانەوە كە موسوڵمان نەبوون ووازیان لێهێنرا [١٢٨].

ئەویش بەومەرجەی پابەندبن بە ئەركەكانی هاوڵاتی بوون وەك موسوڵمانەكان، كەواتە یەكسانی بریتیە لە بناغەی هەڵس وكەوت كردن لە كۆمەڵگای ئیسلامیدا، ودەوڵەتیش لەسەر بنەمای ئەرك ومافەكان دادەمەزرێت واتە یەكسانی لە مافەكان وئەركەكاندا [١٢٩].

### دووەم: ئازادی جێبەجێ كردنی رێورەسمە ئاینیەكان:

ئیسلام مافی داوە بە خاوەنی هەر بیروباوەڕێك كە پەرستگای هەبێت وڕێورەسمە ئایینیەكانی تێدا جێبەجێ بكات، ئەویش لەچوارچێوەی موراعات كردنی رای گشتی، وزەوقی گشتی زۆرینەدا.

### سێیەم: ئازادی رادەربڕین بۆ بەرگری كردن لە بیروباوەڕ یان بانگەواز كردن بۆی یان رەخنە گرتن لە بیروباوەڕەكانی تر:

پێغەمبەران نموونەیەكی بەرزیان پیشاندا بۆ چۆنێتی گفتوگۆ كردن لەگەڵ بەرامبەرەكانیان بە مەبەستی راكێشانیان بەرەو ئیسلام و وەڵامدانەوەی

[١٢٨] بڕوانە: الحرية الدينية في الإسلام – الشيخ عبدالمتعال الصعيدي، لاپەرە ٣٨.

[١٢٩] بڕوانە: حقوق المواطنة: موقع غير المسلم في الدولة الإسلامية – الشيخ راشد الغنوشي.

بەڵگەکانیان، ئەویش لەبەر دامەزراندنی بیروباوەڕ لەسەر بناغەیەکی پتەو لە بەڵگە، بەڕاستی نموونەی جوان دەبینین لە گفتوگۆی إبراهیم (علیه السلام) لەگەڵ گەلەکەی وپێغەمبەرمان (ﷺ) لەگەڵ بێباوەڕانی مەککە کە بە ئوسلوبێکی نەرم وجوان دوور لە قین ودژایەتی کە دەبێتە هۆی دروست بوونی جەدەلی فیکری وەك لە گفتوگۆکانی ئەم رۆژگارەدا دەبینرێت، ئەم ئازادی وچاوپۆشینە ئایینیە بێوێنەیە نموونەی زۆری لەسەر دەبینین لە مێژووی ئیسلامیدا، تەنانەت گفتوگۆ لەگەڵ بێباوەڕان ولادەران لەناو کۆشکی کاربەدەستاندا بەوپەڕی ئازادی ئەنجامدەدرا، کە هیچ دەسەڵاتێك لەسەریان نەبوو تەنیا دەسەڵاتی بەڵگە وسەلماندن نەبێت، ئەمەش دەرخەری ئەو پلە بەرز وڕێزە بوو کە ئیسلام بۆ ژیریی وزانست وئازادی دایدەنا.

تەنانەت زانای پایەبەرز (د.إسماعیل الفاروقي) پرۆفیسۆری زانستی بەراوردکاریی ئاینەکان لە زانکۆی (تمبل) لە ئەمریکا لە توێژینەوە گرنگەکەی دەربارەی ناموسوڵمانان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بۆ ئەوە چووە کە هاوڵاتی ناموسوڵمان  بۆی هەیە ناسنامە وبیروباوەڕی خۆی بڵاوبکاتەوە بەو مەرجەی هەستی گشتی موسوڵمانان بریندار نەکات.

چونکە گومانی تێدا نیە کە مافی ئەوەی هەیە بیروڕای خۆی دەربڕێت لەو چوارچێوە یاساییەی کە هەمووان ملکەچن بۆی، ولەو سنوورەی کە هەستی ئەو زۆرینەیە بریندار نەکات کە ئەو مافەی پێداوە، ئەگەر پێویست بێت لەسەر موسوڵمان کە بانگەوازی خۆی روونبکاتەوە بۆ هاوڵاتیانی ناموسوڵمان، ئەمیش بەهەمان شێوە ئەو مافەی هەیە، ئەگەر ترسێکیش هەبێت لەسەر بیروباوەڕی موسوڵمانان ئەوا هیچ چارەیەکیان نیە تەنها قووڵبوونەوە نەبێت لە باوەڕی خۆیاندا بە پرسیار کردن لە زاناکانیان، چونکە لەگەڵ بەرەوپێش چوونی نوێی هۆکارەکانی راگەیاندن وپەیوەندی ناتوانین خۆمان دوورەپەرێز بگرین، وئەم دژە

گفتوگۆیە دەگاتە موسوڵمانان بەهەر هۆیەك بێت، وتاكە ئوسلوبی پارێزگاریی بریتیە لە ئەنجامدانی گفتوگۆیەكی بەرامبەری راستتر وژیرانەتر [130].

زانا (أبوالأعلى المودودي) كە پێشەنگی فوقەهای یاسای دەستووری ئیسلامیە زۆر ئاشكرا ویەكلاكەرەوە بووە لە دیاری كردنی ئازادی ناموسوڵمان، كە دەڵێت: دەبێت بۆ ناموسوڵمان لە مافی ئازادی ووتاردان ونووسین ورادەربڕین وبیركردنەوە وكۆبوونەوە دەستەبەر بكرێت هەروەك چۆن بۆ موسوڵمان هەیە وەك یەك، هەمان ئەوكۆت وئیلتیزامانەیان دەبێت كە لەسەر موسوڵمانەكان هەیە، بۆیان هەیە رەخنە لە دەوڵەت وكاربەدەستەكانی بگرن تەنانەت لە سەرۆكی دەوڵەتیش بەلام لە چوارچێوەی یاسادا، مافی ئەوەشیان دەبێت رەخنە لە ئاینی ئیسلام بگرن وەك چۆن موسوڵمان بۆی هەیە رەخنە لە ئاین وبۆچوونیان بگرێت، وبۆشیان هەیە وەسفی تەواوی ئاینی خۆیان بكەن وهەر كەسێكیش لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە ئەوە لەسەر خۆیەتی، وبەهیچ شێوەیەك ناموسوڵمان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا زۆری لێناكرێت بۆ بیروباوەڕێك یان كارێك كە پێچەوانەی ویژدانی بێت [131].

ئەمانە هەمووی مانای ئەوەیە كە لەناو كۆمەڵگەی ئیسلامیدا دان دەنرێت بەجیاوازی ناسنامەكان، بۆ ئەوەی هەموویان بەجیاوازیەكانیانەوە بەشداربن لە دروستكردنی شارستانیەتی ئیسلامی دوور لە ئایدیۆلۆجیەتی خۆسەپاندن وتواندنەوە [132].

---

[130] بڕوانە: حقوق غير المسلمين في الدولة الإسلامية – د.إسماعيل الفاروقي– گۆڤاری (المسلم المعاصر) – ژمارە ٢٦.

[131] نظرية الإسلام وهديه في السياسة والقانون والدستور– أبو الأعلى المودودي– ص ٣٦١.

[132] بڕوانە: الحريات العامة في الدولة الإسلامية: الشيخ راشد الغنوشي، لاپەڕە ٤٧–٤٨.

## تەوەرەی دووەم:

## بابەتی هەڵگەڕانەوە لە ئاین

هەڵگەڕانــەوە بریتیــە لــە کــافربوون دوای موســوڵمان بــوون بــەبوونی وویســت وهەڵبژاردن، ئەویش بە رەتکردنەوەی ئەوەی جێگیربووە لە بیروباوەڕ وشــەریعەت ودروشمەکانی ئیسلام.

ئایەتەکانی قورئان ئەم تاوانەیان زۆر بەگەورە ناساندووە وهەڕەشەی لەوکەسە کردووە کە تووشی سەخت ترین سزادەبێت لە دوارۆژدا بەبێئــەوەی ئامــاژە بــەهیچ سزایەك بدرێت لە دونیادا، بەڵام لە سوننەتدا هاتووە ئەوەی هەڵگەڕێتــەوە دەبێت بکوژرێت: ﴿من بَدَّلَ دینَه فاقتلوه﴾ [١٣٣]، هاوەڵەکانیش کۆکبوون لەسەر شــەڕکردن دژی هەڵگــەڕاوەکان دوای وەفــاتی پێغەمبــەر (ﷺ)، زانایــانی ئیســلام هــاوڕان کــە هەڵگەڕانەوە تاوانە بەڵام زۆر جیاوازن لە دیاریکردنی سزاکەیدا.

جیاوازییەکە لە دووخاڵدایە:

- ئایا هەڵگەڕانەوە تــاوانێکی سیاسیە کــە خــۆی لــە دەرچــوون لــە سیســتمی دەوڵەتــدا دەبینێتــەوە؟ کــە لەمــەدا دەدرێتــە دەســت پێشــەوای موســوڵمانان کــە تەمێکردنێکی (تعزیر) گونجاوی بۆبکات.
- یان ئەمــە تــاوانێکی عەقیدەییــە کــە دەچێتە چوارچێوەی ســنوورەکان کــە مافی خودای تێدایە، وپێویستە حەددی تێدا جێبەجێ بکرێت [١٣٤]؟

٢ ڕا هەیە لەم مەسەلەیەدا:

**رای یەکەم**: دەڵێن هەڵگەڕانەوە حەددێکە ودەبێت خاوەنەکــەی بکوژرێــت، بەڵام جیاوازن لــەوەی مۆڵــەتی تۆبــە کــردن دەدرێــت بــەو کەســە یــان نــا، هەنــدێك دەڵــێن مۆڵــەتی پێنادرێــت، بــەڵام زۆربــەیان دەڵــێن دەبێــت مۆڵــەت بــدرێت بــۆ

---

[١٣٣] ئیمامی (بوخاری) ریوایەتی کردووە.

[١٣٤] بڕوانە: الحريات العامة في الإسلام- محمد سليم غزوري - لاپەڕە ٩٥.

گەڕانەوە، لە ڕۆژێکەوە را هەیە تا مردن (وەك ئیمامی النخعي دەڵێت)، ئافرەتیش جیاوازی هەیە، هەندێك دەڵێن وەك پیاوە، بەڵام زۆربەیان دەڵێن ئافرەت لەسەر هەڵگەڕانەوە ناکوژرێت وتەنها تەمێ دەکرێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری کردووە لە کوشتنی ئافرەت وپەککەوتە ومنداڵ.

**رای دووەم**: بەشێکی زۆر لە زانایان، بەتایبەتی فەرموودە ناسەکان رایان وایە کە تەمێکردن لەهەر تاوانێکدا کە سزاکەی بەئاشکرا دیاری نەکرابێت بەجێدەهێڵرێت بۆ قازی یان پێشەوای موسوڵمانان، بەڵگەش بۆ ئەمە بەوە دێننەوە کە پێغەمبەر لەکاتی فەتح کردنی مەککەدا خۆش بوو لە زۆر کەس کە کاتێك پێشتر هەڵگەڕابوونەوە فەرمانی کوشتنی بۆ دەرکردبوون، لەوانە (عبدالله بن أبي السرح) کە عوسمانی کوڕی عەففان تکای بۆ کرد، بەڵام لە چەند کەسێکی تر خۆش نەبوو، کە ئەمە دەیسەلمێنێت هەڵگەڕانەوە سزاکەی تەمێکردنە وبڕەکەی بۆ حاکمی موسوڵمان دادەنرێت دیاری بکات.

چونکە ئەگەر حەددێك بوایە تکاکردن وشەفاعەت کردن بۆی دەوری نەدەبوو وگوێی لێنەدەگیرا، ئەوانەشی کوژران بەهۆی ئەنجامدانی تاوانی ترەوە بوو کە دەیخوازی بکوژرێن، هەروەها شەڕکردنی (ئەبوبەکری صیددیق) لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان بەهۆی یاخی بوونی چەکدارییان بوودژی دەوڵەت وهەرەشە کردن بوو لە قەوارەی تازەی موسوڵمانان، کەواتە کردارەکەی زیاتر سیاسی بوو تا ئاینی، ئەگەر ئەم بابەتەش پەیوەندی بە حەددێکی خوداییەوە بووبێت ئەوا شاراوە نەدەبوو لە زوربەی هاوەڵەکان کە هەوڵێکی زۆری ویست لەلایەن پێشەوا ئەبوبەکرەوە تا قەناعەتیان پێبکات بەم سیاسەتە.

پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك فەرمانی کردووە بە کوشتنی هەڵگەڕاوە لە مەوقعی کاربەدەستی سیاسی موسوڵمانانەوە بووە نەك پێغەمبەرایەتی، هەربۆیە دیاریکردنی سزای هەڵگەڕانەوە بەجێدەهێڵرێت بۆ پێشەوای موسوڵمانان کە بەپێی

مەترسی بابەتەکە بۆ سەر قەوارەی سیاسی ئوممەت بڕیاری سزای بۆ بدات، کە ئەم قەوارەیە جیاوازە لە قەوارەی ڕۆژئاوایی بۆ نموونە، کە ئەوان ئاین لەلایەنی قانونیەوە بە بابەتێکی کەسی دەزانن وپەیوەندی نیە بە قەوارەی دەوڵەتەوە.

بەڵام ئیسلام بیروباوەڕ وبەرنامەی ژیان ویاسای دەوڵەتە، ئەمە وادەکات کردنە ئامانجی ئیسلام بریتی بێت لە کردنە ئامانجی قەوارەی دەوڵەت، هەربۆیە لەسەر دەوڵەت پێویستە کە پارێزگاری لە ئاین بکات وهەموو هەڕەشەیەك بە شێوەیەکی گونجاو چارەسەر بکات [١٣٥].

رای دووەم بەلای منەوە گونجاوترە وزانایان (السرخسي وابن القيم) هەمان بۆچوونیان هەیە، وزۆرێك لە زانایانی ئەم سەردەمەشی لەگەڵدایە وەك: محمد عبدة، وعبدالوهاب خلاف، ومحمد أبوزهرة، وعبدالعزيز شاويش وراشد الغنوشي، هەروەها یاساناسانی دەستووری وەك: د.فتحي عثمان، ود.عبدالحميد متولي، ود.عبدالحكيم حسن العيلي، ود.حسن الترابي، ود.محمد سليم غزوري وچەندانی تریشی لەگەڵدایە.

کورتەکەشی ئەوەیە: هەڵگەڕانەوە پەیوەندی بە ئازادی بیروباوەڕەوە نیە کە ئیسلام دانیپێداناوە، بەڵکو بابەتێکی سیاسییە ومەبەست پێی پاراستنی موسوڵمانانە، ئەوەشی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەنجامدرا لەبابەتی هەڵگەڕانەوەدا لە مەوقیعی پێشەوایەتی سیاسی موسوڵمانانەوە بووە، کەواتە سزای هەڵگەڕاوە تەمێکردنە (تعزير) نەك حەدد، وبریتیە لە تاوانێکی سیاسی وبەرامبەر بە تاوانی هەڵگەڕانەوەی هێزدارە لە دەوڵەت، وهەوڵدانە بۆ لەقکردنی لە سیستەمەکانی تردا وبەپێی پێویستی خۆی چارەسەر دەکرێت.

چونکە بابەتەکە جیاوازە لە حاڵەتی هەڵگەڕانەوەی مەسیحیەك لەئیسلام کە خۆی کاتێك موسوڵمان بووە تەنها بە مەبەستی هێنانی ژنێکی موسوڵمان ئەمەی

---

[١٣٥] بڕوانە: الحريات العامة في الدولة الإسلامية: الشيخ راشد الغنوشي، لاپەڕە ٤٨–٥٠.

کردووە، وکاتێك لەیەك جیادەبنەوە دەگەڕێتەوە سەر ئاینە رەسەنەکەی خۆی، ولەنێوان حاڵەتێکی بەرنامە بۆ دارێژراو بۆ پەلاماردنی سیستمی دەسەلات وگۆڕینی.

دەبێت جیاوازی بکرێت لەنێوان ئەو تاکانەی کە بەهۆی هێرشی رۆشنبیرییەوە بیروباوەڕیان لەق دەبێت کە دەتوانرێت بە هۆشیارکردنەوە وپەروەردە وپاراستن چارەسەر بکرێت ولەنێوان ئەو مژدەدەرانەی کە بە بەرنامەیەکی دارێژراو ورێکخراو هەوڵی لەناوبردنی ئیسلام ودەوڵەتەکەی دەدەن [١٣٦].

لەلایەکی ترەوە ترساندنی خەڵکی بەوەی کە ئەگەر لەدین هەلگەڕێنەوە دەکوژرێن، دەبێتە هۆی نەوێرانی دەرخستنی هەستی راستەقینەی تاکەکان بەرامبەر بە ئاین، ئەمە وادەکات کە کەسەکان بەرواڵەت خۆیان بە موسوڵمان نیشان بدەن ولەژێرەوە باوەڕیان پێی نەبێت ودژایەتی بکەن، واتە دروستبوونی خەڵکانی دووڕوو (مونافیق)، کە مەترسیان زۆرترە لەسەر جێگیریی کۆمەڵگای موسوڵمان لەچاو ئەوانەی دەزانرێت کە بێباوەڕن وبیروباوەڕی راستەقینەی خۆیان ناشارنەوە.

۞۞۞۞۞۞

---

[١٣٦] بڕوانە: أزمة الفكر السياسي الإسلامي في العصر الحديث: مظاهرها، أسبابها، علاجها- د.عبدالحميد متولي.

# دوا ووته

پێغەمبەر (ﷺ) خۆی نەخوێندەوار بوو ولەناو گەلێکی نەخوێنداردا نێردرا کە هیچ جۆرە بیرکردنەوەیەکی زانستییانەیان نەبوو: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ ...﴾ (الجمعة:٢)، واتە: هەر پەروەردگارە کە لەناو نەخوێندەوارەکاندا پێغەمبەرێکی نارد کە وەك خۆیانە (واتە ئەویش نەخوێندەوارە).

کەواتە چۆن دەچێت بە عەقڵدا و ژیریی ئەوە قبوڵ دەکات کە پێغەمبەر (ﷺ) لەو کاتەدا ئەو هەموو نهێنییە زانستییانە لە دەقەکانی قورئان وسوننەتدا دەربخات و ئاشکرا بکات بەبێ پشتگیری وەحی و نیگای خودایی؟!

ئەی باشە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) توانای هەبوو چەندین راستیی زانستی ئاشکرا بکات لە بەرزترین پلەی وردەکاریدا وبە شێوازێکی ئیعجازیی سەرسوڕهێنەر، ئەگەر ئەمە وەحی و نیگای پەروەردگاری خولقێنەر نەبێت؟!

ئەگەر ئەم زانیارییانە لەلایەن خوداوە نەبووایە ئەوا پێویستی بە کاتێکی زۆر و چەندین پسپۆڕ وشارەزای بوارە جیاوازەکان دەبوو بۆ ئەوەی لەو بابەتانە تێبگەن، و هەروەها پێویستی بە تەکنەلۆجیایەکی زۆر پێشکەوتووش دەبوو، کە لەو کاتەدا ئەو تەکنەلۆجیایە لەبەر دەستی پێغەمبەردا (ﷺ) نەبووە، ولە هەموو ژیانیدا چالاکیەکی زانستی تاقیکاریی ئەنجام نەداوە (وەك مێژوو بۆی تۆمار کردووین)، کە ئەمانە ئاستی ئیعجازە خوداییەکە لە قورئان وسوننەتدا بەرزتر دەکەنەوە، ودڵنیا دەبین (بەتایبەتی زاناکان) کە ئەم پەیامە پیرۆز وەحی و نیگای خوداییە :﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾.

لەم کتێبەدا هەوڵمداوە ئەو راستییە روون بکەمەوە کە ئیسلام هەمووی نیگایەکە لەلایەن خوداوە و دەستی مرۆڤ کاری تێدا نییە، و محمد (ﷺ) پێغەمبەری خودایە، وهەندێك لە موعجیزەکانی قورئان وسوننەت لەژێر رۆشنایی راستییە زانستییەکاندا خراوەتەروو، بەو هیوایەی ئەوانەی باوەڕدارن ئیمانیان پێی زیاد ببێت و ببێتە مایەی رێنموییکەرێك بۆ شەیدایانی راستیی.

# تێڕامانێك لە مرۆڤ

## لەژێر ڕۆشنایی ئایەتی ( وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ )




سیستمی هەناسەدان لە مرۆڤدا، نموونەیەکی ناوازەییە لە دروستبوون وفرمانەکانیدا







هەندێك لە پێكهاتەكانی ڕێڕەوەكانی سەرەوەی سیستمی هەناسەدان لە :

دەم، لووت، قورك، وقورقوڕاگە


داری بۆریچکە هەواییەکان
(BRONCHIAL TREE)


تۆڕی چڕی بۆرییەکان و موولوولەکانی خوێن
لە سییەکاندا کە دیزاینێکی مەزن دەردەخات

